چاپی دووەم

ئەدهەم شەرقاوی

# تەنها بۆ پیاوان



## پرنسیپەکانی مامەڵەکردن لەگەڵ خانمان

وەرگێڕانی

یاسین مەحمود تاوگۆزی



ناوی کتێب: تەنها بۆ پیاوان
پرنسیپەکانی مامەڵەکردن لەگەڵ خانمان
ناوی نووسەر: ئەدهەم شەرقاوی
وەرگێڕانی: یاسین مەحمود تاوگۆزی
پێداچونەوەی: ئازاد عەبباس گڵێجاڵی
دیزاینی بەرگ: ناوەندی ڕێنوێن
دیزاینی تێکست: دانا حەسەن
نۆبەتی چاپ: دووەم ٢٠٢١
چاپ: ناوەندی ڕێنوێن
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١١٧٣)ـی ساڵی (٢٠١٩)ـی پێ دراوە.







**ناوەندی ڕێنوێن**


07701932749 -07501269689


hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com


سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)

پێغەمبەری خوا درودی خوای لەسەر بێت فەرموویەتی

((استوصوا بالنساء خيرا))

واتە: ئامۆژگاری بێ لێتان، زۆر باش بن بۆ ژنان

## پێشکەشە:

بەو پیاوانەی کە

ئەگەر بەڵێنیان دا، بەجێی دەگەیەنن

چونکە دەزانن ((بەڵێن بەرپرسیارێتییە)).

ئەگەر پەیمانیان دا، هەڵیناوەشێننەوە

چونکە دەزانن ((پەیمانی تۆکمە و پتەویان لێ وەرگیراوە)).

ئەگەر دڵێکیان وەرگرت نایڕاکێنن

چونکە دەزانن خوا فەرمانی پێ کردووین سپاردەکان وەك خۆیان

ڕادەستی خاوەنەکانیان بکەینەوە.

# پێڕست

## به ناوی خوای گەورە و میهرەبان

کاکی خوێنەر!

خوای گەورە ژیانی دروست کردووە و لە ڕێگەی پیاو و ژنەوە درێژە بە ژیانی مرۆڤایەتی دەدا، پیاو و ژن هەریەکە جیهانێکی سەربەخۆن، هەریەکە تایبەتمەندییەکی هەیە، هەق وایە ژنان ئەو کتێبانە بخوێننەوە کە باسی تایبەتمەندییەکانی پیاوان ئەکەن، پیاوانیش ئەو کتێبانە بخوێننەوە کە باسی تایبەتمەندییەکانی ژنان ئەکەن، ئەم کتێبەی بەردەستت تایبەتە بە تۆ! (للرجال فقط) تەنیا بۆ پیاوانە، تۆش بیخوێنەوە! لێی ورد بەرەوە، بزانە پیاو دەبێ بە چ پێوەرێک مامەڵە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بکا؟ با ژیانەکەتان بە ڕێکوپێکی درێژە پێ بدەن و نەبێ بە ژان، با تا کۆتایی ژیان بە یەکەوە بە خۆشی بژین، با ببنە ئاوێنە و دڵی یەکتر بخوێننەوە! با لە هەوراز و نشێوەکانی ژیاندا بە یەکەوە سەرکەون، لە بەرامبەر سەختی ژیاندا چۆک دانەدەن!

بەڕێز ئەدهەم شەرقاوی زۆر زیرەکانە و بە جوانی تایبەتمەندییەکانی ئافرەتی لەم کتێبەدا باس کردووە، هیچێکی وای نەهێشتووەتەوە کە پیاو زۆر پێویستی بێ، بۆیە پێویستە پیاو شارەزای ئەم کتێبە بێ، هیچ نەبێ جارێک بە وردی بیخوێنێتەوە بۆ ئەوەی ئەو شتانەی بۆ دەرکەوێ کە دەبێ لەودا هەبێ و نییە و ناشزانێ کە نییە!

بۆ ئەوەی بزانیّ کە سروشتی هاوژینەی چۆنە! بۆ ئەوەی پیاو و ژن ئەگەر بە جەستەش لێک دوور بوون، بە دڵ لە یەکەوە نزیک بن، نەک بە جەستە نزیک بن و یەک نەناسن، شێخی سەعدی دەفەرمویّ:

در یمنی چوو با منی پیش منی، پیش منی چون بی منی در یمنی

واتە: ئەگەر لە یەمەن بی و دڵت لای من بیّ، ئەوا لەگەڵ منی، بەڵام ئەگەر خۆت لای من بی و دڵت لای من نەبیّ، وەک ئەوە وایە لە یەمەن بی!

جا با ئێمەی پیاوانیش ئەگەر ڕۆژێک ڕێمان کەوتە یەمەن، هاوسەرەکانمان لە ماڵەوە هەست بە بۆنمان بکەن و وابزانن هەر لە ماڵین.

ماوەتەوە یەک شت کە بە خوێنەری بەڕێزی ڕابگەیەنم، ئەویش ئەوەیە: زۆر شوێنی ئەم کتێبەم دەقاودەق بیّ زیاد و کەم وەرگێڕاوە، لە هەندیّ شوێنی کەمیشدا بە تایبەت لە کۆتایی کتێبەکەدا، بابەتەکانم کورت کردووەتەوە و ڕۆحی کتێبەکەم نووسیوە، چونکە وام بە باش زانیوە لەو شوێنانە دەقاودەق نەبن و بە پێویستم نەزانیوە درێژدادڕی تیا بکەم. والسلام علیکم و رحمةالله و برکاتە

براتان یاسین مەحموود تاوگۆزی

شارەزوور- زەڕایەن



## تۆ لە گڵی... ئافرەتیش لە تۆیە

هەرگیز ئەو پرسیارەت لە خۆت کردووە بۆچی ئافرەتان زۆرتر لە ئێمەی پیاوان قسە دەکەن؟

بۆ ئەوان لە بەرامبەر ئاریشە و ڕووداوەکاندا هەڵچوونیان زیاترە؟

بۆ ئەوان وابەستەی بابەتە سیاسی و ئابوورییەکان نین؟

بۆ ئەوان لە ئێمە ڕۆمانسیترن؟

بۆ ئەوان زیاتر مەیل و ئەوینی خۆیان بە شتە بچووک و لاوەکییەکان دەدەن؟

بۆ ئەوان زۆرتر لە ئێمەی پیاوان گرنگی بە دەوروبەری خۆیان دەدەن؟

بۆ هەڵوێستەکانیان زۆر جار سەرچاوە لە سۆزەوە دەگرێ، نەک لە ژیری و ئاوەزەوە؟

بۆ لە ئێمە زیاتر حەزیان بە چوونە دەرەوەیە لە ماڵ؟

بۆ ئەوان پتر لە ئێمە هەستیارترن؟

بۆ کاتێک دەمانەوێ پێکەوە دەرچونێک بکەین، ئەوان درەنگتر ساز و ئامادە دەبن؟

بۆ ئەوان زۆر جار پەیوەست نابن بە کاتی وەعد و بەڵێنەوە؟

ڕەنگە پرسیارت لە خۆت نەکردبێت هۆکاری ئەمانە چین، یان دەکرێ هەر ئێستا بە ئاگا هاتبیتەوە کە ئەم جیاوازیانەیان هەن و پێشتر هەر بیریشت لێ نەکردوونەتەوە، ئەگەرچی ڕۆژانە لەگەڵیاندا دەژیت و دەست و پەنجەیان لەگەڵدا نەرم دەکەیت.

واز بێنە با چەند پرسیارێکی ژیانی ڕۆژانەت لێ بکەم:

قەت ڕووینەداوە جارێک ئاریشەیەکت بۆ پێش هاتبێ و دانیشتبی و خەریکی شەنوکەوکردنی بیت و بە شوێن ڕێگا چارەیەکەوە بوبیت بۆی، ئا لەو کاتەدا خانمەکەت هاتبێ و بڵێ: ئەوە چییە بۆ وا دۆش داماوی؟ پێم بڵێ بزانم بیر لە چی دەکەیتەوە؟ تۆش لەو کاتەدا ئەگەر سەرپشک بکرابای لەنێوان قسەکردن و هەڵزنان بەسەر شاخی بێستووندا ئەوا ڕێگەی سەختی شاخەکەت لە لا دڵگیرتر دەبوو وەک لە قسەکردن؟

قەت ڕووی نەداوە جارێک پێکەوە تەماشای فیلمێکتان کردبێت و خانمەکەت بۆ مردنی قارەمانێکی ناو فیلمەکە فرمێسکی هەڵوەراندبێ، یاخود دڵخۆش و شادومان بووبێت بۆ بە یەکگەیشتن و دەستلەملانێی دوو قارەمانی ناو فیلمەکە، لە کاتێکدا تۆ نە بە مردنەکە دڵتەنگ و نە بە بەیەکگەشتنەکە دڵخۆش بوویت؟

قەت ڕووی نەداوە جارێک لە دانیشتنێکی شەوانەدا کاتێک باس هاتبێتە سەر باسی سیاسەت و ئابووری و وەرزش ڕووخساری ئافرەتانی ناو کۆڕەکەت خوێندبێتەوە، کە ئەم بابەتانە جێی سەرنج و بایەخی ئەوان نین، پاشان کە ئاڕاستەی قسە و باس گۆڕابێت بۆ باسی شایی فلان کچ و فلان مۆدێلی ڕەنگ و فلان هەرزانبازاڕ، ئیتر ئەوان هەموویان بە جارێ گەشاونەتەوە؟

قەت ڕووینەداوە جارێک بۆنەیەکی تایبەت بە تۆ بووبێت و

هاوژینەکەت هیچ دیارییەکی بۆ ئامادە نەکردبێت، تۆش بە ئاسایی وەرتگرتبێت، بەڵام کاتێک تۆ بۆنەیەکی پەیوەست بە ئەوت فەرامۆش کردبێت، ئەو ئەوپەڕی بێزاری و دڵتەنگی خۆی پیشان دابێت و گلەیی خەستوخۆڵی کردبێت؟

قەت ڕووی نەداوە جارێک بەبێ هاوژینەکەت ڕۆشتبیت بۆ ئیوارەخوانێک و پاش گەڕانەوەت کۆمەڵێک پرسیاری ڕووبەڕوو کردبیتەوە کە هەر بە خەیاڵیشتدا نەهاتبێ و جێی سەرنج و بایەخی تۆ نەبووبێ؟ تۆ لە کوێ بیرت دەکەویتەوە ڕەنگی سفرەی سەر مێزی نانخواردنەکە چۆن بوو، خوا بکا بیرت مابێ مێزەکە سفرەی لەسەر بووە، ئەوی تری گەردنت ئازاد بێت، حەتمەن تۆ هەر پارووی زلت داگرتووە و پێشبینیت نەکردووە لێت بپرسێ ئەرێ قاپ و کەوچکی سەر سفرەکە تاخم بوون یان نا؟ خۆ ئەگەر پرسیاری سوراحی و پەرداخی شەربەتەکەت لێ بکات ئەوەی بیرت مابێتەوە تەنها تامەکەیەتی و هیچی تر. تەنانەت تۆ سەرنجی جلوبەرگ و پێڵاو و کاتژمێری هاوڕێکانیشت نەداوە. سوێندت بۆ دەخۆم ئەگەر ئەو بوایە لە شوێنی تۆ، هەموو ئەوانە و شتی تریشی بۆ باس دەکردیت.

قەت ڕووی نەداوە جارێک باسی گرفتی هاوڕێیەکتی بۆ بکەیت و پاش ماوەیەک لێت بپرسێت ئەرێ گرفتی هاوڕێکەت چی لێ بەسەر هات؟

قەت ڕووی نەداوە جارێک گرفتێک لە نێوانتاندا دروست بووبێت و بە هەڵوێستە توندەکەی تووشی شۆکی کردبیت؟ تۆش پرسیارت لە خۆت کردبێ: ئەرێ باشە ئەم ئافرەتە ڕۆشنبیرە، دیندارە، ژیرە کە زۆر بە دیقەتەوە مامەڵە لەگەڵ هەموو شتێکدا دەکات، چۆن دەبێت بەم ئەندازەیە بکەوێتە ژێر کاریگەری هەڵچوونی دەروونییەوە و وەک هەرزەیەکی شازدە ساڵە دەرکەوێت؟

قەت ڕووی نەداوە جارێک پێی بڵێی وەرە با پێکەوە بچین بۆ چێشتخانەیەک، بۆ ئاهەنگێکی بووکگواستنەوە، بۆ سەردانی ماڵە خزمێک، پاشان پەشیمان بوویبێتەوە و ئەویش کاردانەوەی زۆر توندی نواندبێ تا ئەو ئاستەی تۆش پرسیارت لە خۆت کردبێت: ئەرێ باشە ئەمە کەی ئەوەندە گرنگ بوو؟ کورتە گەشتێک بوو سەری نەگرت و تەواو.

قەت ڕووی نەداوە جارێک ویستبێتتان پێکەوە دەرچوونێک بکەن ئەو بۆ خۆئامادەکردن کاتێکی یەکجار زۆری بردبێ کە تۆ بتوانی بەو کاتەی ئەو هەرچی جلوبەرگت هەیە لە ماڵەوە هەموویان لەبەر بکەیت و داشیانکەنی؟ تۆش لە ترسی دواکەوتن دەست بکەیت بە هاتوهاوار و نارەزاییدەربڕین، کە چی ئەو هێندەی تۆ کاتەکەی لە لا گرنگ نەبێت؟

بێگومان لە دڵی خۆتدا دەڵێی: بەڵێ ئەمانە هەموویان ڕوویان داوە، بەڵام پێم ناڵێی ئەمانەت چۆن زانی؟ کێ پێی وتی؟

ڕاستییەکەی ئەمانە لە منیش و لە هاوڕێکەت و لە دراوسێکەت و تەنانەت لە پیاوانی نەناسراوی دەوڵەتانی تریشدا ڕوویان داوە.

هاوڕێ: ئافرەت هەر ئافرەتە هەرچەندە ئاستی ڕۆشنبیری و ئابووری و کۆمەڵایەتیشیان جیاواز بێت، بەڵام خوویەکی هاوبەش هەیە لە نێوان هەموو ئەوانەی وان لەژێر چەتری ئافرەتیدا، ئێمەی پیاوانیش هەر واین، خاڵی هاوبەش هەیە لە نێوانماندا و خاوەنی کۆمەڵێک سروشتی تایبەت بە خۆمانین هەرچەندە لە پیاوێکەوە بۆ پیاوێکی تر جیاوازی هەیە.

ڕاستییەک هەیە دەبێ بیزانین ئەویش ئەوەیە: ئافرەتان لە ئێمەی پیاوان جیاوازن، هەم لە سروشتیاندا و هەم لە شێوازی دەربڕینی هەست و نەستیاندا هەم لەو شتانەی جێگەی بایەخ و گرنگیپێدانی

ئەوانـن، لـەو شـتانەی دڵخۆشـیان دەکات، ئەوانـەی قەڵس و بێزاریـان دەکات.

ئـەو گرفـت و کێشمەکێشـمانەی کـە لەنێـوان پیـاوان و ئافرەتانـدا ڕوودەدەن هۆکارەکـەی ئەوەیـە، هیـچ لایەکیان لـە سروشـت و خـووی لاکـەی تـر تێنـاگات.

ئێمـە ئەمانـەوێ ڕووداوەکان چ کاریگەرییەکیـان لەسـەر ئێمـە دروسـت کـرد، هەمـان کاریگەریـش لەسـەر ئـەوان دروسـت بـکات، هەمـان هەسـت و نەسـتی ئێمەیـان هەبـێ، هەنـدێ شـت بـە لاوەکـی وەربگـرن وەک ئێمـە، هەندێکـی تـر گرنگـی و بایەخـی پـێ بـدەن وەک ئێمـە، لـە بەرامبـەردا ئەوانیش هەمـان شـتیان لـە ئێمـە دەوێ، دەیانـەوێ ئاوێنـەی ئـەوان بیـن و چیـان پـێ خـۆش بـوو، چیـان لـە لا بایەخـدار بـوو، چیـان لـە لا ناپەسـەند بـوو، کوتومـت وەکـو ئـەوان بیـن.

کەواتـە پیـاو چاوەڕوانـی دەکات ئافرەت وێنەیـەک بێـت لـە خـۆی، ئافرەتیـش هەروەهـا، ئەمـەش شـتێکی مەحـاڵ و ئەسـتەمە و هەرگیـز ڕوونـادات.

ڕەنگـە بپرسـیت ئـەی چارەسـەر؟ خـۆ تـۆ ئێمـەت خسـتە نـاو تونێلێکـی داخـراوەوە ڕێگـەی دەرچوونمـان نییـە!

منیـش پێـت دەڵێـم: بـە پێچەوانـەوە چارەسـەر ئاسـانە ئەویـش ئەوەیـە لـەو جیاوازییانە بگەیـن و لەسـەر ئـەو بنەمایە هەڵسوکەوت و مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین، ئـەو کات لەجیاتی پەیوەندییەکی لەرزۆک و فشـۆل، پەیوەندییەکی گەرموگوڕ و لەبن نەهاتوو دێتە ئاراوە، ڕاستە خۆشەویستی شتێکی زۆر جوانە و زەمینەیەکی لەبار دروست دەکات بۆ کۆکردنـەوەی ژن و پیاو، بـەڵام خۆشەویستی بە تەنها بـەس نییە بۆ سـەرکەوتن و بەردەوامـی ئـەو پەیوەندییـە، هۆکارەکـەش ئەوەیـە خۆشەویستی لـە کاتـی ناکۆکیدا لارەسـەنگ دەبێت و دەکەوێتـە ژێر

تاقیکردنەوەیەکی زۆر قورسەوە، بە تایبەتی کاتێک ژن و پیاو لەژێر سەقفی خانوویەکدا کۆدەبنەوە. خۆشەویستی هەر وەک چۆن لە دایک دەبێت دەکرێ بشمرێت، لە بەرامبەردا دەکرێ گەشە بکات و بەردەوامیش بێت و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر و زۆرتر بێت، بەڵام بەو مەرجەی بزانین چۆن پارێزگاری لێ دەکەین، ئەمەش کاتێک دەبێت:

یەکەم: دان بە بوونی جیاوازیی هەردوو ڕەگەزدا بنێین.

دووەم: لەمیانی هەڵسوکەوت و مامەڵەی ڕۆژانەماندا ڕەچاوی ئەو جیاوازییانە بکەین.

ڕەنگە لە کاتی خوێندنەوەی ئەم قسانە پرسیارێکی بەجێ بێت بە مێشکتدا و بڵێیت: ئەرێ باشە ئەم جیاوازییانە چۆن دروست بوون؟

کوڕ و کچێک هەردووکیان لە یەک ماڵدا دێنە دنیاوە، پەروەردەیان، بەخێوکردنیان، ئاین و دابونەریتی کۆمەڵایەتییان هەر یەکێکە، کەچی کاتێک گەورە دەبن هەریەکەیان ڕێچکەی تایبەت بە خۆی دەگرێ، کچ خۆی دەگەیەنێت بە کاروانی ژنان و کوڕیش بە کاروانی پیاوانەوە، زۆر بە ئاسانی تێبینیی ئەوە دەکەیت کە هەست و نەست و جۆری بیر کردنەوە و شێوازی دەربڕینیان جیاوازە لە یەکتر.

ڕاستت دەوێ هیچ کام لە پەروەردە و ڕۆشنبیری و ئاین و ئاستی ئابووری و سروشتی کۆمەڵگا و داباب و نەریتی کۆمەڵایەتی بەرپرس نین لە جیاوازی نێوان ژن و پیاو، هەرچەندە هەموو ئەمانە کاریگەرییان لەسەر دروستکردنی کەسایەتی دەبێت، بەڵام هەر لە سەرەتای لەدایکبوونمانەوە بەبێ ویستی خۆمان ڕەگی جیاوازی لە هەناوماندا چەکەرە دەکات، جیاوازی بیرکردنەوە و

دەربڕین و هەست و نەستمان دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازیی بنەچەی دروستبوونمان.

**بنەچەی دروستبوون**

هێڵێک بهێنە بە ژێر ئەم دەستەواژەیەدا، نهێنییەکە لێرەدا خۆی حەشار داوە، وەرە با ئێستا قسە لەسەر بنەچەی دروستبوون بکەین.

هەوڵ دەدەم لەم کتێبەدا بە شێوازێکی مرۆڤانەی پوخت جیاوازییەکانی نێوان پیاوان و ئافرەتان دیاری بکەم، تا ئەو ئەندازەیەی بتوانم خۆم بە دوور دەگرم لەوەی بابەتەکە ڕەهەندێکی ئایینی پێ بدەم، بەڵام هەندێ شت هەیە بەبێ دەستبردن بۆ زانیارییەکانی ئاین مەحاڵە لێیان تێبگەین، من زۆر لەوە دڵنیام هەرچەندە زۆر جار پێم خۆش نییە دڵنیایی بدەم؛ چونکە ئەوەی کە من دەیڵێم تێگەیشتنی منە یان ئەو ڕایەیە کە من پێموایە ڕاستە، بەڵام لەجیاتی هۆکاری جیاوازی نێوان پیاوان و ئافرەتان هیچ هۆکارێکی ڕاستەقینەی بۆ نابینمەوە جگە لە جیاوازی بنەچەی دروستبوون.

با کەمێک بگەڕێینەوە بۆ دواوە، نا، باشتر وایە زۆر بگەڕێینە دواوە، بە دیاریکراوی بۆ سەرەتای دروستبوونی مرۆڤ، خوای گەورە ویستی وا بوو ئەم هەسارەی زەوییە ئاوەدان بکاتەوە، وەک دەبینی ئاوەدانیشی کردەوە، هات لە قوڕ بە شێوازێکی ڕێکوپێک شێوەی مرۆڤێکی دروست کرد و پاشان ڕۆحی کرد بە بەریدا و ئادەم هاتە کایەوە، بەڵام تاقە پیاوێک بە تەنها چی بکات، ئاوەدانکردنەوەی ئەم زەوییە پان و بەرینە کەی لە کێشی ئەودایە بە تەنها، پاشان ئەی چۆن وەچە بخاتەوە تا پێکەوە لەگەڵ وەچەکانیدا ئەو ئامانجەی لە پێناویدا هاتووەتە بوون بەدی بێنێ، کەواتە حەوا پێویستە، خودا فەرمانی کرد و حەواش هاتە کایەوە.

بەڵام ویستی خوا وا دەبێ شێوازی دروستکردنی حەوا جیاواز بێت لە شێوازی دروستکردنی ئادەم، کاتێک ئادەم خەوی لێ کەوت خوای گەورە بە دەسەڵاتی خۆی پەراسوویەکی نزیک لە دڵی دەرهێنا و حەوای لێ دروست کرد، خودا ئەیتوانی حەواش وەک ئادەم لە گڵ دروست بکات، بەڵام هات لە بەشێک لە جەستەی ئادەم حەوای دروست کرد، بۆ ئەوەی پەیوەندیی نێوانیان هەردەم تۆکمە و توندوتۆڵ بێت؛ چونکە پێکەوە هەنگاوەکانی ژیان ئەبڕن و هەتا دنیاش دنیا بێت پیاو و ئافرەت هەر پێکەوە و هاوشانی یەک ئەبن، خودا حەوای لە پەراسووی ئادەم دروست کرد تا هەمیشە هەست بکات حەوا بەشێکە لێی و خۆشی بوێ و بیپارێزێ وەک هەر ئەندامێکی تری لاشەی، بۆ ئەوەی حەواش هەست بکات وەک چۆن لق و پۆپی درەخت پەیوەستن بە درەختەکەوە، هەر کاتێک لێبکرێنەوە، یان ببڕدرێن سیس و وشک دەبن ئەمیش ئاوا و بە هەمان شێوە پەیوەستە بە ئادەمەوە.

ڕەنگە ئێستا بپرسیت باشە زانیمان بنچینەی دروستبوونی ئادەم لە گڵە و حەواش لە پەراسووە نزیکەکەی دڵی ئادەم، ئەی پێم ناڵێی کوا کاریگەریی بنچینەی دروست بوون لەسەر جیاوازیی سروشتی پیاو و ئافرەت.

کات کاتی ئەم پرسیارەیە، بەڵام تۆش با دڵ و هۆش و بیرت لای من بێ:

ئادەم لە گڵ دروست بووە، لەناو گڵیشەوە درەخت و گوڵی پڕ لە گەنم سەر دەردێنێ، گڵ سەرچاوەی هەموو بەرهەمێکە، جا لەبەر ئەوەی هەموو شتێک سروشتی ئەو ماددەیە وەردەگرێت کە لێوەی دروست بووە، دەبینی پیاوان هەمیشە بەرهەمدارن و حەزیان لە کار و بەرهەم و دەستکەوتی زیاترە، شەو و ڕۆژ دەخەنە سەر

یەک بۆ بە دەستهێنانی بژێوی ژیانی ماڵ و منداڵیان، لای نەنگییە لە ماڵەوە دابنیشێت و هاوژینەکەی بژێویی بۆ دابین بکات؛ چونکە ئەمە پێچەوانەی سروشت و ئەو بنچینەیەیە کە لێوەی دروست بووە.

لە بەرامبەریشدا وتمان حەوا بەشێکە لە ئادەم، ئادەم چونکە بەشێک بوو لە گڵ وەک گڵ بەرهەمدار بوو، بەڵام حەوا چونکە ڕاستەوخۆ لە گڵ دروست نەبووە، دەبینی بەرهەمی ئافرەتان زۆر کەمترە لە بەرهەمی پیاوان، نابینی ئافرەت زۆر ئاساییە بە لایەوە لە ماڵەوە بۆ خۆی دانیشێ و خەریکی کاروباری ناوماڵ بێت و مێردەکەی نەفەقەی بکێشێ، بەو مەرجەی کەرامەتی بپارێزێ و بە باشی مامەڵەی لەگەڵدا بکات. خۆ ئێستا بینیت بنچینەی دروستبوون چۆن کاریگەری هەیە لە سەرمان.

دووبارە لەبەر ئەوەی ئادەم لە گڵێکی توند و تۆکمە دروست بوو، جەستەشی هەمان سیفەتی وەرگرت، بەڵام لەبەر ئەوەی حەوا لەو گڵە توند و تۆکمەیە دروست نەبوو بوو، بەڵکوو لە جەستەی ئادەم دروست بوو بوو، دەبینی جەستەی ئافرەتان جەستەیەکی ناسکتر و نەرمترە.

مادام ئافرەت لە پەراسوویەکی نزیک لە دڵی ئادەمەوە هاتووە، جێی سەرنج و سەرسووڕمان نییە ئەگەر هەست و سۆزی دەروونی زاڵ بێت بە سەریدا زیاتر لەو پیاوە کردەییەی کە لە گڵەوە هاتووە.

ئادەی با ئێستا واز لەوانەی پێشوو بێنین و ئەم ئایەتەی قورئان بخوێنینەوە: (هوالذی خلقکم من نفس واحدة وجعل منها زوجها).

واتە: خوا ئەو خوایەیە ئێوەی لە یەک نەفس دروست کردووە، هەر لە ئەویش هاوسەرەکەی بەدی هێناوە.

لە یەک نەفس ئێمەی دروست کردووە کە ئادەمە، هەر لەم نەفسەش هاوسەری بۆ خولقاندووە کە حەوایە.

ئەم جیاوازییانەی ژن و پیاو کە ئەیبینین و رۆژانە لەگەڵیدا دەژین، هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازیی شێوازی دروستبوونیان، ئەم لە گڵ و ئەو لە پەراسوو، دەبێ لەم جیاوازییانە بگەین و دەست و پەنجەیان لەگەڵدا نەرم بکەین، نەک بکەوینە کێشمەکێشم لەگەڵیاندا و هەوڵی راماڵین و سڕینەوەیان بدەین، هەر کاتێک تێبینیی ناکۆکییەکت کرد لەگەڵیدا ئەوا دان بەو ڕاستییەدا بنێ کە ئەو وەک تۆ نییە، هەر کاتێک دیت خەندە و گریانی لە شوێنی خۆیدا نییە، یان زیاتر لە تۆ قسە دەکات، یان ڕۆدەچێتە ناو بنج و بنەوانی بابەتەکانەوە، یان دەیویست زیاتر گرنگی پێ بدەیت، یان حەزی لێبوو کار و کاسپیت کەم بێ و خۆشەویستیت زیاتر بێت، نەک پارەی زۆر و مەیلی کەم، ئەوا گرنگترین وانەکانی ژیانت بیر بێتەوە کە: تۆ لە گڵی و ئەویش لە تۆیە.



## ئەو دەردەدڵ دەکات... تۆش بۆکسێن

بێگومـان ڕۆژێـک لـە ڕۆژان یـاری بۆکسـێنت هـەر دیـوە، ئـەم یارییـە پڕ لـە توندوتیژییـە پیـاوان لـە ماڵـەوە ئەنجامـی دەدەن و بـە خۆشـیان نازانـن! مەبەسـتم ئـەوە نییـە بـە بۆکـس سـەروکوێلاکی ئافرەتـان دێننـە خـوارەوە، بەڵکـوو مەبەسـتم بۆکسـێنێکی مەجازییـە، بۆچـی ئـەم یارییـەم بـە نموونـە هێنایـەوە؟ چونکـە نزیکتریـن نموونەیـە بـۆ ئـەو ڕووداوانـەی لـە ئـەرزی واقیعـدا ڕوودەدەن!

لـە یـاری بۆکسـێندا هەمیشـە یاریـزان لەنێـوان دوو بژاردەدایـە، یـان ئەوەیـە کاتێـک ڕووبەڕووی بۆکسـی نەیارەکـەی دەبێتـەوە سـەرسـەختانە بەرگـری لـە خـۆی بـکات، یـان دەبـێ ئەمیـش هێرشـی پێچەوانـە بـکات؛ چونکـە دەزانـێ ئەگـەر بۆکـس نەوەشـێنێ بۆکـس دەخـوات.

هیـچ ماڵێـکی بـێ کێشـە و گیروگرفـت نییـە، هەرچەنـد لەنـاو نـاز و نیعمەتـدا بیـت و گرفتـی داراییشـت نەبێـت، دیسـان ژیـان بەبـێ خـەم و خـەوش نابـێ، سروشـتی پیـاو وایـە لـە کاتـی کێشـە و گیروگرفتەکانـدا پاشـەکشـە دەکات و کەنـاری لـێ دەگـرێ، ڕێـک وەک ئـەو کیسـەڵەی کـە کاتـێ هەسـت بـە مەترسـی دەکات، خـۆی دەکاتـەوە نـاو قەباخەکـەی خـۆی، کیسـەڵەکە کـە سـەری خـۆی ئەباتـەوە بـە نـاودا بـۆ ئـەوە نییـە گرفتەکـە لـە بیـری خـۆی بەرێتـەوە، یـان مەترسـییەکەی دەرەوە پشـتگوێ بخـات، ئـەو خەریکـی بیرکردنـەوە و هەڵسـەنگاندنی بارودۆخەکەیـە و لـە چاوەڕوانیدایـە!

بەلام سروشتی ئافرەت تەواو پێچەوانەیە، پیاو خولیای چارەسەرە و بێدەنگیش بە بەشێکی گرنگ لە چارەسەر دەزانێت، کەچی ئافرەت دێتە مەیدانەوە و دەست دەکات بە قەپوقال و باشیش دەزانێ ئەو قەپوقاڵە گرفتەکەی بۆ چارەسەر ناکات، بەلام ئەوە هەستێکە فرچکیی پێوە گرتووە و ناتوانێ بیشارێتەوە.

کاتێک لای تۆ سکاڵای حاڵی خۆی دەکا، ئامانجی ئەوە نییە کێشەکەی بۆ چارە سەر بکەیت، ئەو باش دەزانێت تۆ ناتوانی بۆی چارەسەر بکەیت، خۆ ئەگەر بیزانیایە چارەسەرت لایە تا ئەو کاتە درەنگ نەدەکەوت، ئەوەی ئەو دەیەوێ تەنها ئەوەیە تۆ گوێی بۆ بگریت، ئافرەت کاتێک دەردەدڵی خۆی دەکات و گرفتەکانی باس دەکات، باری سەر شانی سووک دەبێت.

خۆ گەلابە گەورەکانت دیوە کە لم و چەو دەگوازنەوە بۆ ئەو شوێنانەی خانووی لێ دروست دەکرێت، ئەو ساتەوەختەی دەوەستێت و عەرەبانەکەی بەرز دەکاتەوە و بارەکەی ڕۆدەکات، ئیتر قورسایی لەسەر نامێنێ، بە هەمان شێوە ئافرەتیش کاتێک قسەی ناو دڵی هەڵدەڕێژێ، وا هەست دەکات بارێکی زۆر قورس و گرانی لەسەر شان داگرتووە.

کاتێک ئەو بێزاریی خۆی دەردەبڕێت لەوەی کە دایکت دەست وەردەداتە ژیانی تایبەتییەوە، نایەوێ پێت بڵێ ئەم دایکەت بگۆڕە، من لەگەڵیدا هەڵناکەم، نایەوێ بڵێ سنوورێکی بۆ دابنێ یا دەنووکی لە سەرم لابات و بەس دەستوەربداتە کاروباری تایبەتیی منەوە، تەنها دەیەوێ بڵێ ئەم کارەی ئەو قەڵس و بێزارم دەکات، تەنها دەیەوێ گوێی بۆ بگریت، بارێکی قورس لەسەر شانیەتی دەیەوێ لە بەردەمتدا هەڵیڕێژێ، نەک بیکا بە سەرتدا.

ئافرەت کاتێک دەنگ هەڵدەبڕێت و قسە لەسەر گرفتەکانی دەکات، پیاو ئەمە بە هێرش بۆ سەر خۆی دەزانێ و وا تێدەگات خەتاباری دەکات، نازانێ ئەم قسەکردنەی ئافرەت پێویستییەکی دەروونییە و لەم ڕێگەیەوە ناخی خۆی خاڵی دەکاتەوە و بارێکی قورس لەسەر شانی خۆی لادەدات، بۆیە پیاو وەک یاریزانی بۆکسێن، یان ئەوەیە سەرسەختانە بەرگری دەکات و دەڵێت: ئەم قسانەی تۆ هیچی وانییە، دایکم زۆر چاکە و ئەوەی دەیکات دەستێوەردان نییە، بەڵکوو خۆشەویستی و دڵسۆزییە، یان ئەوەیە هێرشی توند دەکات و دەڵێ: هەمووی سووچی تۆیە، دەبێ سەرجەم تێبینییەکانی دایکم بە سنگێکی فراوانەوە وەربگریت و نەرمونیان بیت لەگەڵی.

لات سەیر دەبێت ئەگەر بڵێم هەم بەرگری و هەم هێرشەکەشت ڕاست و دروست بوون، بەڵام کێشە لە کاتەکەدایە، ئەو کاتەی ئەو دەیەوێ بارە قورسەکەی ڕۆبکات، تۆ تەنها دەبێ گوێ بگریت، لێیگەڕێ با هەرچی لە دڵیدایە هەڵیڕێژێ، تۆ هەتا سنوور و قەبارەی کێشەکە نەزانیت، چۆن چارەسەری دەکەیت؟ ئەو خۆبەتاڵکردنەوەیەی ئافرەتەکە دوو شتی گرنگت بۆ دەستەبەر دەکات، یەکەم: قسە دەکات بەم قسەکردنەشی دەحەوێتەوە. دووەم: تێڕوانین و گۆشەنیگای ئەو بۆ کێشەکە دەبینیت، ئیمەی مرۆڤ ڕاستترین قسەمان لەو کاتانەدایە کە لەژێر فشاری دەروونیدا دەیکەین.

ئەمەش واتای ئەوە نییە ئیتر پێویستە تۆ هەر گوێ بگریت و نقەت لێوە نەیەت، دوو جۆر گرفت هەیە لە یەکیان جیا بکەرەوە، هەندێ گرفت کە هاوژینەکەت سکاڵای لە دژ دەکات دەتوانی چارەسەری گونجاوی بۆ ببینیتەوە، بەڵام هەندیکیان چارەنووس (قدر)ن و چارەسەری لە دەست تۆدا نییە، بۆ نموونە خۆ تۆ ناتوانیت دایکت بگۆڕیت و هەر چۆنێکیش بێت، ئەرکی سەر شانتە

باش بیت لەگەڵی، ئەمە ئەگەر وامان دانا هاوسەرەکەت ڕاست دەکات و سەرچاوەی هەندێک لە کێشەکان دایکتە.

ئامانجی ئەم کتێبە ئەوە نییە ڕۆبچێتە ناو ئەم وردەکارییانەی کە لەماڵێکەوە بۆ ماڵێکی تر و لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێ، بەڵکوو ئامانجی ئەم کتێبە ئەوەیە بە قووڵی بچێتە ناو تایبەتمەندییە هاوبەشەکانی پیاوان و تایبەتمەندییە هاوبەشەکانی ژنانەوە، بەڵام مادام باسەکە هەر کرایەوە خراپ نییە ئەم ئامۆژگارییەش بکەین: هەندێ جار ڕێگاچارەی گونجاو و سەرکەوتوو بۆ چارەسەرکردنی هەر کێشەیەک، ئەوەیە ڕێگە نەدەیت کێشەکە ئاڵۆزتر ببێ و هەڵکشانی زیاتر بە خۆیەوە ببینێ، دارەکە وەک تەرازوو لە ناوەڕاستدا بگرە و مەهێڵە هیچ تایەکیان لارەسەنگ بێت بە سەر تاکەی تردا، ناڵێم هاوسەرەکەت هاوتای دایکتە، بەڵام دەڵێم هەر وەک چۆن دڵڕەنجاندنی دایک هیچ پاساو و بەهانەیەک هەڵناگرێت، هەرواش جیابوونەوە لە هاوسەرەکەت کارەساتێکە هیچکامتان بە سەرکەوتوویی لێی دەرناچن، ئا ئەمەیە مەبەستەکەی من کە دەڵێم: چارەسەری گونجاو بۆ هەر کێشەیەک ئەوەیە لە قەبارەی خۆیدا بیهێڵیتەوە و نەهێڵی زیاتر هەڵکشێ.

بەڵام هەندێ گرفت هەیە چارەسەری لە دەستی تۆدایە ئەگەر دەتەوێت پارێزگاری لە ماڵەکەت بکەیت، دەبێ لە بنیان بهێنیت، خۆ ئەگەر تۆ هیچ هەنگاوێکی چارەسەرت نەنا و ئەویش بێدەنگی هەڵبژارد و ناخی خۆی خواردەوە، ئەوە مانای ئەوە نییە تۆ سەرکەوتوو بوویت لە سەپاندنی دۆخەکەت بە سەریدا، بەڵکوو مانای ئەوەیە بەشێک لە پەیوەندی نێوانتانت مراندووە، شاعیر دەڵێ: (ويبقى الود ما بقي العتاب) واتە: هەتا گلەیی و گازەندە بمێنێ خۆشەویستیش دەمێنێ.

مانەوەت لە دەرەوە تا درەنگانێکی شەو لەگەڵ هاوڕێکانت نیگەرانی و ناڕەزایی هاوسەرەکەتی لێ دەکەوێتەوە، ئەم گرفتە چارەسەری لە دەستی تۆدایە، خۆ ئەو بەو هەڵوێستەی ناڵێت پەیوەندیت لەگەڵ هاوڕێکانت بپچڕە و تەنها بۆ من بە، بەڵکوو دەڵێ بیرت دەکەم و پێم خۆشە هەردەم لە پەنامدا بیت، بەلام ئێمەی مرۆڤ بە پیاوان و بە ئافرەتانیشەوە زۆر جار وشەکانمان هاوئاهەنگ نین لەگەڵ هەست و سۆزی ناخماندا، ئافەرین بۆ ئەو کەسەی وشەکانیشی هەمان هەست و سۆزی ناخی تیایە.

کاتێک گرفتێکی لەم شێوەیە دێتە پێشەوە، دەبێ بزانیت هاوسەرەکەت مافی هەیە لە سەرت، هەر وەک چۆن تۆش مافت هەیە لەسەر ئەو، ئەم مافانەش تەنها لە بابەتە سێکسی و سۆزدارییەکاندا خۆی نابینێتەوە، بەڵکوو پەلوپۆ دەهاوێژێ بۆ زۆر لایەنی تری ژیان.

لەو کاتەی کە دەچینە ناو ژیانی هاوسەرگیرییەوە، دەبێ قوربانی بە بەشێک لە تایبەتمەندییەکانی خۆمان بدەین، ژیانی پێش و پاش هاوسەرگیری نابێ وەک یەک وابێت، ئەگەرچی نە هاوژینەکەت مافی ئەوەی هەیە تۆ بۆ خۆی زەوت بکات و بە یەکجاری لە جیهانی پێش هاوسەرگیریت دابیڕێت، نە تۆش مافت هەیە هاوژینەکەت وەک شتومەکی ناو ماڵ تەماشا بکەیت و تەنها لە کاتی پێویستیدا بە کاری بهێنیت، بزانە گرفتەکان لە کوێوە سەر هەڵ دەدەن بنبڕیان بکە و کاتەکانت ڕێک بخە و پەیوەندییەکانیشت سنووردار بکە، مۆمی خۆشەویستیتان با هەر بگڕێت، خوا نەکردە ئەگەر کوژایەوە، ئیتر ژیانتان دەبێت بە دۆزەخ.

پوختەی قسە: ئەرکی سەرشانی تۆ ئەوەیە سەرنجی گلەیی و گازەندەکانی بدەیت و ئەوەی پێت چارەسەر دەکرێت هەوڵی

چارەسەرکردنی بدەیت، ئەوەیشی پێت چارەسەر ناکرێت، هەر گوێی بۆ بگریت، نەکەی فەرامۆشی بکەیت، وەک ئەو بارهەڵگرەی کە بە کۆڵانەکاندا دەسووڕێتەوە و لەژێر بارە قورس و گرانەکەیەوە هەر دەنرکێنێ.

ڕەنگە بپرسیت باشە من ئەرکی سەرشانی خۆمم زانی ئەی ئەرکی ئەو چییە؟

لە وەڵامدا پێت دەڵێم ڕووی قسەی من لە تۆیە و ئەم کتێبەش تەنها بۆ پیاوانە، بەڵام لەبەر ئەوەی ڕەنگە ئافرەتانیش ئەم کتێبە بخوێننەوە وەلامی پرسیارەکەت دەدەمەوە، بەڵام ئەم قسانەی من بۆ ئەوانە نەک بۆ تۆ، کە وەڵامەکەت خوێندەوە نەیەی دەست بکەیت بە بۆکسوەشاندن و پێی بڵێیت ئەمە سروشتی منە و ئەبێ تۆش دان بە خۆتدا بگریت، ئەی بۆ من دان بە خۆمدا دەگرم تا تۆ ناخی خۆت خاڵی دەکەیتەوە؟

ئەگەر واتکرد، دیارە باش لە وانەکە نەگەشتووی، چونکە ئەم کارەی تۆ وا دەکات ئەو نەتوانێت ناخی خۆی خاڵی بکاتەوە، ئەو کات گرفتەکە لە یەکێکەوە دەبێت بە دوان، دڵیت ئازار داوە و ڕێگەش نادەیت دەردەدڵ بکات، دەکرێ سروشتی خۆتی پێ بڵێی، بەڵام نەک لە کاتی هەڵچوون و جۆشوخرۆشی ئەودا، بەڵکوو کاتژمێرێک دوو کاتژمێر دواتر بچۆ پەنایەوە و دەست لە ملی بکە و پۆزشی بۆ بهێنەرەوە و بە شێنەیی پێی بڵێ: سروشتی من ئاوا و ئاوایە، ئەمە ئەو کارەیە پێویستە تۆ بیکەیت بۆ دڵدانەوەی ئەو.

بەڵام تۆی ئافرەتیش دەبێ بزانیت کاتێک هاوسەرەکەت قسەت پێ دەبڕێت و ناهێڵێ ئاه و زووخاوی خۆت هەڵڕێژیت کە حەق نییە وا بکات، ئەوە شتێکە زیاتر پەیوەندی بە خوو و سروشتی ئەوەوە هەیە و دوورونزیک پەیوەندیی بە تۆوە نییە، هەر وەک چۆن تۆ سروشتت داوات لێ دەکات بە وشەی زارت ئاه و زووخاوی ناخت هەڵڕێژی.

ئەو کەسێکی خۆپەرست و دیکتاتۆر نییە مافی قسەکردنت لێ زەوت بکات، بەڵکوو ئەو تۆی ئافرەت وەک بەرپرسی خۆی تەماشا دەکات و خۆشبەختیی تۆش بە ئەرکی سەر شانی خۆی دەزانێت و دڵتەنگی و بێزاریشت لە کەمتەرخەمی خۆیدا دەبینێتەوە، راستت دەوێ ئەو دژی تۆ ناوەستێتەوە، بەڵکوو بەرگری لە خۆی دەکات.

تۆی ئافرەت دەبێ ئاگاداری خاڵێکی گرنگ بیت، ئەویش ئەوەیە پیاو لەسەر دەروونی قورسە کاتێک هەست بە لاوازی و شکستی خۆی بکات لەمەڕ چارەسەرکردنی کێشە و گرفتەکانی تۆ، بۆیە گوێنەگرتنیشی لە بۆڵە و سکاڵاکانت هەوڵێکە بۆ پینەکردن و پەردەپۆشکردنی ئەو شکستە.

هەردوولامان پێویستە ئاگاداری ئەم خاڵە گرنگە بین:

ئێمەی پیاوان پێویستە لەوە تێبگەین کە ئێوە پێویستان بەوەیە کە گوێتان لێبگیرێ و کاتی پێوستتان پێ بدرێت بۆ ئەوەی باری دەروونتان خاڵی بکەنەوە.

ئێوەی ئافرەتانیش دەبێ لەوە تبگەن کە هەستکردنی پیاو بە لاوازی و دەستەوسانی هەستیکی تاڵ و ئازاربەخشە.

ڕەنگە پێمان بڵێن ئەی قوڕی کوێ بە سەرماندا بکەین؟ ژن ناوێرێ بێزاری خۆی دەرببڕێ نەوەک پیاو هەست بە شکست و لاوازیی خۆی بکات و پیاویش ناوێرێ قسە بە ژن ببڕێت نەوەک خەم و خەفەت لە دڵیدا پەنگ بخواتەوە؟

نا نا هێندەش ئاڵۆز نییە سەری لەبەر دەرنەکەین، چارەسەر ئاسانە بەو مەرجەی کێشەکان نەشەخسێنین.

ئافرەت دەتوانێ زیرەکانە خەمی خۆی هەڵڕێژێت بەبێ ئەوەی ڕاستەوخۆ پیاوەکەی بە کەمتەرخەم تۆمەتبار بکات، ئەمەش بەوە دەبێت کە سکاڵا لە دەست هەڵویستەکانی بکات نەک خۆی.

خوشکی بەڕێزا لـە بەکارهێنانـی ئـەم جـۆرە دەسـتەواژانەی لای خـوارەوە خـۆت بـە دوور بگـرە:

- هەموو ئەوانەی ڕوویدا تۆ لێی بەرپرسیت.
- ئەمانە هەمووی بەهۆی تۆوە بوو.
- ئەگەر ئاوات بکردایە، ئەوە ڕووی نەدەدا.
- تۆ کەللەڕەقیت.
- تۆ گوێ بە هیچ نادەیت.

ئـەم جـۆرە دەسـتەواژانە وروژێنـەرن و هەسـتی بۆکسوەشـاندن لـە ناخـی پیـاودا زینـدوو دەکەنـەوە.

پیاویـش بـە هەمـان شـێوەی ئافرەت نابێ گرفتـەکان بشەخسـێنێ و دەبێ بزانـێ ئـەوەی هاوژینەکـەی بێـزار کـردووە خـودی ئـەو نییـە، بەڵکـوو ئـەو بارودۆخەیـە کـە تێـی کەوتـووە.

بـا پێداچوونەوەیـەک بـۆ ئـەو گرفتانـە بکەیـن کە پێشتر وەک نموونە هێنامانـەوە و سـەرچاوەی بێزاری و داد و بێدادی هاوژینەکەت بوون:

بێزاریـی هاوژینەکـەت لـە دایکـت لەبـەر ئەوەیـە وا هەسـت دەکات بـە هەڵوێسـت و دەسـتتێوەردانەکانی سـنووری تایبەتمەندییەکانـی ژیانـی ئـەو دەبەزێنێـت، نـەک لەبـەر ئـەوەی تـۆ کـوڕی ئـەو دایکەیـت، خـۆ ئـەو بـاش دەزانێـت هەرچۆنێـک بێـت تـۆ بـە کـوڕی ئـەو دایکـە هـەر دەمێنیتـەوە، هەمـوو قسـەیەکی هاوژینەکـەت ئەوەیـە بـا مـن و تـۆ پێکـەوە درێـژە بـە ژیـان بدەیـن بەبـێ ئـەوەی هیـچ کەسـێک دەسـت وەربداتـە ژیانمانـەوە، ئەگەرچـی بـە نـاوی دڵسـۆزیشـەوە بێـت، خاڵـی گرنـگ لێـرەدا ئەوەیـە ئـەو هێشـتا تـۆی دەوێـت و نایـەوی دەرگای گفتوگـۆت لەگەڵـدا دابخـات.

بـا بێینـەوە سـەر باسـی گرفتـی مانـەوەی بەردەوامـت لـە دەرەوە لەگـەڵ هاوڕێکانـت تـا درەنگانێکـی شـەو.

باشە تۆ پێتوایە هاوژینەکەت تۆی خۆش ناوێ و هیچ گرنگییەکت پێ نادات و پێی خۆش نییە لە ماڵەوە بیت؛ چونکە بوونی تۆ بە سەرچاوەی خۆشبەختیی خۆی نازانێت و گلەیی و گازەندەکانیشی تەنها بۆ سەرکۆنەکردنە و هیچی تر؟

نا نا، بێگومان ئەمانە هیچیان وانین! ئەو لە تۆ بێزار نییە! بەڵکوو لەو هەڵوێستەت بێزارە کە هاوسەنگیت نەپاراستووە لەنێوان ژیانی هاوسەرگیری و پەیوەندییە تایبەتییەکانتدا، هاوژینەکەت بەم هەڵوێستەی دەیسەلمێنێ هێشتا تۆی دەوێ، ئەم یاسایە لە من وەربگرە: ئێمە شەڕی سوور تەنها بۆ ئەو شتانە دەکەین کە خۆشمان دەوێن. ئەو ئەگەر تۆی خۆش نەوێت، شەڕ لەسەر مانەوەت ناکات لە ماڵەوە.



## ئەو ئامۆژگاریت دەکات...
## تۆش بە سووکایەتی تێدەگەیت

دوێنێ دایکمم برد بۆ سەردانی پزیشک، دوای تەواوبوونمان گەڕامەوە بۆ گاراج بۆ ئەوەی ئۆتۆمبیلەکەم دەربکەم، دایکم لە دوورەوە وەستابوو چاوەڕوانی منی دەکرد، هەر کە دەرگای ئۆتۆمبیلەکەم کردەوە ژن و پیاوێک بە خۆیان و ئۆتۆمبیلەکەیانەوە خۆیان کرد بە ناو گەراجەکەدا، ژنەکە دابەزی و پیاوەکەش لە هەوڵی ئەوەدا بوو ئۆتۆمبیلەکەی بخزێنێتە نێوان دوو ئۆتۆمبیلی نزیک لە منەوە، کارەکە ئاسان نەبوو، چونکە لە پشتیشمانەوە ڕیزێک ئۆتۆمبیل وەستابوو، ئیتر گەراجی ئۆتۆمبیل هەر ئاوا شلوق و جەنجاڵە، پیاوەکە تۆزێک چووە پێشەوە و تۆزێک هاتە دواوە بەڵام کار سەری نەگرت، تۆزێکی تریش پاش و پێشی کرد هەر هیچ، ئەمجارە ژنەکە کەوتە یارمەتیدانی و وتی زیاتر وەرە دواوە، تۆزێک لای ڕاست بگرە، وریای ئەو ئۆتۆمبیلە سوورەبە پیایدا نەکێشی!

ئاگام لێبوو پیاوەکە بەم هاوکارییەی هاوژینەکەی زۆر قەڵس و بێزار بوو، بە توورەییەکەوە وتی تۆ وازم لێ بێنە و سەرم لێ تێک مەدە، خۆم ئەیخەمە ئەو بەینەوە، بە هەر حاڵێک بوو خستی، کە لە ترومبیلەکە دابەزی، نیشانەی ئەو توورەییە هەر بە ناوچاوانیەوە مابوو، هەتا دووریش کەوتنەوە هەر دەستی ڕائەوەشاند، دیار بوو هەر لە نقە و بۆڵەی خۆی نەکەوتبوو!

ڕەنگە لات سەیر بێت ئەگەر بڵێم ئەوەی لەم پیاوە ڕوویدا پێشتر لە منیش ڕوویداوە، هەڵوێستی منیش زۆر جیاواز نەبوو لە هەڵوێستی ئەم پیاوە، بەڵێ منیش هەستم بە تووڕەییەک کرد لە ناخمدا، بەڵام هەرچۆنێک بوو لەو کاتەدا هەوڵم دا دان بە خۆمدا بگرم و هەڵوێستەکەم هێندەی ئەو توند نەبوو، من پاساو بۆ کاردانەوەی ئەو پیاوە ناهێنمەوە، بەڵام ئەوە هەست و نەستی هەموو پیاوێکە، هەرچەند مەرج نییە هەموو پیاوێک هەمان کاردانەوەی هەبێت.

ئەڵبەت ئەوەی لە من ڕوویدا ماوەیەکی زۆر پێش ئێستا بوو، ئەگەر ئەوەی ڕابووردوو جارێکی تر دووبارە بێتەوە هەرگیز وەک جاران تووڕە نابم، ڕاستە هەندێ کات ڕێنمایی و ئامۆژگاری جێگای خۆی نییە و بە دەستێوەردان دێتە هەژمار، بەڵام وەک جارانیش گەرم دانایەم و فوو ناکەمە کەپوومەوە، ئەزانی بۆ؟ چونکە ئێستا باش لەوە تێگەیشتووم بۆچی ئەو لە شتێکی سادە و ساکاری ئاوادا خۆی پێ ناگیرێ و پەنا بۆ ڕێنماییکردنم ئەبا و منیش بۆ بەو کارەی ئەو هەناسەسوار ئەبم، لە کاتێکدا نە ڕێنماییەکەی ئەو پێویستە و نە هەڵچوون و تووڕەییەکەی منیش لە جێی خۆیدایە!

هەر بۆ زیادە دڵنیایی خۆم حەزرەتی ئیبراهیمئاسا کە داوای لە خودا کرد پیشانی بدات چۆن مردوو زیندوو دەکاتەوە، هەرچەندە دەشیزانی ئەوە کارێکە لە توانای خودا بەدەر نییە، منیش هەستام ڕووداوی ئەم ژن و پیاوەم بە جیا بۆ دوو لە هاوڕێکانم باس کرد، ئامانجیشم ئەوە بوو ڕایانکێشمە ناو گفتوگۆ و کۆمێنتیان لێ وەرگرم بەبێ ئەوەی بزانن ئەم دواندنەی ئەوان بۆ ئەوەیە شتێکی لە بارەوە بنووسم!

هەر وەک چۆن چاوەڕوانم دەکرد گۆشەنیگای هەردووکیان چوونیەک بوو، قسەی هەردووکیان وای دەگەیاند ئافرەتان دەست لە ئیشی پیاوان زۆر وەردەدەن، جاری وا هەیە فریان بەسەر شۆفێرییەوە نییە کەچی دەم لە وەستایی دەکوتن: خێراییەکەت کەم بکەرەوە، نەکەی ئەو ئۆتۆمبیلەی پێشەوە تێپەڕێنی، ئەوە بۆ وا بە خێرایی دەستت شکاندەوە، ئەوە بۆ بە توندی لەو تاسەیەت دا، ئەمانە و چەندین بۆی تر؟ باشە ئافرەت بۆ بە ئارامی دانانیشێت و بوار بە پیاوەکەی نادات بە ڕێکوپێکی شۆفێری خۆی بکات، بۆ متمانە بە شۆفێری ئێمە ناکەن، خۆ چەندین گەشتمان پێکەوە کردووە بە سەلامەتی چووین و هاتووینەتەوە؟ کاتێک پیاو دەیەوێت لە گەراجێکدا ئۆتۆمبیلەکەی پارک بکات پێویستە ئافرەت خۆی لە دەم وەستایی بە دوور بگرێت و لێگەڕێت پیاوەکەی شوێنێکی گونجاو بۆ ئۆتۆمبیلەکەی ببینێتەوە؛ خۆ ئەگەری پێکدادانی ئۆتۆمبیل لەناو گەراجدا ئەگەرێکی لاوازە.

ئەم هەڵوێستە سادە و ساکارانەی ئافرەت هەردەم لە تووڕەییدا دەمانهێڵنەوە مادام نەزانین پاڵنەر و هۆکارەکانی چین!

وا دیارە خەریکە لە مەبەستەکە نزیک دەبینەوە:

بۆچی ئافرەتان دەست لە ئامۆژگاری و ڕێنمایی پیاوان هەڵناگرن؟ ئەی بۆ پیاوان بەم ئامۆژگارییەی ئەوان سەرگەرم و تووڕە دەبن، لە کاتێکدا ئەم کارەی ئەوان دەکەوێتە خانەی بەرژەوەندیی پیاوانەوە.

بە شێوەیەکی گشتی سروشتی ئافرەت چاودێری و پارێزگاریکردنە، لە کاتێکدا سروشتی پیاو کارکردن و بەرهەمهێنانە، کاتێک دەڵێین ئافرەت سروشتی چاودێریکردنە مەبەستمان ئەوە نییە ئەوە تاکە بژاردەی ئەوە و ئیتر بژاردەی بەرهەمهێنان لە دەرەوەی توانستی ئەوەوەیە، بە پێچەوانەوە ئافرەت هەیە خاوەن کارە و کارامەشە لە

بواری خۆیدا، ئافرەت هەیە بە هزر و بەرهەمی هەوڵ و تێکۆشانەکانی توانیویەتی ڕێڕەوی مێژوو بگۆڕێ، بەڵکوو مەبەستمان ئەوەیە ئافرەت تواناکانی خۆی زیاتر لە بواری چاودێریکردندا دەبینێتەوە وەک لە کارکردن و بەرهەمهێنان، هەرچەندە کۆکردنەوەی ئەم دوو بوارە بۆ ئەو ناکۆک و دژوار نییە، بەڵکوو دەتوانێ لە هەردوو بوارەکەدا ئەسپی خۆی تاو بدات.

بە هەمان لۆژیک کاتێک کە دەڵێین خوای باڵادەست سروشتی پیاوی وەک سروشتی ئەو گڵە دروست کردووە کە ڕاستەوخۆ لێوەی بەدی هێناوە و بەرهەمهێنانیشی کردووە بە کاڵای باڵای ئەمە بەو واتایە نایەت پیاو چاودێری پێ ناکرێت و دەستەوسانە لە ئاستیدا، هەموو باوکانی جیهان جۆرێک لە چاودێری پێشکەش دەکەن، بەڵام ئەوەندەی ویستی بەرهەمهێنان و هەوڵدان بۆ پێشکەوتن و هەڵکەوتن و چارەسەرکردنی گرفتەکان لە کەسایەتیاندا جێگەی گرتووە، هەرگیز ئەوەندە مەیلی چاودێریکردن لە کەسایەتیاندا بەدی ناکرێت، بەڵام زاڵبوونی ویستی بەرهەمهێنان مەیلی چاودێریکردن لە لای پیاوان بە یەکجاری خەفە ناکات، بەڵکوو دەکرێ پێکەوەش کۆ ببنەوە، مەبەستی سەرەکی ئێمە ئەوەیە پیاو لە کام لەم دوانەدا زیاتر خۆی دەبینێتەوە و لەپێناوی کامیاندا دروست بووە؟ بەرهەمهێنان، یان چاودێریکردن؟

ئافرەت بۆ بچووکترین وردەکارییەکانی ژیان یەکسەر پەنا بۆ ئامۆژگاری و ڕێنماییکردنی پیاو دەبات، ئەمەش نەک لەبەر ئەوەی پیاو پێویستی بە ئاراستە و ئامۆژگاریکردنی هەیە و خۆی بۆ خۆی نازانێت کاروبارەکانی بە باشی بەڕێوە ببات، بەڵکوو ئەمە سروشتی ئافرەتە و وەک وتمان فرچکی پێوە گرتووە، ئامۆژگاریکردنیش لای ئەو جۆرێکە لە چاودێریکردن، بۆیە کاتێکت زانی بۆ شتێکی بچووک خۆی پێ ڕاناگیرێ و یەکسەر ئامۆژگاریت پێشکەش دەکات، ژن و

پیاوی ناو گەراجەکەش کە پێشتر قسەمان لەسەر کرد باشترین نموونەیە، ئەو بەم کارەی نایەوێت خۆی بە سەرتدا بسەپێنێ و بڵێ فەرمانت پێ ئەکەم ئەمە بکە و ئەوە مەکە، ئەو زۆر بە سادەیی پێتدەڵێت: ها ئەوە من لە پەناتەوەم و گرنگیت پێ ئەدەم!

ئامۆژگاریکردنی ژن بۆ پیاو نیشانەی خۆشەویستییە، ڕێک وەک ئەوە وایە پیاوەکە چەپکێ گوڵ، یان مستیلەیەکی زێڕی پێشکەش بە هاوژینەکەی کردبێت، پیاوی بەرهەمهێن و کارساز لە ڕێی چەپکێ گوڵ یان مستیلەیەکی زێڕەوە بە هاوژینەکەی دەڵێت: خۆشم دەوێیت و جێگەی ڕێز و بایەخی منیت، بەڵام ئافرەت لە ڕێی پێشکەشکردنی ئامۆژگارییەوە سروشتی چاودێریکردن و هەستی خۆشەویستی خۆی بۆ هاوسەرەکەی دەردەبڕێت.

جیاوازیی نێوان کەسایەتی ئێمەی پیاوان و ئەوانی ژنان ئەوەیە: لەبەر ئەوەی ئێمە بوونەوەرێکی کردەیین و زیاتر گرنگی بە ئەنجام ئەدەین، هەمیشە سەرنجمان لەسەر ئامانجە، بەڵام ئەوان زیاتر گرنگی بە شێوازی گەیشتن بە ئامانج دەدەن، نەک خودی ئامانج، ئەوان کاتێک دەستێوەردان دەکەن و دەستپێشخەری دەکەن بۆ پێشکەشکردنی ئامۆژگاری، مەبەستیان ئەوە نییە لاماندەن لە ڕێگەی گەشتن بە ئامانجەکانمان، بەڵکوو ئەوان خۆیان بە خاوەنی ئەو ڕێگەیە دەزانن کە ئێمە دەگەیەنێتە ئامانج، ئەوان بەم ڕێگەیە خۆشەویستی خۆیان بۆ ئێمە دەردەبڕن، بەڵام ئێمە وا تێدەگەین گوایە ئەوان خۆیان لە ئێمە بە چاوکراوەتر دەزانن و هەوڵی سەرۆکاری و خۆسەپاندن دەدەن!

جیاوازییەکی تری نێوان کەسایەتی ئێمەی پیاوان و ئەوانی ژنان ئەوەیە ئێمەی پیاوان زۆر لە دەنکە گوێز ئەچین، تەماشای گوێز بکەن چۆن ڕووکاری دەرەوەی توێکڵێکی ڕەقوتەقە و ناوەوەشی کاکڵەیەکی بەتام و چێژ، پیاوان بە توێکڵێکی توند و ڕەق ڕووپۆشی کەسایەتی

خۆیان دەکەن، چونکە هێز و پێز لە سروشتیاندا ڕەگی داکوتاوە و نایانەوێ ئافرەتیش لە هەمان ئاستدا ببیننەوە!

پیاو ئامۆژگاری پێشەکەش ناکات مەگەر داوای لێ بکرێت، لە بەرامبەردا ئافرەت دەستپێشخەری دەکات بۆ بەستنی پەیوەندی و بە شوێن وردەکاری بابەتەکاندا دەڕوات و حەزی لێیە ژێر بەڕە بهێنێتە سەر بەڕە، جاری وا هەیە پیاو کێشەیەکی هەیە تەنانەت بۆ نزیکترین هاوڕێی خۆیشی باس ناکات، کەچی هاوژینەکەی فوو ئەکات بە شاوردا و دنیای لێ تێدەگەیەنێ، خۆ ئەو مەبەستی ئەوە نییە خەڵکی تر بهێنێتە ناو ژیانی خۆیەوە و ناو و ناوبانگی خانەوادەکەی خۆی بزڕێنێ، بەڵام خوا ئافرەتی ئاوا نەرم دروست کردووە، نایەوێ بەربەست لە نێوان خۆی و ئەوانی تردا دروست بکات بە قەدەر ئەوەی ئەیەوێ پردی پەیوەندی بنیات بنێت. زۆر جاریش کە پیاو ئامۆژگاری وەرناگرێت هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە دەیەوێ پارێزگاری لە توێکڵە ڕەقەکەی خۆی بکات، نایەوێ بە لاوازی و نەرمی دەرکەوێت، دەستپێشخەریی ئافرەتیش بۆ ئامۆژگاریکردن بەبێ ئەوەی داوای لێ بکرێت بۆ ئەوەی نییە توێکڵە ڕەقەکەی پیاو بشکێنێ و بیەوێ وەک لاواز پیشانی بدات، ئەو تەنها دەیەوێ پەیوندی تۆکمە و توندوتۆڵ دروست بکات.

پیاو هەوڵی گۆڕین و چاککردنی دەوروبەری نادات، تەنها مەگەر ئەرکی سەرشانی بێت، یان داوای لێ بکرێت، کاتێک ئەبیستێ کەسێک گرفت و ئاریشەیەکی بۆ پێش هاتووە، ڕاستەوخۆ ناچێت بۆ لای و بڵێ: ئاوا بکە و ئاوا مەکە، بەڵام ئەگەر داوای لێ کرا ئەو کات بەشداری دەکات، سروشتی ئافرەت زۆر بە پێچەوانەوەیە، هەمیشە چاککردنی نارێکییەکانی دەوروبەری بە ئەرکی لە مێژینەی خۆی دەزانێ، کاتێک دەبینێ منداڵێک قۆپچەی کراسەکەی کراوەتەوە،

هەرچەند منالّی خۆشی نەبێت حەز دەكات بۆی ببەستێتەوە، هەر شتێكی نارێک ببینێت بە مەرجێ بتوانێ رێكی دەكاتەوە، كاتێک دەبینێت لە كتێبخانەكەدا كتێبێكی چەند بەرگی بەپێی ژمارەی سەر بەرگەكان ریز نەكراوە، خۆی پێ ناگیرێ و یەكسەر ریزبەندی بۆ دەگێرێتەوە، ئەگەرچی كتێبخانەكەی مالّی خۆشی نەبێت، من بۆ خۆم چەندین جار لە كتێبخانەی زانكۆ ئەمەم لە ئافرەتان دیوە، خۆم بۆ جارێكیش ئەمەم نەكردووە و هیچ پیاوێكیشم نەدیوە ئەوە بكا!

كەواتە سروشتی ئافرەت چاككردنە، هەرچەند ئەو چاككردنە بەرپرسیاریەتی ئەویش نەبێت؛ بۆیە هەردەم لە ئامۆژگاریكردن و چاودێریكردنی پیاو كۆلّ نادات!

زۆربەی پیاوان كەمتەرخەمن لە زوو چاككردنەوەی شتە تێكچووكانی ناو مالّ، ژنانیش لە دەست ئەم خووەی پیاوان داد و بێدادیانە، پیاو دەلّێ هەر ئیش بڕوا، خوا ئەكات مێزی ناو چێشتخانەكە بە كەلّكی ئەوە دێت قاپ و قاچاخی تێبكرێت ئیتر گرفت نییە با تاكەكانیشی لێبووبێتەوە، بەلاّم ژنان بە تەنها كەلّكلێوەرگرتنی شتومەكەكانی ناو مالّ بە گرنگ نازانن، بەلّكوو لایەنی جوانكاریش لای ئەوان گرنگی خۆی هەیە و ئامۆژگاری و رێنماییەكانیشیان هەولّێكە بۆ دەستەبەركردنی ئەو جوانكارییە!

ئێمە بۆ قەلّس و بێزار دەبین كاتێک ئافرەت ئامۆژگاریمان دەكات؟
وەلاّمەكەی ئاسانە: ئێمە پێمان خۆشە تەنها پشت بە خۆمان ببەستین.

ئەی بۆ ئافرەتان لە ئامۆژگاریكردن كۆلّ نادەن؟
وەلاّمی ئەم پرسیارەش هەر ئاسانە: كاتێک تۆ یارمەتی و ئامۆژگاری پێشكەشی ئافرەت دەكەیت بەبێ داواكاری خۆی، ئەو ئەوە

بە جۆرێک لە میهرەبانی و نرخاندنی دەبینێت و ئەو هەستەی لە لا دروست دەبێت کە ئەو جێگای ڕێز و گرنگپێدانی دەوروبەرەکەیەتی، بەڵام پیاوان زۆر بە پێچەوانەوەن کاتێک بەبێ داواکاریی خۆیان هاوکاریان پێشکەش دەکرێت، خۆیان بە لاواز و دەستەوسان دێتە پێش چاو، پیاو دەیەوێ لە پێگەی هێز و پێزدا خۆی ببینێتەوە نەک لە پێگەی سۆز و بەزەیی، پێی خۆشە هاوکاری پێشکەش بکات، نەک هاوکاری بکرێت، ئافرەت بە هەردووکیان دڵخۆش دەبێت چ هاوکاری بکات یا هاوکاری بکرێت، بگرە زیاتر پێی خۆشە هاوکاری بکرێت.

پیاو کە بە ئاسانی نایەتە ژێر باری ئامۆژگاری ژنەوە، هۆکارەکەی بە تەنها بۆ ئەوە ناگەڕێتەوە کە پیاو گوێزئاسا کەسایەتی خۆی بە تۆێکڵێکی ڕەق و ئەستوور ڕووپۆش کردووە، بەڵکوو چەندین هۆکاری تر لە پشت ئەم سەختگیرییەی پیاوەوەن، لەوانە: پیاو خۆی بە بەرپرسی ژن و دەستەبەرکردنی پێداویستییەکانی ژیانی دەزانێت؛ بۆیە لەسەر دەروونی قورسە لە پلەی بەرپرسیارییەوە بۆ پلەی فەرمانبەری بێتە خوارەوە، بەڵام تۆی پیاو دەبێ لەوە تێبگەی ڕۆڵەکەت گۆڕانکاری بەسەر نایەت و بەردەوام تۆ لە پێگەی سەرپەرشتیاری و بەرپرسیارێتی خۆتدا دەمێنیتەوە، کاتێک ژن ئامۆژگاریت دەکات، لە کورسی دەسەڵات ناتهێنێتە خوارەوە، ئەو تەنها یارمەتیت پێشکەش دەکات و پێت دەڵێت: خۆشم دەوێیت و تۆ لای من جێگای بایەخ و گرنگپێدانیت.

هۆکارێکی تری سەختگیریی پیاوان ئەوەیە: ژنان کاتی گونجاو دەستنیشان ناکەن بۆ ئامۆژگاریکردن کە ئەمە گرنگترین شتە، ئافرەت دەبێ بزانێت کەی دەستتێوەردان دەکات و چۆنیش پاشەکشە دەکات، خۆ من ناڵێم تۆ دژی سروشتی خۆت بوەستە و دەست لە چاودێریکردن هەڵگرە و هەوڵی چاککردنی خواروخێچی دەوروبەرەکەت

مەدە، نکوڵیش لەوە ناکەم هەندێک ڕووداو پێویستی بە ئامۆژگاری دەمودەست هەیە، ئەوەی من ئەمەوێ بیڵێم ئەوەیە هەندێک جار پیاو حەزی بە بیستنی قسە نییە ئەگەرچی بە نەرمیش بدرێت بە گوێیدا و مەبەستێکی پاکیش لە پشتیەوە بێت.

خوشکی بەڕێز! بیرت نەچێت ئامۆژگاریکردن بە ئامادەبوونی خەڵکی تر، هەستی پیاو بریندار دەکات، عەرەب دەڵێن: ئامۆژگاریکردن بە دیار چاوی خەڵکەوە ئابڕوو بردنە!

هەندێک جار پیاوان ئامادە نین ئامۆژگاری ژنان وەربگرن نەک لەبەر ئەوەی قسەکانیان ڕاست نین، بەڵکوو لەبەر ئەوەی بە زمانێکی زبر و ڕوشێنەر دەریدەبڕن، لەم حاڵەدا پیاو و ئافرەت هەردووکیان هاوبەشن، تەنانەت ئافرەتیش کە کەیفی بە وەرگرتنی ئامۆژگاری دێت، ئەگەر بە زمانێکی نەرم و حەکیمانە ئامۆژگاری نەکرێت وەری ناگرێت! کەواتە هەردوو لامان پێویستە بە وریاییەوە وشەکان بەکار بێنین، چونکە وشەی ڕەق هەستی پاک دەشێوێنێ!

جاری وا هەیە جیاوازی ئاستی ڕۆشنبیری لەمپەرە لە بەردەم وەرگرتنی ئامۆژگاری ژن، ئەگەر ژن ئاستی ڕۆشنبیری نزمتر بوو، ئەوا پیاو بۆچوونەکانی بە هەند وەرناگرێت.

برای بەڕێز! دەست لەم لووتبەرزییەت هەڵگرە، خۆ تۆ لە پێغەمبەری خودا بالاتر نیت لە سوڵحی حودەیبییەدا بە قسەی هاوسەرەکەی کرد، کاتێک فەرمانی بە هاوەڵانی کرد سەریان بتاشن، ئەوانیش لە خۆشەویستییان بۆ خودا و بۆ پێغەمبەر لە سەرەتاوە فەرمانەکەیان جێبەجێ نەکرد، چونکە پێیان وابوو گەڕانەوە بۆ مەککە بەبێ عومرەکردن تەسلیمبوونە بە بڕیاری موشریکەکان و ئەمەش خۆی لە خۆیدا نەنگییە بۆ ئاینەکەیان، هاوژینەکەی پێی فەرموو ئەگەر دەتەوێت فەرمانەکەت جێبەجێ

بکرێت دەبێ سەرەتا لە خۆتەوە دەست پێ بکەیت، ئەویش هەستا بە دیار چاوی هاوەڵەکانیەوە سەری خۆی تاشی و هاوەڵانیش هیچ چارەیەکیان نەما و چاویان لێ کرد و سەریان تاشی!

خۆ ئەگەر ژنەکە ئاستی ڕۆشبیری بەرزتر بوو، ئەوا پیاو ئامۆژگارییەکانی بە جۆرێک لە خۆسەپاندن و فەرمان بەسەرداکردن تەماشا دەکات.

برای ئازیز! ئەمە گرێ و گۆڵی دەروونییە، پێویستە زوو خۆتی لێ دەرباز بکەیت، ئەو بە ئامۆژگارییەکانی دەیەوێت کەموکورتییەکانی ژیانت چارەسەر بکات، نەک بڵێت من لە تۆ تێگەیشتووترم.

ئافرەت لە وەها دۆخێکدا چی بکات؟

ئەگەر ئاستی ڕۆشنبیری لە پیاوەکەی نزمتر بوو، باشتر وایە سەرەتا بەم شێوەیە دەست پێ بکات: من متمانەی تەواوم بە ژیری و تێگەیشتوویی تۆ هەیە، تۆ لە تواناتدایە کێشەی هەر کەسێک چارەسەر بکەیت، بەڵام جاری وا هەیە مرۆڤ چارەسەر بۆ کێشەی خۆی نابینێتەوە، پێت چۆنە ئاوا و ئاوا بکەیت، بەم وشانە دەکرێ ئامۆژگارییەکانی بە بایەخەوە وەر بگرێت!

بەڵام ئەگەر لە پیاوەکەی ڕۆشنبیرتر بوو، باشتر وایە ئاوا دەست پێ بکات: ها ئەوە من لە پەناتەوەم هەر لە پەناشتەوە ئەمێنمەوە، نەک لەبەر ئەوەی بڵێم من لە تۆ ڕۆشنبیرترم، یا خوێندەوارترم، بەڵکوو لەبەر ئەوەی من تۆم خۆش ئەوێت، تۆ بۆ من لە هەموو بڕوانامەکانم گرنگتری، پێت چۆنە ئاوا و ئاوا بکەیت؟

پیاوی ئازیز: دەبێ لەوە تێبگەی ئامۆژگاریکردن بە واتای ڕەخنەگرتن نایەت، بەڵکوو هەوڵێکە بۆ یارمەتیدان و بەس!

خانمی بەڕێز: دەبێ تۆش لەوە تێبگەیت هەندێک جۆری ئامۆژگاری هەیە هەستی تووڕەیی پیاو جۆش دەدات، ئەگەرچی مەبەستێکی باشیش لە پشتیەوە بێت!

کاتێک پیاوەکەت سەرقاڵی چاککردنەوەی شتێکی تێکچووی ناو ماڵەکەتە، نەکەیت لەو کاتی سەرگەرمییەیدا سەر بخەیتە سەری و بڵێی لایبە و خۆتی پێوە ماندوو مەکە، تۆ چووزانی چاکی بکەیتەوە، بچۆ وەستایەکی بۆ بانگ بکە، ئەمەی تۆ دەیڵێی ئامۆژگاری نییە، بەڵکوو شەڕفرۆشتنە! ئەو کە خۆی نەیتوانی چاکی بکاتەوە هیچ ڕێگایەکی لە بەردەمدا نامێنێت و بەبێ پێوتن پەنا بۆ وەستایەکی شارەزا دەبات، بەڵام تۆ بەم قسانەت پەلکێشی هەڵچوون و کاردانەوەی توندی دەکەیت.

کاتێک هاوسەرەکەت لە نووسینگەکەی خۆی دانیشتووە و سەرقاڵی بەجێگەیاندنی کارەکانیەتی، نەچیت پێی بڵێیت: ئەرێ ئەوە بۆ ئەم نووسینگەیەت هێندە شپرز و بێسەروبەرەیە؟ ئەوە بۆ دەستێکی پیا ناهێنی؟ ئەوەی تۆ لەم کاتەدا دەیڵێی ئەوەندەی گەرمکردنی ئاگری شەڕە، ئەوەندە ئامۆژگاری و دڵسۆزی نییە!

کاتێک پێکەوە خۆتان بۆ دەرچوونێک ساز و ئامادە دەکەن، ئەگەر جلوبەرگەکەیت بە دڵ نەبوو، یەکسەر مەیدەرە بەر توانج و ڕەخنە: بەخوا ئەم جلوبەرگەت لێ نایەت، ئەرێ تۆ بۆ نازانیت جلوبەرگی جوان هەڵبژێریت؟ ئەم شێوازە لە دەربڕین هەوڵێک نییە بۆ جوانپۆشکردنی هاوسەرەکەت، ئەوەندەی بنپێخستنی حەز و ئارەزووەکانیەتی، هەوڵی جوانپۆشکردنی ئاوا دەبێت: گیانەکەم دەستە جلەکەی ترت جوانتر لێ دێت، هەر چەند تۆ هەرچی بپۆشیت هەر لێت جوانە!



## تۆ سندووقیت و ئەویش پەرتوبڵاو

یەکێک لەو شتانەی کە ئافرەتان گلەیی و گازندەی زۆری لە دژ دەکەن، ئەوەیە: پیاوان زۆر قەڵس و جاڕز دەبن کاتێک سەرقاڵ دەکرێن و ڕێگەی تەواوکردنی کارێکیان لێ دەگیرێ، ئەگەرچی کارەکەش زۆر جێگەی بایەخ و گرنگیپێدان نەبێت، وەک خوێندنەوەی هەواڵی ناو ڕۆژنامەیەک، یان چاککردنەوەی شتۆکەیەکی لەکارکەوتووی ناوماڵ، ئەوان دەڵێن باشە بۆ پیاوان نایەن لەو کاتانەدا قسەمان لەگەڵدا بکەن تا بۆیان دەربکەوێت کارەکەش هێندە قورس نییە، دەکرێ بە دەم کارکردنیشەوە قسە و باس بکەن!

پیاوانیش گلەیی و گازەندەی خۆیان لە ژنان هەیە و دەڵێن کاتی پێویستمان پێ نادەن بۆ گوێگرتن لە قسەکانمان، ئەوان بە دەم سەعیپێکردنی منداڵەکەیانەوە، بە دەم کەوگیروەردان لە مەنجەڵی سەر ئاگرەوە، بە دەم هەڵخستنی جلوبەرگی شۆراوەوە گوێ بۆ قسە و باسەکانمان دەگرن، هەندێک جار بە دەم گوێگرتنەوە، نەک کارێک بەڵکوو دوو کار پێکەوە گرێ دەدەن، دیارە ئەو قسانەی ئێمە جێی بایەخ و گرنگیپێدانی ئەوان نین، ئەگینا چۆن لە یەک کاتدا دەتوانن سەرنج بخەنە سەر زیاتر لە بابەتێک، باشە چی ئەبێ ئەگەر لە کاتی گوێگرتندا کارەکەیان ڕاگرن و پاشان بچنەوە سەری؟

ئەم گرفتە لە هەموو ماڵێکدا بە بەردەوامی دووبارە و چەندبارە دەبێتەوە، هۆکارەکەشی ئەوەیە پیاو و ئافرەت هیچ لایەکیان لە سروشتی یەکتر تێناگەن، پیاو لە هەڵەدایە ئەگەر پێی وابێ ڕووداوەکان چ کاریگەرییەکیان لەسەر ئەو هەبوو، دەبێ هەمان کاریگەریشی لەسەر ئافرەت هەبێت، هەروەها بە پێچەوانەشەوە!

سایکۆلۆجیەت و بیرکردنەوەی ئێمە و ئافرەت جیاوازە، سەرچاوەی گرفتەکانیش هەمیشە بۆ دەرکنەکردنی ئەو جیاوازییە و مامەڵەنەکردن لەگەڵیدا دەگەڕێتەوە، تێگەیشتن لە شێوازی کارکردنی یەکتری، گرفتەکان کەم دەکاتەوە، یان لانی کەم لێکدانەوەی هەڵە بۆ هەڵسوکەوتی یەکتر کەم دەکاتەوە!

پیاوان نە ڕقیان لە قسەی ئافرەتانە و نە خوێندنەوەی ڕۆژنامەیەکیان لە قسەی ئەوان پێ باشترە و نە پێشیان وایە چاککردنەوەی ئامێرێکی لەکارکەوتوو گرنگترە لەو بابەتەی ئەوان قسەی لەسەر دەکەن.

هەموو ئەوەی پیاوان ڕقیان لێیەتی ئەوەیە: کاتێک سەرگەرمی کارێکن، گرفتیان بۆ دروست بکرێت و ڕێگەی کارکردنیان لێ بگیرێت، کەواتە بابەتەکە ئەوەندەی پەیوەندی بە سروشتی پیاوانەوە هەیە، ئەوەندە پەیوەندیی بە قسەی خودی ئافرەتانەوە نییە!

ئافرەتیش بە هەمان شێوەی پیاو، نە شیکاری پرسیارێکی بیرکاری لە قسەی پیاو لە لا گرنگترە، نە شێوی ناو مەنجەڵەکەی لە قسەی پیاو لە لا بەتامترە، تەنانەت ئەو کاتەش کە بە دەم گوێگرتنەوە دوو ئیشی تریش پێکەوە گرێ دەدات هەر مەبەستی بێنرخ تەماشاکردنی قسەی پیاو نییە، بەڵکوو ئەوە پەیوەندی بە پیادەکردنی سروشتی خۆیەوە هەیە نەک بە قسەی پیاوەکەوە!

هۆکاری پشت ئەم جیاوازییە ئەوەیە پیاو سندووقییە و ئافرەتیش پەرشوبڵاو!

ئەم قسەیە یانی چی؟

عەقڵی پیاو لە کۆمەڵە سندووقێک پێکهاتووە، سندووقێک بۆ کارکردن، سندووقێک بۆ خانەوادە، سندووقێک بۆ یاری تۆپی پێ، یەکێکی تر بۆ سیاسەت، خۆ ئەگەر ویستی ڕۆبچێتە ناو کارێکەوە، یان چارەسەری گرفتێک بکات، ئەوە زۆر بە ئاسانی سندووقێکی تایبەتی بۆ دەکاتەوە و دەچێتە ناویەوە، هەر سندووقێکیشی کردەوە سندووقەکانی تر بە داخراوی دەهێڵێتەوە، سەرکەوتوو نابێت ئەگەر دوو سندووقی لە یەک کاتدا کردەوە، خۆ ئەگەر کردیشیەوە ئەوا تووشی شپرزەیی و شڵەژان دەبێت. ئەمە وەڵامی ئەو پرسیارەیە ئاخۆ بۆ کاتێک پیاو لەسەر کارەکەیەتی و هاوسەرەکەی پەیوەندی پێوە دەکات و شەکوای حاڵی خۆی لە دەست کاروباری منداڵەکانی دەکات، هاوسەنگی خۆی لە دەست دەدات و دەکەوێتە حاڵەتی شڵەژانەوە؟ چونکە جگە لەو سندووقەی کە خۆی کردوویەتیەوە سندووقێکی تریشی بە سەردا کراوەتەوە، شڵەژانەکەی بەهۆی ناوەڕۆکی سندووقە نوێکەوە نییە (سکاڵای هاوسەرەکەی)، بەڵکوو بەهۆی کردنەوەی سندووقی دووەمەوەیە؛ کاتێکیش دەگەڕێتەوە بۆماڵەوە و هاوسەرەکەی جارێکی تر هەواڵەکەی بۆ دەگێڕێتەوە، وەک ئەوە وایە یەکەم جاری بێت بیستبێتی، هۆکاری باش گوێنەگرتنی یەکەم جاریشی ئەوە بووە کە بەسەر سندووقەکەی خۆیدا سندووقێکی تریشی بە سەردا کراوەتەوە.

پیاو ئاوایە، کاتێ تەماشای یارییەکی تۆپی پێ دەکات، هەموو شتێکی بیر ئەچێتەوە، نە شتە لەکارکەوتووەکانی ماڵ بیر و هۆشی داگیر دەکەن، نە گوێ بە میوانەکانی ئەدات، تەنانەت

یارمەتی هیچ کام لە منداڵەکانیشی نادات، ئەو لەو کاتەدا چووەتە ناو سندووقێکەوە و سندووقەکەشی لەسەر خۆی داخستووە، ئافرەتیش وا تێدەگات هەر قسە و باسێکی لەگەڵدا بکاتەوە، هێندەی یارییەکە لە لای گرنگ و بایەخدار نابێت، بەڵام ئەمە وانییە، ئەوەی کە هەیە ئەوەیە ئافرەتەکە دەیەوێ سندووقێکی لە بەردەمدا بکاتەوە و بە زۆر بیخزێنێتە ناویەوە، ئافرەت لەوە تێناگات کە بۆ پیاو ئەستەمە بتوانێت لە یەک کاتدا لە دوو شوێنی جیاوازدا بێت، ئەگەرچی ئەمە بۆ خۆی کارێکی ئاسانە، خۆ ئەگەر پیاوەکە لە کاتی تەماشاکردنی یارییەکەدا کارلێکیش لەگەڵ ژنەکەیدا بکات، ئەوا کارلێکێکی ساردوسڕ دەبێت و وەڵامەکانیشی کورت و چڕ دەبن، ئەوپەڕی دەڵێت: باشە جارێ وازم لێبێنە ئێستا سەرم قاڵە.

کاتێک پیاو لەگەڵ هاوڕێکانی لە قاوەخانەیەکدا دادەنیشێت، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو لەسەر کورسییەک دانیشتووە و ناتوانێت لە شوێنێکی تردا بێت، ئەو لەو کاتەدا تامەزرۆی بینینی هاوڕێ دوور وڵاتەکەی نییە، بیری دایکیشی ناکاتەوە، هۆشی لای کاری سبەینێشی نییە، هەموو ئەمانە لە سندووقی داخراودان، کاتی تایبەتی خۆیان هەیە بۆ کردنەوە، بەڵام ئێستا سندووقە کراوەکە (دانیشتن لەگەڵ هاوڕێکانی)، سندووقەکانی تری بیر بردۆتەوە!

ئافرەت لەمەدا تەواو پێچەوانەی پیاوە، بەدەم کەوگیروەردان لە مەنجەڵی سەر ئاگرەکەوە بیری دایکیشی دەکاتەوە کە دوو ڕۆژە نەیدیوە، خەیاڵی لای گرفتی هاوڕێکەشیەتی کە دوێنێ بۆی باس کردووە، لە خەمی تاقیکردنەوەی قوتابخانەی سبەینێی کوڕەکەشیایەتی، هێشتا دووی ڕەمەزانە و هەڵەداوانی پێکەوتووە بۆ جلوبەرگی ڕۆژی جەژنی!

نـە مەیلی بینینی دایکی، نـە گرفتی هاوڕێکـەی، نـە تاقیکردنـەوەی سبەینێی کوڕەکەی، نـە جلوبەرگی جەژنی هیچ کام لەمانـە سـەرنجی لەسـەر مەنجەڵی سـەر ئاگرەکـە لانـادەن، ئافـرەت ئـاوا پەرشـوبڵاوە! ئـەو بـە پێچەوانـەی پیـاوەوە دەتوانێت لـە یـەک کاتـدا زۆر بـە باشـی مامەڵـە لەگـەڵ دوو سـندووق و زیاتریشـدا بـکات، ئـەو بـە ویسـتی خۆی نـەک بـە زۆر زیاتر لـە سندووقێک دەکاتـەوە! بۆیـە کاتێک ئـەو قسـەت لەگـەڵ دەکات و وازیـش لـە ئیشـەکەی خـۆی ناهێنێت، ئـەوە مانـای ئـەوە نییـە بایەخـت پـێ نـادات، ئـەم خەملاندنـەی تـۆ سـەرچاوە لـە سروشـتە سـندووقییەکەی خۆتـەوە دەگـرێ، لـە کاتێکـدا ئـەو بـە سروشـتە پەرشـوبڵاوەکەی خۆیـەوە دەتوانـێ بـە دەم کارکردنیشـەوە گـوێ بگرێـت، چێشـت لێبنـێ و ڕێنمایشـت بـکات، ئوتـوو بـکات و گرفتیش چارەسـەر بکات، دەرس بـە منداڵەکـەی بڵێت و لیسـتەی نـرخ (فاتورة)یـش حیسـاب بـکات، کردنـەوەی چەنـد سـندووقێکی زۆر لـە یـەک کاتـدا دایناچڵەکێنێ و نایخاتـە حاڵەتی شـپرزەبوونەوە، تەنانـەت زۆربـەی ئافرەتـان ئـەو پەرشـوبڵاوییە ئەوەنـدە شـپرزەیان نـاکا کـە نەتوانـن لـە یـەک کاتـدا فریـای چەنـد کارێـک بکـەون!

متماتـەی تـەواوت هەبێـت لای ئـەو کارێکـی زۆر ئاسـانە بـە دەم تەماشـاکردنی زنجیـرە درامایەکـەوە، شـیر بـە منداڵەکەشـی بـدات، بـە وردی تەماشـای ڕووداوەکانی نـاو دراماکـە دەکات و بـە وریاییشـەوە منداڵەکـەی تێر شـیر دەکات، نـە لـە بینینی دراماکـە بێبـەش دەبێت، نـە منداڵەکەشـی دەخنکـێ، خـوا بـە شـێوازێکی وا سـاز و ئامـادەی کردووە کـە بتوانـێ لـە یـەک کاتـدا زۆر بـە باشـی چەنـد کارێـک پێکـەوە ئەنجام بـدات!

تـۆ سـەرنجی قسـە و باسـەکانی پیـاوان و ژنـان بـدە، بزانـە هـەر لایەکیـان چـۆن دەسـت پـێ دەکـەن و چـۆن کۆتایـی پـێ دێنـن، ئەگـەر

پیاوان دەستپێکی قسەکانیان بە باسی ئابووری دەست پێ کرد، بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لەو باسەدا دەمێننەوە، زۆر بە کەمی لە بابەتەکە دەردەچن، خۆ ئەگەر بابەتی تریشیان هێنایە گۆڕێ و مشتومڕیان لەسەر کرد زۆر جار هەمووی لەژێر بابەتە سەرەکییەکەدا کە بابەتی ئابوورییە جێگای دەبێتەوە، ئەوان ئێستا هەموویان پێکەوە لەناو سندووقێکی گەورەدان!

بچۆ سەرنجی قسەکانیان بدە لەسەر یارییەکەی دوێنێ، دەبینی ئەوان تەنها باس لە ئاستبەرزیی فڵانە یاریزان و ئاست نزمیی فڵانی تر، فڵانە هەڵەی داوەر دەکەن، نایەن باسی نرخی بلیتی یارییەکە و چونێتی کۆکردنەوەی زبڵ و خاشاکی ناو یاریگاکە بکەن، تەنانەت زۆر جار خۆیان لە باسە لابەلاکانی پەیوەست بە بابەتە سەرەکییەکانیش دەبوێرن، بۆ ئەوەی لە تەوەری سەرەکی بابەتەکە دوور نەکەونەوە

ئەوجا سەرنجی قسەی ئافرەتان بدە، لە سەرەتاوە باس باسی قوتابخانەیە و لە کۆتایشدا باسی چێشت و چەڵاوە، تۆ تەنها بیر و هۆشت لای قسەی سەرەتا و کۆتاییان نەبێت، سەرنجێکیش لە ناوەڕاستی قسەکانیان بدە و ببینە چۆن لە شامەوە دەیهێنن و لە شیرازەوە دەریدەکەن، تاوێک باسی خوازبێنیی فڵانە کچە و تاوێک باسی جلوبەرگە و تاوێکی تر باسی کێشەی فڵانە ژن لەگەڵ ماڵە خەزوورانیدا، جیابوونەوەی فڵان ژن لە مێردەکەی هتد...

ئافرەت ئاوایە بە ئاسانی لە بابەتێکەوە بۆ بابەتێکی تر باز ئەدات بەبێ ئەوەی هەست بە شەکەتیی دەروونی بکات، ئەمە ئەو کارەیەکە پیاوان هەرگیز پێیان ناکرێت!

ئەگەر ئەم جارە لەسەر کێشەیەک مشتومڕ کەوتە نێوانتانەوە تاقی بکەرەوە و بزانە چۆن هەرچی پەڕاوی کۆن هەیە هەر لەو

ڕۆژەوەی خوازبێنیت کردووە تا ئەمڕۆ هەمووی هەڵدەداتەوە، هەندێک شت دێنێتە بەر باس، دوور و نزیک پەیوەندی بە کێشەکەی ئێوەوە نییە، بەڵام پێویستە بزانیت ئەو مەبەستی ئەوە نییە لە بابەتەکە دوور بکەوێتەوە و کێشە کۆنەکان زیندوو بکاتەوە، یان گرفتەکە ئاڵۆزتر بکات، ئەوەی کە هەیە ئەوەیە مێشکی ئافرەت وەک تۆڕی ئینتەرنێت وایە، کاتێک دەتەوێت بۆ بابەتێک بگەڕێیت، بۆ دەوڵەمەندکردنی بابەتەکە هەمیشە لە ژێریەوە کۆمەڵێک لینکت پێ دەدات، کلیک لەسەر هەرکامیان بکەیت لاپەڕەیەکت بۆ دەکاتەوە کە چەندین لینکی تری لەخۆ گرتووە، ئافرەتیش ڕێک ئاوایە، هەرچەند هەوڵ بدەیت ناتوانیت بیگۆڕیت، ئەمە هەڵقوڵاوی سروشت و سیستەمی کارکردنیەتی، بۆیە تۆش پێویستە وەک خۆی وەریبگریت و لەسەر ئەو بنەمایەش مامەڵەی لەگەڵدا بکەیت، هەر وەک چۆن دەبێ ئەویش بزانێت هەرچەند هەوڵ بدات ناتوانێت سروشتە سندووقییەکەی تۆ بگۆڕێت، ئەوە سیستەمی کارکردنی تۆیە، پێویستە وەک خۆی وەریبگرێت و لەسەر ئەو بنەمایەش مامەڵەت لەگەڵدا بکات، ئەم قسانەی پێ بدە با بیخوێنێتەوە، باشتر وایە پێکەوە بیخوێننەوە!



## ئەویش وەک تۆ کار دەکات

پێشتر وتمان پیاو ڕاستەوخۆ لە گڵ دروست بووە و ئافرەتیش لە پەراسووی پیاو؛ بۆیە سروشتییە پیاو زیاتر لە ئافرەت سەروساختەی لەگەڵ بەرهەمهێناندا هەبێت، ئافرەت لە ڕووی سایکۆلۆژییەوە زۆر بە لایەوە ئاساییە تەنها کاروباری ناو ماڵ لە ئەستۆ بگرێت و هیچ جۆرە پەیوەندییەکی بە پەیداکردنی پارە و دابینکردنی بژێوییەوە نەبێت، بەڵام پیاو هەست بە شەرمەزاری دەکات ئەگەر ئەم ڕۆڵە بگێڕێت، هەردوو لایان لەمەدا ملکەچی سروشتی خۆیانن، پێشتر لەسەر ئەم باتە بە تێروتەسەلی قسەمان کرد، نامەوێ ئەوەی ڕابردوو دووبارە بکەمەوە، بەڵام ئەم پێشەکییەم بۆیە هێنا، چونکە هەندێ خاڵی تیایە جێی سەرنجە و دەمانەوەێ ڕۆشنایی زیاتری بخەینە سەر!

زۆرێک لە پیاوان چەمکی کارکردن ئەبەستنەوە بە بەدەستهێنانی پارەوە، هەر ئیش و پیشەیەک ئەگەر دەستکەوت و داهاتی نەبوو ئەوا بە کار ناوزەدی ناکەن، ئەمە لێکدانەوەیەکی سەرپێیی و ماددیانەیە بۆ چەمکی کار، لە ڕاستیدا کۆمەڵێک شت هەن جگە لە دەستکەوتی ماددی بڕیار لەسەر هەر جۆرە هەوڵ و کۆششێکی مرۆڤ دەدەن، لەوانە: شوێنەواری ئەو کارە، ئەو هەوڵەی لەو پێناوەدا بە خەرج دراوە، لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە ئەگەر ئەو کەسە بەو کارە هەڵنەستێت چ بۆشاییەک دروست دەبێت!

بۆ ئەوەی زۆر لە بابەتەکە دوور نەکەوینەوە و هەوڵ بدەین خاڵ لەسەر پیت دابنێین، وەرە با پێکەوە ئەم بەسەرهاتە بخوێنینەوە:

فەرمانبەرێکی بانک لە ئەنجامی فشاری کارەکەیەوە تووشی دڵتەنگی و خەمۆکی دەبێت، یەکێک لە هاوڕێکانی پێشنیاری سەردانیکردنی پزیشکێکی دەروونیی بۆ دەکات، لە سەرەتاوە دوودڵ دەبێت، لە پاش هێنان و بردن و بیرکردنەوەیەکی قووڵ بڕیار دەدات سەردانی پزیشکێکی دەروونی بەناوبانگی شارەکەی خۆی بکات، پەیوەندیی بە نۆڕینگەی پزیشکەکەوە کرد و کاتی بینینی پزیشکی بۆ دیاری کرا، کاتێک دەچێت بۆ لای پزیشکەکە ئەم وتووێژە لە نێوانیاندا ڕوودەدات:

پزیشک: کارت چییە؟

فەرمانبەرەکەی بانک: ژمێریاری بانکم.

- ئەی هاوسەرەکەت کاری چییە؟

- کار ناکات، کابانی ماڵە.

- کێ بەیانیان خۆت و منداڵەکانت بە خەبەر دێنێت و قاوەڵتی بەیانیانتان بۆ ساز دەکات؟

- هاوسەرەکەم، چونکە کاری نییە.

- تۆ و هاوسەرەکەت بەیانیان کامتان زوو لە خەو هەڵدەستن؟

- من کاتژمێر حەوتی بەیانی لە خەو هەڵدەستم، بەڵام ئەو کاتژمێر پێنج، ئەو منداڵەکان ساز و ئامادە دەکات بۆ قوتابخانە، چونکە ئەو وەک من کاری نییە.

- کێ منداڵەکانت دەگەیەنێتە قوتابخانە؟

- هاوسەرەکەم، ئەی خۆ پێم وتی ئەو کاری نییە.

- ئەی کە منداڵەکانی گەیاندە قوتابخانە و هاتەوە چی دەکات؟

- دوای ئـەوەی منداڵەکانـی گەیانـدە قوتابخانـە، ئیتـر لـە ماڵـەوە قاپـەکان دەشـۆرێ و جلـەکان دەخاتـە نـاو جلشـۆرەکە و ناومـاڵ گسـک دەدات و ئەگـەر پێداویسـتییەکی مـاڵ هەبێت ئەیکرێت، هەتا ئـەم وردەکارانـە دەکات کاتی دروسـتکردنی نانی نیوەڕۆش دێتە پێشـەوە، پاشـان دەچێت بـە دەم منداڵەکانـەوە، چونکـە ئـەو کاری نییـە، بـەڵام مـن هەتـا چـواری دوای نیـوەڕۆ لەسـەر کارەکـەم دەمێنمـەوە!

- کـە هاتیتـەوە بۆ ماڵـەوە تـۆ چـی دەکەیـت و هاوسـەرەکەت چـی دەکات؟

- دوای نانخـواردن پشـوویەک ئـەدەم و سـەرخەوێکی بـۆ ئەشـکێنم؛ چونکە کارکردن لـە بانکدا قورسـە و پیـاو ئەپروکێنـێ، هاوسـەرەکەشـم لەگـەڵ منداڵەکانـدا بـە وانەکانـی قوتابخانـەدا دەچنـەوە، پاشـان بەخەبـەرم دێنێتـەوە تـا پێکـەوە قاوەیـەک بخۆینـەوە.

- ئەی ئێوارە تۆ چی دەکەیت و هاوسەرەکەت چی دەکات؟

مـن تـاوێ ڕۆژنامـە دەخوێنمـەوە و تـاوێ سـەیری تەلەفیزیـۆن دەکـەم، بـەڵام هاوسـەرەکەم خەریکـی ئامادەکردنـی خوانـی ئێـوارە دەبێـت، پاشـان قاپـەکان دەشـۆرێت و ناومـاڵ پـاک دەکاتـەوە و منداڵـەکان ئامـادە دەکات بـۆ خەوتـن.

- تۆ لە هەفتەدا ڕۆژانی پشووت هەیە؟

- بەڵێ، یەک ڕۆژ!

- ئەی هاوسەرەکەت ڕۆژانی پشووی هەیە؟

- نەخێر، خـۆ پێـم وتیـت ئـەو لـە ماڵـەوە بـۆ خـۆی دانیشـتووە و کار نـاکات!

لـە دوای خوێندنـەوەی ئـەم بەسـەرهاتە تەماشـایەکی خـۆت بکـە، ئەگـەر تـۆش وەک ئـەم کارمەنـدەی بانکیـت و پێتوایـە هاوسـەرەکەت بـێ کارە، ئـەوا دەسـتوبرد بکـە و خـۆت لـەو بێویژدانییـە دەربـاز

بکە! زۆر نابەجێیە ئەگەر ئێمە بێین چەمکی کارکردن کورت بکەینەوە لە پیشەیەکدا کە لە بەرامبەریەوە پاداشت وەربگیرێت، تۆ تەماشای گەردوون بکە، هەموو شتێک لە کاری بێوچاندایە و مووچەش وەرناگرن، لە ڕۆژدا پێش ئەوەی دەرگای فەرمانگەکان بکرێنەوە خۆر هەڵدێت، لە شەویشدا مانگ بە بەلاش زەوی ڕووناک دەکاتەوە، درەخت بەرهەمی جوانت پێشکەش دەکات و هیچیشت لێ داوا ناکات، هەنگ لەگەڵ ئەوەی گوڵەکان دەپیتێنێت هەنگوینیش دروست دەکات بەبێ بەرامبەر، باڵندەکان ئاوازی خۆش دەچڕن و شاباشیشیان ناوێت، تەنانەت بەکتریاش کە بە چاو نابینرێ خۆبەخشانە گەورەترین خزمەت دەکات کە ئەگەر ئەو نەبێت ژیان لەسەر زەویدا بەردەوامی نابێت، هەرچی شت هەیە لەم گەردوونەدا بەبێ بەرامبەر لە کاردایە، کابانی ماڵیش مرۆڤێکە پیرۆزترین کاری مرۆڤانەی لە ئەستۆ گرتووە، چ کارێک لەسەر زەویدا بە قەدەر بنیاتنانی مرۆڤ بەرز و پیرۆزە!

بەڕێزەکەم! کارکردن تەنها بریتی نییە لەو چەند کاتژمێرەی کە فەرمانبەر لە کاتی دەوامی فەرمیدا لە فەرمانگەکەی بەسەری دەبات و ئیتر ئەوی تری هەمووی بێکاری بێت! ئەوە تەنها پێناسەی فەرمانبەرە، ئەو ئافرەتەی کە وەک مێروولە لە ماڵەوە لە ڕۆژێکدا بیستوچوار کاتژمێر و لە هەفتەیەکدا حەوت ڕۆژ لە کاری بێوچاندایە، بە چ ویژدانێکەوە پێی دەڵێی بێکار؟ با فەرمانبەر و مووچە خۆری میریش نەبێت!

هاوڕێ! کارکردن تەنها بریتی نییە لە جێبەجێکردنی چەند ئەرکێکی دیاریکراو لە بەرامبەر دەستکەوتێکی مادییەوە، ئەمە وەک وتمان خۆی لە پێناسەی فەرمانبەردا دەبینێتەوە، کابانی ماڵ ڕۆڵی مامۆستا دەبینێ کاتێک لە ماڵەوە یارمەتی منداڵەکەی

دەدات بۆ جێبەجێکردنی ئەرکی قوتابخانەی، ڕۆڵی پزیشک دەبینێ کاتێک منداڵەکەی نەخۆش دەکەوێت، ڕۆڵی بانگخواز دەبینێ کاتێک دەبینێ منداڵەکانی کەمتەرخەمن لە جێبەجێکردنی پەرستشەکانی ڕۆژانەیاندا، ڕۆڵی پەروەردەکار دەبینێت بۆ ئەو منداڵە وردانەی کە چەندە پێویستیان بە نان و ئاو هەیە ئەوەندە و زیاتریش پێویستیان بە بەهای باڵا و چاندنی ڕەوشتی بەرز هەیە تێیاندا، ڕۆڵی پسپۆڕی ئابووری دەگێڕێت بۆ خەرجکردنی مووچەکەت کە بە ئەستەم بڕی سەری مانگ دەکات، ڕۆڵی توێژەری کۆمەڵایەتی دەبینێت بۆ منداڵە گەورەکانت، ئەویش کاری هەیە با فەرمانبەری مووچەخۆریش نەبێت!

ئەزیزم! تەنها ئەوانە خاوەن کار نین کە سەندیکای تایبەت بە خۆیان هەیە و داکۆکی لە مافەکانیان دەکەن و بیمەی تەندروستییان بۆ دابین کراوە، ئەمە پێناسەی پیشەگەرە! ئەو کابانی ماڵەش کە قاپەکانی بە ئاوی سارد دەشۆرێت و هیچ سەندیکایەکیش نییە داکۆکی لە پێستی دەستیان بکات، ئەویش خاوەن کارە، ئەو ئافرەتەی چەقۆی تیژ بەکار دێنێت بۆ بڕینی گۆشت و سەوزە و میوەجات و ئەگەر خۆی بریندار کرد هیچ دەزگایەکی فەرمی نییە داوای قەرەبووی لێ بکات، ئەوەش خاوەن کارە، ئەو ئافرەتەی بەهۆی منداڵە نەخۆشەکەیەوە شەو تێر خەو نابێت و بیمەی تەندروستیی کەمخەویشی بۆ دابین نەکراوە ئەویش دووبارە خاوەن کارە!

براڵە! تەنها ئەوانە خاوەن کار نین کە لە پێناو بەدەستهێنانی خەڵات و پارەی سەربار (إضافي)دا پتر لە ئەرکی سەرشانیان ئەنجام دەدەن، بەڵکوو ئەو کابانە دەستڕەنگینەش کە سەرەڕای کارە سەرەکییەکانی ناو ماڵ شیرینیش دروست دەکات، ئەویش خاوەن کارە، ئەگەرچی خەڵاتیش ناکرێت، هەروەها ئەو ئافرەتەی کە بە

شێوەیەکی قەشەنگ و سەرنجڕاکێش قژی کچەکەی ئارایش دەکات و دەیرازێنێتەوە، ئەویش کرێکارە، ئەگەرچی کرێی ماندووبوونەکەیشی وەرناگرێت!

تۆ بە تەنها کار ناکەیت... ئەویش کار دەکات

پیاو عادەتی وایە کاتێک دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە و هاوسەرەکەی سکاڵای ماندووبوونی خۆی لە دەست ئیش و کاری ناو ماڵی لە لا دەکات بە گاڵتەجارییەوە پێی دەڵێت چیت کردووە؟ ژنەش بەم وەڵامە زۆر قەڵس و بێزار دەبێت، بۆیە پێی پیشان ئەدا کە چی کردووە، بۆ ڕۆژی دواتر تا ئێوارە بە دیار تەماشاکردنی تەلەفیزیونەوە ڕۆژ بەڕێ دەکات و دەست بۆ هیچ ئیش و کارێکی ناوماڵ نابات، کاتێک پیاوەکەی دەگەڕێتەوە دەبینێ ماڵ وەک مەیدانی جەنگی لێهاتووە! قاپەکان لە ژووری چێشتخانەکەدا هەمووی بەسەر یەکدا کەوتوون و چاوەڕوانی یەکێکە بیانشۆرێت، لەولاوە جلوبەرگی قوتابخانەی منداڵەکان هەمووی بەو ناوەدا پەرشوبڵاو بوونەتەوە، لە لایەکی ترەوە یاریی منداڵەکان هەڵڕژاوە و کۆنەکراوەتەوە، پەرداخی شەربەتەکە کە منداڵە بچووکەکە لاری کردووەتەوە هەر لە شوێنی خۆیدایە، ناو ماڵ هەمووی پیسوپۆخڵ، یەکێک لە منداڵەکانی کتێبێکی بە دەستەوەیە چاوەڕوانی یەکێکە هاوکاری بکات و لەگەڵیدا بە وانەکانی قوتابخانەدا بچێتەوە، یەکێکی تریان قژی بژ و ئاڵۆزکاوە چاوەڕێیە یەکێک بۆی شانە بکات، لە هەمووی خراپتر چێشت لێنەنراوە، پیاوەکە کە ئەم بارودۆخە شڵەژاوە ئەبینێت تووشی شۆک دەبێت، ئەڵێ ببێ و نەبێ شتێک ڕوویداوە، تەماشای هاوسەرەکەی دەکات بە بێدەنگی دانیشتووە و تەماشای تەلەفیزیۆن دەکات! لێی دەپرسێت ئەرێ ئەوە چی ڕووی داوە؟ ئەویش زۆر بە

هێمنی ئەڵێ: هیچ! تەنیا بڕیارم داوە ئەو ئیشانەی پێشتر ڕۆژانە دەمکردن ئیتر نایانکەم!

لە سەرەتای ئەم باسەوە پێم وتیت: کۆمەڵێک شت هەن جگە لە دەستکەوتی ماددی بڕیار لەسەر هەر جۆرە هەوڵ و کۆششێکی مرۆڤ دەدەن، لەوانە: شوێنەواری ئەو کارە، ئەو هەوڵەی لەپێناوی ئەو کارەدا بە خەرج دەدرێت، لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە ئەگەر ئەو کەسە بەو کارە هەڵنەستێت چ بۆشاییەک دروست دەبێت!

ئادەی با ئێستا ئەم سێ خاڵە یەکە یەکە قسەیان لەسەر بکەین:

یەکەم: شوێنەواری ئەو کارە.

تۆ جلوبەرگی خاوێن دەپۆشیت؛ چونکە کەسێک هەیە بۆتی دەشۆرێت، بەم کراسەی بەرتەوە زۆر کەشخە دەردەکەویت؛ چونکە کەسێک هەیە لە پاش شۆردنی بۆی ئوتوو کردووی، منداڵەکانیشت هەروەها، بە ڕای تۆ ئەگەر هاوسەرەکەت بەم کارە هەڵنەستایە ژیان چۆن دەبوو لە ماڵەکەتدا؟

ئەو سفرە و خوانەی ڕۆژانە لە ماڵەوە بۆت دەڕازێنرێتەوە هەروا لە خۆیەوە ساز نابێت، بەڵکوو بە دەست و پەنجەی کەسێک دێتە لێنان، منداڵەکانت تەندروستیان زۆر باشە؛ چونکە کابانێکی کارامە هەیە ئەزانێ چ جۆرە خواردنێکی تەندروست و لەباریان بۆ دروست بکات، بە ڕای تۆ ئەگەر هاوسەرەکەت بەم کارە هەڵنەستایە ژیان چۆن دەبوو لە ماڵەکەتدا!

لەپڕ کۆمەڵێک میوان خۆیان ئەکەن بە ژووردا، تۆش هیچ هەست بە شپرزەیی ناکەیت، ژووری پێشوازی لە میوان ساز و ئامادەیە، ڕەنگی پەردە لەگەڵ شتومەکەکانی تردا گونجاوە، سینی و پیاڵەکانی سەری یەک تاخمن، شەکر لەناو شەکردانێکی جوان و

قەشەنگدایە، لەو لاوە شیرینی و میوە دانراوە، تەنانەت کلێنیکسیش لە بیر نەکراوە، کێ ئەم هەمووە ئامادەسازییانەی کردووە؟ پێم بڵێ گەر هاوسەرەکەت بەم کارانە هەڵنەستایە تۆ دەتتوانی میوانەکانت ئاوا بە ڕووسوورییی بەڕێ بکەیت؟

منداڵەکانت پاکوخاوێنن؛ چونکە کەسێک هەیە گرنگیان پێ دەدات، تەندروستن؛ چونکە کەسێک هەیە لە خەمیاندایە، لە قوتابخانە نمرەی بەرز بە دەست دێنن؛ چونکە کەسێک هەیە لە ماڵەوە یارمەتیان ئەدات، قسەزان و زمانپاراون، چونکە کەسێک هەیە ڕایهێناون، ئەگەر هاوسەرەکەت نەبوایە ئەمانە هیچیان نەدەبوون!

خۆت لەسەر ئەوە ڕابهێنە کە تەنها لە ڕووی دەستکەوتی ماددییەوە تەماشای کارەکان نەکەیت، بەڵکوو تەماشای ئاسەوارەکانیشی بکەیت، تۆ سەرنج بدە و بزانە کرێکارانی شارەوانی چۆن ڕواڵەتی شارت بۆ جوان دەکەن، پۆلیسی هاتوچۆ چۆن ڕێگری لە ڕووداوی هاتوچۆ دەکات، شۆفێری ئەمبولاس چۆن گیانی نەخۆش ڕزگار دەکات، سەرتاشێک چۆن ڕەنگ و ڕووت بۆ دێنێتەوە، هەموو شتێک لە دنیادا پارە نییە!

**دووەم: ئەو هەوڵ و ماندووبوونەی لەپێناو ئەو کارەدا بە خەرج دەدرێت**

بۆ ئەوەی ژیان لە ماڵەکەتدا بە خێر و خۆشی بگوزەرێت پێویستە دەستەی هەماهەنگی دروست بکرێت، تۆ تەماشای نەخۆشخانە بکە چۆن هەموو کارەکان بەسەر چەند گرووپێکی جیاوازدا دابەش کراون، گرووپێک کاریان شۆردنی پەتۆی نەخۆشخانەیە، گرووپێکی تر کاریان چێشتلێنانە، گرووپێک مەنجەڵ و قاپەکان دەشۆرن، گرووپێک سڕین و خاوێنکردنەوەی ناو نەخۆشخانەکەیان لە

ئەستۆدایە، گرووپێک ئێشک دەگرن و شەوانە نەخۆشەکان بەسەر دەکەنەوە و چەندین گرووپی تریش، هەموو ئەم کارانەی کە لە نەخۆشخانە بە گرووپی چەند کەسی ئەنجام دەدرێن لە ماڵەکەی تۆدا تەنها کەسێک پێی هەڵدەستێت ئەویش هاوسەرەکەتە!

ئەگەر پێتوایە من زیادەڕەویم کردووە لە خستنەڕووی هەوڵ و ماندووبوونی هاوسەرەکەتدا، ئەوا تەنها بۆ یەک ڕۆژ کارەکانی ئەو لە ئەستۆ بگرە، بەڵێ یەک ڕۆژ جا بزانە چۆن لە نیوەی شەودا هەموو ئێسکەکانی لاشەت دێنە زریکە و ناڵە!

یەکێک لەو نوکتانەی دەیگێڕنەوە ئەوەیە: کاتی خۆی پیاوێک هەبووە پێی وا بووە کە لە ماڵەکەی خۆیدا تەنها ئەم کار دەکات، بۆیە هەموو جارێک بە هاوسەرەکەی دەڵێت خۆزگە من و تۆ ڕۆڵمان بگۆڕیایەتەوە بۆ ئەوەی منیش وەک تۆ بۆ ماوەیەک پشوویەکم بدایە!

شەوێک لە سەرە ڕێگەیەکدا چرایەکی جادوویی (فانوس سحري) دەدۆزێتەوە، هەر کە دەستی پیا دێنێت دێوێکی گەورەی لێ دێتە دەرەوە و پێی دەڵێت: من خزمەتکاری ئەو کەسەم کە ئەم چرایەی پێیە، بفەرموو ئاواتێک بخوازە با بۆت بهێنمە دی، یەکسەر کابرا دەڵێت: بەخوا دەمێکە ئاواتەخوازم لەگەڵ هاوسەرەکەمدا ڕۆڵمان بگۆڕینەوە، ئەو بخەرە شوێنی من و منیش بخەرە شوێنی ئەو، دێوەکەش دەڵێت: زۆر ئاسانە ئەوا لە ئێستاوە تۆ ئەویت و ئەویش تۆیە!

کابرا لە کاتژمێر شەشی بەیانی لە خەو هەستا، منداڵەکانی بۆ قوتابخانە خەبەر کردەوە، جلوبەرگی بۆ ئامادە کردن، چوو بۆ چێشتخانەکە بۆ ئەوەی قاوەڵتی بەیانیان بۆ ساز بکات، سەعات حەوت هاوسەرەکەی بە خەبەر هێنا، کاتێکی زانی بیری چووە

قاوەکە ئامادە بکات، بەپەلە قاوەکەی ئامادە کرد، لەو کاتەدا هاوسەرەکەی سەرگەرمی خۆئامادە کردن بوو بۆ سەر کار، بە پەلە قاوەکەی خواردەوە و بەرەو شوێنی کار بەڕێ کەوت بەبێ ئەوەی سوپاسێکیشی لێ بکات!

پاشان منداڵەکانی گەیاندە قوتابخانە، هاتەوە بۆ ماڵەوە نەیدەزانی لە کوێوە دەست پێ بکات، ئەبێ قاپەکان بشۆرێت، جلە پیسەکان کۆبکاتەوە و بیانخاتە جلشۆرەکەوە و پاشانیش ئوتویان بکاتەوە، جارێکی تر ناوماڵ ڕێک بخاتەوە و هەر شتێک بگەڕێنێتەوە بۆ شوێنی خۆی، تا ئەم کارانەی تەواو کرد، کاتی دروستکردنی نانی نیوەڕۆش هاتە پێشەوە، خۆی کرد بە ژووری چێشتخانەکەدا نزیکەی دوو کاتژمێر نەهاتە دەرەوە، هەرچۆنێک بوو نان و خوانی نیوەڕۆی ئامادە کرد، منداڵەکان کاتی گەڕانەوەیان لە قوتابخانە نزیک بوویەوە، بە پەلە چوو بە دەمیانەوە و هێنانیەوە بۆ ماڵەوە، هێشتا هەر هەناسەبڕکێی بوو، هاوسەرەکەشی بە شەکەتی لەسەر کار گەڕایەوە، جلوبەرگەکانی لەو ناوەدا فڕێ دا، ئەمیش لە ترسی ئەوەی نەوەک جامی تووڕەیی خۆی بە سەریدا بڕژێنێت بە بێدەنگی جلەکانی کۆکردەوە و هەڵیواسین بە قەدی چەلاکەدا، پاشان سفرەی ڕاخست و نان و خوانی لەسەر دانا، هەموویان پێکەوە نانیان خوارد و پاشان هەریەکە و چووە سووچێکەوە بۆ ئەوەی سەرخەوێک بشکێنێت و پشوویەک بدات، تەنها ئەم نەبێت کە دەبێ سفرەکە کۆبکاتەوە و جارێکی تر مەنجەڵ و قاپەکان بشواتەوە و بیانخاتەوە شوێنی خۆی، پاشان هاوسەرەکەی لە خەو هەستا و ڕۆژنامەیەکی گرت بە دەستەوە خەریکی ڕۆژنامەخوێندنەوە بوو، بەڵام ئەم لەگەڵ منداڵەکانیدا بە وانەکانی قوتابخانەدا دەچوونەوە، دەمەوئێوارە هاوسەرەکەی جلەکانی لەبەر کرد و بەرەو قاوەخانە

بەڕێ کەوت بۆ ئەوەی لەگەڵ هاوڕێکانیدا کاتێکی خۆش بەسەر بەرێت، بەڵام ئەم دەبوو جارێکی تر خۆی ئامادە بکاتەوە بۆ سازکردنی خوانی ئێوارە و پاشان قاپشۆردن و گسکلێدان و هتد... تەماشا ئەکات هێندە ماندوو بووە خۆی لەسەر قاچەکانی ناگرێت، خۆ ئەگەر چاوەڕوانی بکات تا هاوسەرەکەی دەگەڕێتەوە، ڕەنگە لەتاو ئازاری قاچەکانی شەو خەوی لێنەکەوێت، بۆیە بەپەلە خۆی گەیاندەوە بە شوێنی فانۆسە جادووییەکە و دەستێکی تری پێدا هێنایەوە و دێوە گەورەکە هاتە دەرەوە و پێی وت: فەرمانت بە چییە تا بۆت جێبەجێ بکەم؟ ئەویش وتی: هەر یەکەمان بگەڕێنەرەوە بۆ شوێنی خۆی، یەک ڕۆژ بەسە!

**سێیەم: ئەگەر ئەو کەسە بەو کارە هەڵنەستێت چ بۆشاییەك دروست دەبێت؟**

ئەگەر دەتەوێت بزانیت بەبێ کابانی ماڵ چ بۆشاییەک دروست دەبێت؟ بیهێنەرە پێش چاوی خۆت کە تۆ منداڵیت و دایکت نییە!

لەسەر ئەم خاڵەیان یەک وشەی تر سەربار ناکەم؛ چونکە دڵنیام ئەوەی من دەمەوێت بینووسم تۆ لە یادەوەرییەکانی خۆتدا دەیخوێنیتەوە!



## ئەویش بە چاوەکانی عاشق دەبێت!

پەندێکی چینی هەیە دەڵێت: پیاو بە چاوەکانی عاشق دەبێت و ژنیش بە گوێچکەکانی!

جارێک قسەیەکی زۆر جوانم لەسەر ئەم پەندە خوێندەوە کە دەڵێت: هەر لەبەر ئەمەیە پیاوان درۆ دەکەن و ژنانیش ئارایش!

ئەم پەندە چینییە تا رادەیەک راستی تێدایە، پیاو شەیدای ئافرەتی جوانە و هەستەکانی پێی تێر دەبێت، لای پیاو چاو دەروازەی دڵە و جوانی ئافرەتیش پریشکە ئاگرێکە دڵ و دەروونی گڕ تێبەردەدات، لای پیاوان خۆشەویستی لە چاوەوە دەست پێ دەکات، هەرچەندە جوانیش شتێکی رێژەییە و ئەوەی لای من لە جوانیدا لە ترۆپکدایە، رەنگە لای تۆ وا نەبێت، بە پێچەوانەشەوە، ئەگەر حەز و ئارەزووەکان لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاواز نەبوایە، ئەوا وەک ئیبن خەلدون دەڵێت: زۆربەی کاڵاکان لە بێبازاڕیدا تەپوتۆزیان لەسەر کەڵەکە دەبوو، ئەوەشمان بیر نەچێت هەندێک خۆشەویستی دوای تێکەڵی و هەڵسوکەوت دروست دەبێت، جاری وا هەیە پیاوێک یەکەم جارە ئافرەتێک دەبینێت هیچ هەست و سۆزێکی خۆشەویستی بۆی نییە و جوانییەکەیشی سەرنجی راناکێشێت، بەڵام پاش ماوەیەک لە تێکەڵی و قسە و گفتوگۆ خۆشەویستی لە دڵیدا چەکەرە دەکات و رۆژ لە دوای رۆژ گەشە دەکات، کاتێک دەزانێت

خۆشەویستی ئەو ئافرەتە هەموو دڵی داگیر کردووە و هیچ کەسی هێندەی ئەو بە لاوە شۆخوشەنگ نییە!

مەرج نییە خۆشەویستی هەورەبرووسکەئاسا بە خێرایی دەرگای دڵ ببڕێت و خۆی بکات بە ژووردا، هەندێک خۆشەویستی هەینە بەبێ ئەوەی ئاگات لێی بێت لەناو دڵتدا بە شێنەیی گەشە دەکات کاتێک دەزانیت تیایدا نقوم بوویت، ئیتر ئاوایە هەرکەسە و بە جۆرێک عاشق دەبێت!

لە بەرامبەریشدا ئافرەت پێی خۆشە لە زاری بەرامبەرەکەیەوە دڵڕفێنی و جوانی و شۆخوشەنگی خۆی ببیستێتەوە، پیاهەڵدان خۆراکی ڕۆحی ئەوە و پێی شاگەشکە دەبێت، پیاو هەرچەندە کەسێکی سەرکەوتوو و سەرمایەدار بێت لە ژیاندا، هێشتا ئەمانە تینوێتی ئافرەت بۆ پیاهەڵدان ناشکێنن، هەندێک پێداویستی هەیە بە شتی تر پڕ نابێتەوە، بۆ نموونە ئاگر بە ئاو دەکوژێتەوە نەک بە پارە، کەسێکی برسی بە کولێرەیەک برسێتی دەشکێت نەک بە پارچە هۆنراوەیەک، پیاوان هەڵە بیر دەکەنەوە ئەگەر پێیان وابێت مادام سەرکەوتوون لە بوارەکانی ژیاندا ئیتر ئەوە بەسە بۆ ئەوەی هاوسەرەکانیان خۆشیان بوێن، بە ڕای من خۆشەویستی شاخێکی ڕەگداکوتاو و ڕاوەستاو نییە بە هیچ شتێک نەلەخشێت، بەڵکوو خۆشەویستی نەمامێکە بۆ ئەوەی گەشە بکات و بدرەوشێتەوە پێویستە هەمیشە ئاو بدرێت، پیاهەڵدان بە جوانی و لەشولاری ئافرەتدا هەنگاوێکی گرنگە بۆ ڕاگرتنی دڵی، دەبێ هەمیشە ئەوەتان لە بیر بێت تەنها گرتنی باڵندە بەس نییە بۆ ئەوەی هەمیشە هی تۆ بێت، بەڵکوو دەبێت بیخەیە ناو قەفەسێکەوە بۆ ئەوەی هەڵنەیەت، قەفەسی ئافرەتیش ئەوەیە ئەو هەستەی لە لا دروست بکەیت کە جوان و دڵگیرە.

ئێمە کاتێک دەڵێین پیاو بە چاوەکانی عاشق دەبێت و ئافرەتیش بە گوێچکەکانی ئەمە لە هەموو کات و ساتێکدا وانییە، واتە مەرج نییە پیاو هەر ئافرەتێکی شۆخوشەنگی بینی، یەکسەر دەرگای دڵی بۆ بکاتەوە و عاشقی ببێت؛ چونکە هەندێک تایبەتمەندی تر هەیە جگە لە جوانی پیاوان لە ئافرەتانیان دەوێت ئەگەرچی جوانی گرنگترینیانە، هەروەها مەرج نییە ئافرەت هەر پیاوێک بە جوانی و ڕێکی بەژن و بالایدا هەڵیدا ئیتر شێت و شەیدای ببێت؛ چونکە کۆمەڵێک تایبەتمەندی تر هەیە جگە لە پیاهەڵدان ئافرەتان لە پیاوانیان دەوێت ئەگەرچی پیاهەڵدان و ستایشی جوانیان گرنگترینیانە!

زۆر بە سادەیی: خۆشەویستی هاوکێشەی بیرکاری نییە ١+١= ٢ لە دەرەنجامێک زیاتر نەدات بە دەستەوە، بەڵام هەمووشمان هاوڕاین لەسەر ئەوەی کە پیاو هۆگری ئافرەتی جوانە و ئافرەتیش خولیای پیاوێکە کە بە جوانیەکانیدا هەڵبدات!

کە دەڵێین پیاو بە چاوەکانی عاشق دەبێت، مانای ئەوە نییە تەنها جوانی ئافرەت بەسە بۆ پێکەوەژیان و خۆشەویستیی بەردەوام، جوانی هەرچەندە دڵڕفێنیش بێت لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا ئاسایی دەبێتەوە، ئێمەی مرۆڤ سروشتمان وایە کاتێک شتەکان بە دەست دێنین ئارەزوومان بۆیان کەم دەبێتەوە، بەڵام جوانی ئافرەت ئەگەر ڕۆشنبیری و ڕێز و تێگەیشتن لە عەقڵیەتی پیاوی لەگەڵدا بێت، هەرگیز ئاسایی نابێتەوە!

کاتێکیش دەڵێین ئافرەت بە گوێچکەکانی عاشق دەبێت، مانای ئەوە نییە ئەگەر پیاو توانی بە باشی بە سەریدا هەڵبڵێ ئیتر ئەوە بەسە بۆ ئەوەی لە دڵیدا بمێنێتەوە و پێکەوە درێژە بە ژیان بدەن،

خۆ ژیان مەیدانی شیعر و پەخشانخوێندنەوە نییە، بەڵکوو کۆمەڵێک تایبەتمەندیی تر هەن ڕاستگۆیی پیاو دەردەخەن لە پیاهەڵدانەکانیدا، ڕێزگرتنی ئافرەت، هەستکردنی بە مرۆڤبوونی خۆی، پشتگیریکردنی، یارمەتیدانی لە وێستگە جیا جیاکانی ژیاندا پیاهەڵدانەکانی پیاو بە ڕاست دەخەنەوە!

کەواتە پیاو تەنها دوو چاوی زەق نییە و هەموو ئەندامەکانی تری جەستەی بە ئاوازی ئەو بێنە هەڵەکەسەما، هەروەها ئافرەتیش تەنها دوو گوێچکە نییە و ئەندامەکانی تری جەستەی دەستەمۆ و ئەڵقەلەمستی ئەو بن، ئێمە کە باسی چاو و گوێچکە دەکەین، مەبەستمان ئەوە نییە ئەم دوانە کلیلی جادوویین و هەموو دڵێکی داخراو دەکەنەوە، بەڵکوو مەبەستمان ئەوەیە ئەم دووانە کاریگەرترینن!

ئافرەتیش بە هەمان شێوەی پیاو بە چاوەکانی عاشق دەبێت و حەزی لە پیاوی جوانخاس و پێکەوتووە، ئەویش خاوەن حەز و ئارەزووە و پێویستە ڕێزی لێ بگیرێت!

با ئێستا چیرۆکێکت بۆ بگێڕمەوە، بەڵام دوای خوێندنەوەی هەوڵ بدە هەموو ڕووداوەکانی ناو چیرۆکەکە لە بیر خۆت ببەیتەوە تەنها ئەوە لە یادەوەری خۆتدا بهێڵەرەوە کە ئافرەت تەنها بە گوێچکەکانی عاشق نابێت، بەڵکوو بە چاوەکانیشی عاشق دەبێت، هەموو ئامانجی من لە گێڕانەوەی ئەم چیرۆکە ئەمەیە و هیچی تر، ڕووداوەکانی تری ناو چیرۆکەکە جێی سەرنج و بایەخی من نین، خۆ ئەگەر بۆ دەوڵەمەندکردنی زانیارییەکانی خۆت سەرلەبەری چیرۆکەکە وەربگریت و بۆ بەسەربردنی کاتێکی خۆش لە کۆڕ و دانیشتنەکاندا بیگێڕیتەوە ئەمەشیان خراپ نییە!

دەگێڕنەوە لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا فەیلەسوفێکی زۆر بەناوبانگ هەبووە کە تەمەنی شەست ساڵی تێپەڕاندبوو،

هاوکات هاوسەرێکی زۆر شۆخوشەنگی هەبوو کە تەمەنی تەنها حەڤدە ساڵ بوو، جوانییەکەی بێوێنە بوو، ئەمیش زۆری خۆش دەویست و ژیانێکی پڕ خۆشی و کامەرانیان بەسەر دەبرد، ئەوەی پێی بڵێی گرفت نەیانبوو، تەنها ئەوە نەبێت فەیلەسوفەکە هەموو جارێک خەمی ئەوە دایدەگرت کە ئەگەر بمرێت هاوسەرەکەی دوای خۆی مێرد بە کەسێکی تر دەکاتەوە!

بەڵام فەیلەسووفەکە ئەم خەمەی لە دڵی خۆیدا حەشار نەدەدا، بەڵکوو زۆر جار ئەیدا بە گوێی هاوسەرەکەشیدا، ئەویش لە وەڵامیدا ئەیوت خوا نەکات هەرگیز ئەو ڕۆژە بە چاو ببینم، یاخوا مەرگی من بکەوێتە پێش مەرگی تۆوە، من دنیام بۆ چییە لە دوای تۆ؟

ئەم قسانەی هاوسەرەکەی شتێک لە خەمەکەی دەڕەواندەوە، بەڵام زۆر درێژەی نەدەکێشا و وەک جارانی لێ دەهاتەوە، دیسانەوە بە هاوسەرەکەی دەوتەوە نازانیت چەند برینێکی قووڵ لە دڵ و دەروونمدا دروست دەبێت کاتێک بیر لەوە دەکەمەوە دوای من تۆ بۆ یەکێکی تر دەبیت، دووبارە ئەمیش سوێندی بۆ دەخواردەوە کە لە دوای تۆ تەرکی دنیا دەکەم و بۆ هیچ پیاوێکی تر نابم!

شەوێک فەیلەسووفەکە ملی ڕێگای بەرەوماڵەوە گرتبوو، لە نزیک ڕێگاکەوە گۆڕستانێک هەبوو، تەماشا ئەکات ئافرەتێکی گەنج بە دیار گۆڕێکی تازەوە کە هێشتا هەر گڵەکەیە و بە بەردی مەڕمەڕ هەڵنەواسراوە وەک نەریتی ڕۆمانەکان دانیشتووە و باوەشێنێکی بە دەستەوەیە و باوەشێنی گۆڕەکە دەکات!

فەیلەسووفەکانیش خەڵکانێکی خۆتێهەڵقورتێنن بۆیە بڕیار دەدات بچێتە بنج و بنەوانی بابەتەکە و نهێنیی بوونی ئەم ئافرەتە لەم شەوە تاریک و ئەنگوستەچاودا بە تەنها و لە پەنای ئەم گۆڕەوە

ئاشکرا بکات، باشە مردووی ناو ئەم گۆڕە بەم نیوە شەوە ئەبێ چ پێویستییەکی بەم ئافرەتە بێت کە لەسەر سەری ڕاوەستاوە و باوەشێنی دەکات!

لە ئافرەتەکە نزیک دەبێتەوە و سڵاوێکی لێ دەکات و ئەویش بە ساردوسڕییەوە وەڵامی سڵاوەکەی دەداتەوە و خۆی وا پیشان دا کە سەرقاڵی کاری خۆیەتی و دەرفەتی قسەکردنی لەگەڵ ئەم و ئەودا نییە، بەڵام ئەم ساردوسڕییە وای لە فەیلەسووفەکە نەکرد واز لە زانینی چیرۆکی ئەم ئافرەتە بهێنێ!

پێیوت: خانم! ئەرێ بەم نیوەشەوە چی دەکەیت لەم گۆڕستانە؟

ئەویش وتی: بەڕێزەکەم تکات لێ ئەکەم وازم لێبێنە، نابینی من سەرگەرمی کاری خۆمم و کاتی قسەکردنم نییە؟

- ببوورە، نەمویست لە کاری خۆتت بکەم، بەڵام ئەم دیمەنەی تۆ کۆمەڵێک پرسیاری لە مێشکمداورووژاند، من فەیلەسوفی شار و ڕاوێژکاری ئیمپراتۆرم، بێنە باوەشێنەکە با من لەجیاتی تۆ باوەشێنی گۆڕەکە بکەم و تۆش چیرۆکی خۆتم بۆ بگێڕەرەوە، بەمە هەم کرمی دڵی من ئەمرێت و هەم کارەکەی تۆش ڕاناوەستێت!

- زۆر باشە باوەشێنەکە بگرە و دەست بکە بە باوەشێنکردنی گۆڕەکە

- بەسەر چاو

فەیلەسوفەکە باوەشێنەکەی وەرگرت و هاوشێوەی ئافرەتەکە دەستی کرد بە فێنککردنەوەی گۆڕەکە و وتی: بفەرموو چیرۆکی خۆتم بۆ بگێڕەرەوە!

ئافرەتەکە وتی ئەم پیاوەی لەناو ئەم گۆڕەدایە مێردی منە، دوێنێ وەفاتی کرد، بەڵێنمان بە یەک دابوو هەرکامێکمان زووتر مردین ئەوی ترمان هاوسەرگیری نەکاتەوە تا گۆڕی ئەوی ترمان

وشک نەبێتەوە، ئەمڕۆ کوڕێکی جوانخاس و دەوڵەمەند هاتووەتە خوازبێنیم، خۆ هەموو ڕۆژێکیش کوڕی ئاوا نایەتە بەر ماڵ، منیش ڕەزامەندیم دەربڕیوە، بەڵام پێم وتووە ئەبێ چەند ڕۆژێک مۆڵەتم بدەیت!

- ئەی ئەم مۆڵەتەت بۆچی بوو؟

- ئاخر بۆ ئەوەی بەڵێنەکەم بەجێ بگەیەنم، وەک پێموتیت بەڵێنم پێدابوو ئەگەر ئەو پێش من مرد، مێردی دووەم نەکەمەوە هەتا گۆڕەکەی وشک نەبێتەوە، منیش نامەوێت ئەم پرۆسەی وشکبوونەوەیە زۆر درێژە بکێشێت، ئەوەتا ئەبینیت بۆ خۆم هەڵدەستم بە کاری وشککردنەوەی گۆڕەکەی!

قسەی ئەم ئافرەتە وەک تەزووی هەورەبرووسکە بە جەستەی فەیلەسووفدا گوزەری کرد و هاوسەرەکەی خۆی بیر هاتەوە، وتی تۆ بڵێی هاوسەرەکەی منش ئاوا بێت، خۆ ئەم ئافرەتەش وەک ئەوەی من مێردەکەی خۆی خۆش دەویست و تەنانەت پەیمانیش لە نێوانیاندا هەبووە، کەچی ئەوەتا خۆی ڕاناگرێت تا گۆڕەکەی وشک ببێتەوە و هەڵەداوانی مێردی دووەمیەتی!

ئافرەتەکە هەستی کرد فەیلەسووفەکە تووشی شۆک بووە، پرسیاری لێ کرد ئەرێ بۆ وا دۆش داماوی؟

وتی: نا نا وا نییە، ئەمە ژیانی تایبەتی تۆیە و ئازادیت چۆن هەڵسوکەوت دەکەیت، من بیرم لە شتێکی تر دەکردەوە!

ئافرەتەکە زۆر سوپاسی فەیلەسووفەکەی کرد لەسەر ئەو میهرەبانی و هاوکارییەی پێشکەشی کرد بۆ وشککردنەوەی گۆڕەکە، پێش ئەوەش فەیلەسوفەکە گۆڕستانەکە بەجێ بهێڵێت، ئافرەتەکە باوەشێنەکەی پێشکەش کرد و دەستی کرد بە ناو جانتاکەیدا باوەشێنێکی تری دەرهێنا و دەستی کردەوە بە باوەشێنکردنی گۆڕەکە!

فەیلەسووفەکە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە و هەزار و یەک پرسیاری بێ وەڵام لە مێشکیدا خولی دەخوارد، کە گەیشتە ماڵەوە هاوسەرەکەی پێشوازییەکی شایستەی لێ کرد و باوەشی پیا کرد و بە گەرمی بە خێری هێنایەوە، بەڵام هەستی کرد فەیلەسووف زۆر ساردوسڕە و پێشتر هەرگیز بەو جۆرە نەیدیبوو، دواتر تەماشا ئەکات باوەشێنێکیشی بە دەستەوەیە، ئیتر دڵی لێی پیس دەکات و دەڵێت: بەخوا ڕەنگە بەم نیوە شەوە لەگەڵ ئافرەتێکی تردا دەستی تێکەڵ کردبێت، لێی دەپرسێت ئەرێ ئەم باوەشێنە قەشەنگەت لە کوێ بوو؟ دیارە ئەمە هی دەستی کچە جوانەکانی ڕۆمایە!

وا دەردەکەوێت چاوەڕوانی فەیلەسووفەکە بۆ پرسیاری هاوسەرەکەی و وەڵامدانەوەی ئەوەندەی بۆ خامۆشکردنی ئەو ئاگرە بوو کە چیرۆکی ئافرەتی سەرگۆڕەکە لە دەروونیدا هەڵیگیرساندبوو، ئەوەندە بۆ ڕەواندنەوە و ڕەتکردنەوەی تۆمەتی هاوسەرەکەی نەبوو!

بە درێژی چیرۆکەکەی بۆ هاوسەرەکەی گێڕایەوە، هەر ئەوەندەی لە باسکردنی چیرۆکەکە بوویەوە ئیتر ژنە بە توندی هێرشی کردە سەر ئافرەتی سەر گۆڕەکە: بێوەفا بووە، ناپاک بووە، بەڵێنشکێن بووە!

فەیلەسووفەکە پێیوت: خۆ من هیچ شتێکم نەوتووە، تەنها ڕووداوەکەم بۆ گێڕایتەوە.

وتی: ئەزانم بەڵام ویستم هەڵوێستی خۆمت دەربارەی ئەو ئافرەتە پێ ڕابگەیەنم، ئەوەش بزانە ئافرەتان هەموویان.

وەک یەک نین، ئازیزەکەم تۆ تەماشای پەنجەکانی دەستت بکە، بزانە هەموویان وەک یەک وان؟ ماڵی ئەو ئافرەتە وێران بێت، چۆن خۆشی ئەم شەوی لێ تێک داین، حەق نییە لەمە زیاتر کاتی خۆمان لەپێناودا بە فیڕۆ بدەین!

پاش چەند ڕۆژێکی کەم لەم ڕووداوە فەیلەسوفەکە نەخۆشییەکی قورسی گرت و کەنەفتی سەر جێگا بوو، هاوسەرە دڵسۆزەکەشی یەکسەر ناردی بە دوای پزیشکدا بۆ ئەوەی چارەسەری بەپەلەی بۆ بکەن، پزیشک هات و هەرچی کرد سەری لەبەر نەخۆشییەکەی فەیلەسووف دەرنەکرد و وتی: وا دەچم بۆ لای ئیمپراتۆر و هەواڵەکەی پێ ڕائەگەیەنم، بەڵکوو پزیشکە تایبەتییەکەی خۆی بۆ بنێرێت، بە خوا ئەو شتێکی بۆ نەکات، بە ئێمە هیچ ناکرێت، بڕواش ناکەم ئیمپراتۆر ئەم داوایە ڕەت بکاتەوە؛ چونکە مێردەکەی تۆ یەکێکە لە ڕاوێژکار و کەسە نزیکەکانی ئمپراتۆر!

پزیشک ماڵی فەیلەسووفی بەجێهێشت و زۆری پێ نەچوو بە خۆی و پزیشکی ئیمپراتۆرەوە گەڕایەوە، هەردوو پزیشک چوونە ژووری فەیلەسووف و دەرگایان ئەڵقەڕێز کرد، لەو کاتەدا هاوسەری فەیلەسووف لە هەیوانەکەدا هەر دەهات و دەچوو، ترسی مردنی فەیلەسووف دایگرتبوو، دوای نزیکەی کاتژمێرێک هەردوو پزیشک لە ژوورەکە هاتنە دەرەوە، پزیشکی ئیمپراتۆر بە هاوژینەکەی فەیلەسووفی وت: خانمەکەم هیچ هیوایەک بۆ چاکبوونەوەی هاوسەرەکەت لە ئارادا نییە، عومری درێژی تەنها ڕۆژێک تا دوو ڕۆژی ترە!

وتی ئەی باشە دەوایەک چارەسەرێکتان پێ شک نایەت؟ لە پارە مەترسن، پارەمان زۆرە.

پزیشکەکەش وتی خانم بابەتەکە هیچ پەیوەندییەکی بە پارەوە نییە، پاشان خەرجی چارەسەرکردنی فەیلەسووف لەسەر ئەرکی جەنابی ئیمپراتۆرە، بەڵام بە داخەوە وەک پێم وتیت بە هیچ شێوەیەک چارەسەری نییە و لە حاڵەتی گیاندانایە!

وتەکانی پزیشک وەک تەزووی هەورەبرووسکە کاری تێکرد و نەیتوانی خۆی لەسەر قاچەکانی ڕابگرێت و دای بە زەویدا، خزمەتکارەکان هەڵیان گرتوو بردیانەوە بۆ ژوورەکەی خۆی و پزیشکەکانیش ماڵەکەیان بەجێهێشت.

لە بەیانی ڕۆژی دواتردا خزمەتکارەکە لە ژووری فەیلەسووف دەرپەڕییە دەرەوە و هاواری کرد خانمەکەم! خانمەکەم! فەیلەسووف وەفاتی کرد! ڕاوێژکاری پادشا وەفاتی کرد.

خەم و خەفەتێکی زۆر دڵ و دەروونی هاوسەرەکەی داگیر کرد، داوای لە خزمەتکارەکانی کرد تەرمی فەیلەسووف هەڵبگرن و بیبەن بۆ ژووری کتێبخانەکەی خۆی و لەسەر ئەو مێزە داینێن کە شتی لەسەر دەنووسی، چونکە ئەوە وەسێتی خۆی بوو، داواشی لێ کردن دەرگای ماڵەکەی بە ڕووی هیچ کەسێکدا نەکەنەوە، ئیتر منیش دەست لە دنیا هەڵدەگرم.

پێش نیوەڕۆ لە دەرگا درا، خزمەتکار چوو بزانێت کێیە، هاتەوە و وتی خانمەکەم یەکێک لە قوتابیانی فەیلەسووف کە ماڵیان لەوپەڕی شارە لە بەردەرگا ڕاوەستاوە و دەڵێت: تازە لە پزیشکی ئیمپراتۆرم بیستووە کە فەیلەسووف نەخۆشە، هاتووم سەرێکی لێ بدەم، جا نازانم چۆنی وەڵام بدەمەوە؟

وتی: بچۆ پێی بڵێ فەیلەسووف وەفاتی کردووە، منیش حەز بە بینینی هیچ کەسێک ناکەم، بەڵام با بچێت هەواڵەکە بە ئیمپراتۆر ڕابگەیەنێت؛ چونکە مافی خۆیەتی لە ئەسپەردەکردنی کەسێکی شکۆداردا ئامادە بێت کە ساڵانێکی دوورودرێژ خزمەتی ئەم وڵاتەی کردووە.

خزمەت کار چوو بۆ ئەوەی قسەکانی خانم بە قوتابییەکەی فەیلەسووف ڕابگەیەنێت، بەڵام لەولاوە بە ترس و بیمێکی زۆرەوە

گەڕایەوە، وتی خانمەکەم هەر ئەوەندەی کۆچی دوایی فەیلەسووفم پێ ڕاگەیاند یەکسەر لە هۆش خۆی چوو دای بە زەویدا، ئەوەتا ئێستا لە بەردەرگا کەوتووە و چوار پەلی ڕاخستووە!

وتی ئادەی بە پەلە چێشتلێنەرەکە و چەند خزمەت کارێکی تر لەگەڵ خۆتدا ببە و ئاو بکەن بە سەر و چاویدا با هۆش بکاتەوە و بچێت بە دەم ئیش و کاری خۆیەوە، بە خوا من حەوسەڵەی بینیی کەسم نییە!

خزمەتکار ڕۆشت بۆ ئەوەی فەرمانەکە جێبەجێ بکات، بەڵام زۆری پێنەچوو گەڕایەوە، وتی: خانمەکەم بە خوا بە بێهودە خۆمان ماندوو دەکەین، هەرچی لەگەڵدا هەوڵ دەدەین بە هۆشی خۆی نایەتەوە، لاشەیەکی بێگیانە و تەنها هەناسە دەدات، ئەترسین ئەم کابرایە بمرێت و پاسەوانانی مەملەکەتیش کە بە کوچە و کۆڵانەکاندا دەسووڕێنەوە بیبینن و ئێمە تۆمەتبار بکەن بە کوشتنی، وتی زۆر باشە بیهێنن بۆ ژووری میوان و خۆم تۆزێکی تر دێم بزانم چیەتی؟

زۆری نەخایاند خانم خۆی کرد بە ژووردا و هەموو خزمەتکارەکان چوونە دەرەوە، کە قوتابییەکەی فەیلەسووفی دی تەواو مەست و حەیرانی جوانیەکەی بوو، هێندە لە لای جوان و سەرنجڕاکێش بوو وای دەزانی ڕۆشنایی ژوورەکە لە ڕووخساری ئەوەوە سەرچاوە دەگرێت، نەک لە پەنجەرەکانەوە، لە بەرامبەریەوە بە سەرسامی ڕاوەستا و نەیئەزانی چی بڵێت، چی بکات، هیچ ئاسۆیەکی ڕوونی شک نەدەبرد، جوانی قوتابییەکەی فەیلەسووف هەموو شتێکی لە بیر بردبوویەوە، تەنانەت مردنی فەیلەسووفیش!

پاش چەند خولەکێک قوتابییەکەی فەیلەسووف چاوەکانی هەڵهێنانەوە و چاوێکی خێرای بە ژوورەکەدا گێڕا، کە خانم چاوی بە چاوەکانی کەوت هەر ئەوە نەبوو دڵی بەربێتەوە، چاوەکانیشی

وەکو ڕووخساری دڵ و عەقڵیان دەبرد، لە پەنایەوە دانیشت و دەستی خستە ناو دەستیەوە و وتی: گوێ بگرە من و تۆ هەردووکمان برینداریـن، تۆ مامۆستاکەت لە دەست داوە، منیش هاوسەرەکەم، هەردووکمان ماتەمگێڕی لەدەستدانی یەک کەسین، بۆ ئەوەی ئەم کەسە لە گۆڕەکەیدا ئاسوودە بێت، پێویستە خەمی یەکتر هەڵگرین و هاوسەرگیری بکەین!

قوتابییەکەی فەیلەسووفیش وتی بە خوا ئەوە ئاواتی منیشە، لانی کەم ئەوە ئەبێتە وەفایەک بۆ مامۆستاکەم کە چەند ساڵێک ئەرکی فێرکردن و پەروەردەکردن و چاودێریکردنی منی لە ئەستۆ گرتبوو، بەڵام بە داخەوە ناتوانم ئەم هەنگاوە هەڵگرم!

– بۆ ناتوانی؟

– من نەخۆشم وەک دەبینیت، ئەگەر دڵتەنگ دەبم لە هۆش خۆم دەچم و وەکو مردووم لێ دێت، ئەگەر زۆر دڵخۆشیش دەبم هەروەها، بۆیە ناتوانم بڕیاری هاوسەرگیری بدەم!

– ئەوە گرفت نییە، من بە هەموو شتێکی تۆ ڕازیم.

– بەڵام من ناتوانم ستەمت لێ بکەم و بەم حاڵەوە هاوسەرگیریت لەگەڵدا بکەم، تۆ شایانی باشتر لە منیت.

– لە تۆ باشتر هەر نییە، من تۆم دەوێت، چارەسەرت ئەکەم ئەگەر هەموو سامانەکەشم لەو پێناوەدا دانابێت، ئێمە دەوڵەمەندین، ڕەنگە خۆشت باش ئەوە بزانیت!

– ئەزانم، بەڵام چارەسەری من ئەستەمە.

– هیچ شتێک ئەستەم نییە، پێم بڵێ بزانم چارەسەرەکەت چییە؟

– چارەسەری من ئەوەیە مێشکی پیاوێک بخۆم کە لە ڕۆژێک زیاتر تێپەڕ نەبووبێ بەسەر مردنەکەیدا!

– ئای خوایە! چارەسەرێکی تر نییە؟

- خانمەکەم تۆ وا دەزانیت چارەسەر بە گوێرەی حەزی نەخۆشە، چارەسەری من ئەمەیە و هیچی تر!

ماوەیەک بە بێدەنگی دانیشت و سەری خۆی شۆڕ کردەوە بەسەر هەردوو ناو لەپیدا و پاشان لە شوێنەکەی خۆی راپەڕی و پێی وت: وەرە لەگەڵمدا چارەسەری تۆ لای من دەست دەکەوێت!

چوو بۆ ژێرزەمینەکە و تەورداسێکی هێنا و ڕووەو ژووری کتێبخانەکە ملی نا، کە لەوێدا تەرمی فەیلەسووف بە داپۆشراوی لەسەر مێزی نووسینەکانی دانراوە، هەر وەک چۆن خۆی وەسێتی کردبوو، چەند هەنگاوێکی خاوی بەرەو لای تەرمەکە نا و تەورداسەکەی بەرز کردەوە، پێش ئەوەی بیوەشێنێ فەیلەسووف چاوەکانی کردەوە و بە ژنەکەی وت: توخوا باوەشێنەکەی دەستی ئەو باشبوو یان تەورداسەکەی دەستی تۆ؟

هەموویان (قوتابییەکەی فەیلەسووف، خزمەتکارەکان، چێشتلێنەرەکە) دایان لە قاقای پێکەنین، ڕێکخستنی ئەم هەمووە شتانە لە لایەن فەیلەسووفەوە تەنها بۆ تاقیکردنەوەی هاوسەرەکەی بوو کە تیایدا شکستی هێنا و لە مەراقدا ڕۆحی سپارد، کۆتا چرکەساتەکانی ژیانی ئەو ژنە تەورداسێک بوو بە دەستیەوە کە دەیویست مێشکی ئەو پیاوەی پێ دەربێنێ کە بەڵێنی پێ دابوو دوای ئەو مێرد بە هیچ کەسێکی تر نەکاتەوە و دەست لە دنیا هەڵبگرێت!

پێشتر لەسەر ئەو خاڵە ڕێک کەوتین کە لەم چیرۆکەدا تەنها یەک وانە وەربگرین ئەویش ئەوەیە ئافرەت تەنها بە گوێچکەکانی عاشق نابێت، بەڵکوو هاوشێوەی پیاو بە چاوەکانیشی عاشق دەبێت!

هەر وەک چۆن پیاو ناکەوێتە داوی خۆشەویستیی هەموو ئافرەتێکی جوانەوە؛ چونکە ئەو خۆشەویستییەی کە ئەیبەستێتەوە بە هاوسەرەکەی خۆیەوە، ئەگەرچی جوانییەکەشی زۆر لە ئاستی پێویستدا نەبێت ڕێگرە لەوەی پەنا بۆ ناپاکی و بەستی پەیوەندی لە دەرەوەی ژیانی هاوسەرگیرییەوە ببات، ئافرەتیش بە هەمان شێوە ئەگەر پیاوەکەی خۆی خۆش بوێت هیچ پیاوێکی تر ناتوانێت دڵی ببات، مادەم پشکی خۆی لە ڕێز و سۆز و سێکس لە پیاوەکەی خۆیەوە وەربگرێت!

جا مادەم ئەم بابەتە خرایە بەر باس و گفتوگۆ جێی خۆیەتی ئەو ڕاستییەش بخەینە پێش چاو کە: ئافرەت لە پیاو بەوەفاترە سەبارەت بە پەیوەستبوون بە تەنها یەک هاوبەشی ژیانەوە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سروشتەی کە خوای گەورە تیایدا چاندوویەتی، کاتێک خوداوەندی مەزن ڕێگەی فرەژنی بە پیاوان داوە ئەمە واتای ئەوەیە کە ئەوان لە ڕووی جەستەیی و سایکۆلۆژییەوە لەبارن بۆ ئەوەی مامەڵە لەگەڵ زیاتر لە ئافرەتێکدا بکەن، بەڵام سروشتی ئافرەت بە پێچەوانەوەیە و ڕێگە بە پیاوێک زیاتر نادات، خۆ ئەگەر ئافرەتێکت دی لەم سروشتەی خۆی لایدابوو ئەوە بزانە لە پەنایەوە پیاوێک هەیە سروشتەکەی شێواندووە!

ڕەنگە بڵێیت: کە تۆ دەڵێت جەستە و سایکۆلۆژیتی پیاو لەبارە بۆ ئەوەی مامەڵە لەگەڵ زیاتر لە ئافرەتێکدا بکات، کەواتە ئەگەر پیاو بە یەک ئافرەت داکەوت و نەیکرد بە دوان و سیان ئەمە واتای ئەوەیە پێچەوانەی سروشتی خۆی ڕەفتاری کردووە و ئەو سروشتەی خوداوەند تێیدا ئەفراندوویەتی لە کاری دەخات!

لە وەڵامدا دەڵێم: نەخێر، کاتێک پیاو لە ڕووی سروشتییەوە ئامادەگی کارێکی تێدا بێت، مانای ئەوە نییە دەبێ ئەو کارە هەر

بکات، ئامادەگی شتێکە و ئەنجامدانیش شتێکی ترە، هەر وەک چۆن لەناو ئافرەتاندا هەیە پیاوێک هەموو ژیانی داگیر دەکات و جگە لەو بە هیچ پیاوێکی تری دنیا ڕازی نابێت، بە هەمان شێوە لەناو پیاوانیشدا هەیە حەیرانی ئافرەتێک دەبێت و وادەزانێت هەرچی جوانیی دنیا هەیە لەو ئافرەتەدا کۆ بووەتەوە!

با بگەڕێینەوە سەر باسە سەرەکییەکەی خۆمان: ئافرەتیش وەک پیاو بە چاوەکانی عاشق دەبێت.

ڕاستە تۆ ناتوانیت ڕووکاری دەرەوەی خۆت لەوە جوانتر بکەیت کە هەیە، چونکە جوانیش ڕۆزییەکە خودا خۆی دابەشی کردووە بەسەر بەندەکانیدا، بەڵام کێ دەڵێت پێش سەرجێییکردن خۆشۆردن و خۆبۆنخۆشکردن و خۆڕازاندنەوە تەنها ئەرکی ئافرەتە، ئەمە ئەرکی تۆی پیاویشە، نابێت تەنها تۆ تامەزرۆی هاوسەرەکەت بیت، بەڵکوو دەبێت ئەویش تامەزرۆی تۆ بێت، بۆیە پێویستە تۆش گرنگی بە لایەنی پاکوخاوێنی جەستە و دەم و ددانت بدەیت، ئەویش حەزەکانی هاوشێوەی حەزی تۆیە، ئایا تۆ پێت خۆشە ئەو بە جلوبەرگی چێشتلێنان و بۆن و بەرامەی ناخۆشی هەناسەیەوە بێتە ناو جێگای خەوتنەکەتەوە؟ هەرچەندە خۆجوانکردن و بۆنی خۆش لەخۆدان و تەڕپۆشی تەنها لەناو جێگای نوستن و لە کاتی سەرجێییکردندا پێویست نین، بەڵکوو لە هەموو کات و ساتێکدا پێویستن، پێغەمبەری خوا دروودی خوای لەسەر بێت، کە دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە سیواکی دەکرد و دەیفەرموو: سیواککردن دەم و ددان پاک دەکاتەوە و خوداش ڕازی دەکات. گرنگ نییە بە چی دەم و ددانەکانت خاوێن دەکەیتەوە، بە سیواک بێت، فلچە و هەویری دەم و ددان بێت، یان عەتری ناو دەم بێت، گرنگ ئامانجە نەک ئامراز!

چەندە ئەرکی ئافرەتە لە ڕێی خۆئارایشکردن و جوانپۆشی و خۆبۆنخۆشکردنەوە سەرنجی پیاوەکەی بە لای خۆیدا ڕابکێشێت بۆ ئەوەی ئافرەتە جوان و شیکپۆشەکانی ناو بازاڕ و شوێنە گشتییەکان دڵی نەبەن، ئەوەندەش ئەرکی پیاوە گرنگی بەم بابەتانە بدات، پاراستنی پەیوەندی گەرموگوڕی نێوان ژن و پیاو ئەرکی هەردوو لایانە، نەک بە تەنها لایەکیان.

ئیبن عەباس دەفەرموێت: من خۆم بۆ هاوسەرەکەم ئەڕازێنمەوە وەک چۆن حەز ئەکەم ئەویش خۆی بۆ من بڕازێنێتەوە!

پیاوان هەڵە بیر دەکەنەوە ئەگەر پێیان وابێ ئافرەتان بوونەوەرێکی پێشوازیکەرن و تەنها چێژ ئەبەخشن و وەرناگرن، بەڵکوو ئەوانیش کەسانی دەستپێشخەرن، حەزیان هەیە وەک چۆن حەزیان لێ دەکرێت، ئارەزووی ڕەگەزی بەرامبەر دەکەن وەک چۆن ئارەزوویان لێ دەکرێت، تۆ چۆن ئامادە نیت سەرجێیی لەگەڵ هاوسەرەکەتدا بکەیت کاتێک بە جلوبەرگی چێشتلێنان و بۆن و بەرامەی ناو چێشتخانەکەوە دێتە ناو جێگای نووستنەکەتەوە، ئەویش هەر بە هەمان شێوەی تۆیە! هەر شتێک تۆ بێزار بکات، ئەویش بێزار دەکات!

ئافرەت هەر ئافرەتە لە هەر سەردەمێکدا بێت، گوێ بۆ ئەم چیرۆکە بگرە با زیاتر بابەتەکەت بۆ ڕوون ببێتەوە:

جارێک ئافرەتێک بە خۆی و مێردە چڵکن و کوڵکن و ڕەنگ هەڵبزڕکاوەکەیەوە دێت بۆ خزمەتی ئیمامی عومەری کوڕی خەتتاب، ئافرەتەکە ڕووی کردە ئیمام و وتی: ئەی پێشەوای مسوڵمانان! من لەگەڵ ئەم مێردە گولەمدا نامکرێت و ڕزگارم بکە لە دەستی، ئیمامی عومەریش هەر کە سەیری کابرای کرد یەکسەر تێگەشت ئەم ژنە

چ شتێکی پیاوەکەی قەڵس و بێزاری کردووە، بانگی کابرایەکی کرد و وتی: بچۆ سەر و سمێڵ و نینۆکی ئەم کابرایە کورت بکەرەوە و گەرماوێکی باشی پێبکە و پاشانیش جلوبەرگێکی جوانی لەبەر بکە و بۆم بهێنەرەوە، کە هێنایەوە ئیمامی عومەر بە ئافرەتەکەی وت بچۆ دەستی ئەو پیاوە بگرە و بڕۆن، ئەویش لە سەرەتاوە نەیناسییەوە، وتی: جا قوربان چۆن دەبێت بە دیار چاوی پێشەوای مسوڵمانانەوە دەستی کابرایەکی بێگانە بگرم، کە نزیک بوویەوە لێی تەماشا ئەکات خۆ ئەمە مێردەکەی خۆیەتی، بۆیە بە بێدەنگی دەستی گرت و بەرەوماڵەوە گەڕانەوە.

دوای ئەوە ئیمامی عومەر فەرمووی: ئاوا بن لەگەڵ هاوسەرەکانتاند، سوێند بە خوا ئێوە چۆن حەز ئەکەن هاوسەرەکانتان خۆیانتان بۆ برازێننەوە، ئەوانیش ئاوا حەز ئەکەن ئێوە خۆتانیان بۆ برازێننەوە!

نازانم لە کام دیمەنی ناو ئەم چیرۆکە سەرسامیی خۆم دەرببڕم، لە وریایی و زیرەکییەکەی ئیمامی عومەر سەرسام بم؟ عومەرێک کە قاڵبووی سیاسەت و جەنگ و گەیاندنی ئیسلامە بە شوێنە دوورەدەستەکان لە کوێ ئاگای لە ڕاز و نیاز و سروشتی ئافرەتانە؟

عومەر دەزانێت ژیان بریتییە لە کۆمەڵە بوارێکی جیاواز، هەڵەیە ئەگەر گرنگی بە بوارێک بدەیت و بوارەکانی تر فەرامۆش بکەیت، کارکردن بوارێکە و خۆجوانکردنیش بۆ هاوژینەکەت بوارێکی ترە، کێ دەڵێت دەبێ تۆ تەنها یەکێک لەم دووانە هەڵبژێریت؟ کۆکردنەوەی ئەم دووانە کەی هێندە کارێکی قورسە، پاشان ئەگەر ژن و پیاو پێکەوە ئاسوودە و بەختەوەر نەبن، پارە و پوولی زۆر چ سوودێکی هەیە، هەر وەک چۆن پێویستە ئافرەت لە پاڵ کاری کابانیدا گرنگی بە لایەنی خۆجوانکردنیش بدات، بە

هەمـان شـێوەش پێویسـتە پیـاو گرنگی بـە لایەنـی پاکوخاوێنـی خـۆی بـدات و بـە جلوبەرگـی کارەکەیـەوە نەیەتـەوە نـاو جێگـەی نوسـتنی هاوسـەرەکەیەوە!

یـان لـەم پیـاوە سەرسـام ببـم کـە چـۆن توانیویەتـی سـاڵەهای سـاڵ بـەو هەمـووە چڵـک و کوڵکـەوە بمێنێتـەوە؟ لـە کاتێکـدا تەنهـا کاتژمێرێکـی بـەس بـوو بـۆ ئـەوەی بتوانێـن ئـەو هەمـووە چڵکـە لـە خـۆی بکاتـەوە!

یان بەم ئافرەتە سەرسـام بم کە چۆن توانیویەتی بە درێژایی ئـەو مـاوە زۆرە لەگـەڵ ئـەم پیـاوەدا دەرببـات؟ تـا دواجـار پشـووی لەبـەر بـڕا و گولـەی مێـردی هێنـا بـۆ خزمـەت ئیمامـی عومـەر بـۆ ئـەوەی لێـی جیـا بێتـەوە، بیهێنـەرە پێـش چـاوی خـۆت ئەبـێ ئـەم ژنـە چەنـدە ئـازاری بـە دەسـت چەپەڵـی ئـەم پیـاوەوە چەشـتبێ تـا کار گەشـتووەتە ئـەوەی ئیمامـی عومـەری لـێ ئـاگادار بکاتـەوە بـۆ ئـەوەی بێـت بـە هانایـەوە و ڕاسـتەوخۆ خـۆی کێشـەکەی بـۆ چارەسـەر بـکات!

وریابە! بیرت نەچێت ئەمە وانەیەکی زۆر گرنگە بۆ سـەرکەوتن و بەردەوامبوونـی پەیوەنـدی ژیانـی ژنومێردایەتـی!

ئەویـش حـەز و ڕقـی هەیـە ڕێـک وەک تـۆ، ئەمـەش مافێکـی مرۆڤانـەی خۆیەتـی، تـۆ بـۆت نییـە دەسـتی پـێ هەڵگریـت لـەم مافـەی تەنها لەبـەر ئەوەی تۆ دەسـتت لـە کارێکی مرۆڤانـە و ئەرکێکـی سـەر شـانی خـۆت هەڵگرتـووە.

بـەم چیرۆکە جوان و پڕمانایـە کۆتایی بـەم باسـە دێنـم، هەرچەنـدە ئەمـەش هـەر دووپاتـی قسـەکانی پێشـووە و شـتێکی زیاتـری لەخـۆ نەگرتـووە، بـەڵام هەتـا نموونـەکان زۆرتر بن، بابەتەکە هێزێکی زیاتر وەردەگرێـت و گومانـەکان باشـتر دەڕەوێنـەوە:

عوتبی دەڵێت: جارێک ئافرەتێکم بینی جوانییەکەی سەرسامی کردم، پێموت: مێردت هەیە؟

وتی: نەخێر.

وتم: حەز ناکەیت هاوسەرگیری بکەیت؟

وتی: بەڵێ، بەلام عەیبێکم هەیە بڕواناکەم پێم ڕازی بێت.

وتم: چییە؟

وتی: مووی سەرم هەمووی سپی بووە!

منیش پشتم لێ هەڵکرد و ڕەشۆی ئەسپەکەم گرت و تۆزێک دوورکەوتمەوە، بانگی کردم و وتی: سوێند بە خوا ناڕۆیت، منیش وەستام، لەچکەکەی سەری لابرد و قژی پیشان دام، تەماشا ئەکەم وەک شەوە وایە لە ڕەشیدا.

وتی: بە خوا هێشتا تەمەنم نەگەشتووەتە بیست ساڵ، وا ئێستا زانیم کە ئەو شتەی ئێمە ڕقمان لێیەتی ئێوەش وەک ئێمە ڕقتان لێیەتی!

ئەم قسەیەی کرد و ئیتر ملی ڕێگای گرت و ڕۆشت!



## ئەو بە تەنها نییە...
## هەموو ئافرەتانی دنیا ئاوان!

دەگێڕنەوە کابرایەک هەبووە هەر ئافرەتێکی تری لە هاوسەرەکەی خۆی بە باشتر دەزانی و پێی وا بوو دەستنیشانکردنی ئەم ئافرەتە وەک هاوسەری ژیان بژاردەیەکی ڕاست و دروست نەبووە، ئێمەی پیاوان زۆربەمان هەمان هەستمان هەیە و لامان وایە هاوسەرەکانمان خراپترینن، زۆر درێژەی پێ نەدەین ئەم کابرایە سەردانێکی داپیرەی دەکات کە تەمەنێکی زۆری کردبوو، زۆریشی خۆش دەویست و ڕا و بۆچوونەکانیشی بە هەند وەردەگرت؛ چونکە هەم زۆری دیبوو هەم زۆری بیستبوو، خاوەنی ئەزموونێکی گەورە بوو لە ژیاندا!

ئەم هەستەی خۆی بەرامبەر بە هاوسەرەکەی بۆ داپیرەی باس کرد، لە هەمووی سەیرتر ئەوە بوو وای دەزانی ئەو ڕەخنە و تێبینیانە تەنها و تەنها لە هاوسەرەکەی ئەودا بوونی هەیە و ئیتر ئافرەتانی تر بەفری بێپەڵە و فریشتەی بێ هەڵەن، بەڵام داپیرە ژیر و داناکەی ویستی لەجیاتی قسە و ئامۆژگاری درێژدادڕ وانەیەکی پراکتیکی پێ بدات.

– ڕۆڵە حەز ئەکەم ئەم نیوەڕۆیە لای داپیرەت بمێنیتەوە و پێکەوە نانێک بخۆین.

- داپیرە گیان کاتم نییە وا دوو کاتژمێرە پێکەوەین ئیتر ئەوەندە بەسە.

- گرنگ نییە لە کەیەوە لێرەیت، گرنگ ئەوەیە داپیرەت قسەی خۆی کرد و تۆش هیچ ڕێگایەکت لە بەردەمدا نییە جگە لەوەی مل بۆ داواکەی بدەیت!

- لە خزمەتتام داپیرە گیان، با نانی ئەم نیوەڕۆیەم لای تۆ بێت، بەڵام با پەیوەندی بکەم بە چێشتخانەیەکەوە و خواردنمان بۆ بێننەماڵەوە، یان پێت چۆنە خۆمان پێکەوە بچین بۆ چێشتخانە و لەوێ نانەکەمان بخۆین؟

- نە پەیوەندی بکە بە چێشتخانەوە و نە ئەشچین بۆ هیچ شوێنێک، خۆم نان و خوان ئامادە دەکەم!

- ئاخر داپیرە!

- ئاخر و ماخری ناوێ، ڕۆڵە پێم وتیت خۆم نان و خوان دروست دەکەم.

- داپیرە گیان مادام بتوانین داوای خواردن بکەین و بۆشمان بێتە ماڵەوە ئیتر تۆ بۆ ئەرک بکێشیت؟

- بیبڕەوە کوڕم، وا دەچم بە لای چێشت و چەڵاوەوە.

- باشە داپیرە گیان تۆ چۆنت پێخۆشە با وابێت.

- بەڵام بەو مەرجەی هەر خواردنێکم بۆ دروست کردیت، دەبێت بیخۆیت و پرسیاریش نەکەیت.

- داپیرە چاک بەم تەمەنەوە بوویت بە دیکتاتۆر بە سەرمەوە!

- ئاخر ئەم جیلەی ئێوە بە دیکتاتۆر نەبێت چارتان نایەت!

هەردووکیان دەستیان کرد بە پێکەنین و پاشان داپیرە هەستا و چوو بەدەم چێشتلێنانەوە و نەوەکەشی دەستی دایە مۆبایلەکەی و خۆی پێوە خەریک کرد.

کاتژمێرێک تێپەڕی و داپیرە بە تەنها یەک قاپەوە هاتەوە، ئەوە هەموو ئەو خواردنە بوو کە ئامادەی کردبوو، هەرچەند ئەمە زۆر جێی سەرسووڕمان نەبوو، بەڵکوو خواردنی ناو قاپەکە جێی سەرسووڕمان بوو، چەند هێلکەیەکی کوڵاوی تێکردبوو هەر یەکەشیانی بە ڕەنگێکی جیاواز لەوی تر ڕەنگ کردبوو، یەکێکیانی هەر بە سپیتی هێشتبوویەوە، یەکێکی زەرد کردبوو، یەکێکی سوور کردبوو، یەکێکی شین کردبوو، یەکێکی سەوز کردبوو.

ویستی پرسیار لە داپیرەی بکات ئەریَ بۆ ئەم هێلکانەی ڕەنگاوڕەنگ کردووە؟ بەڵام داپیرەی یەکسەر وتی:

- خۆ بیرتە پێموتیت دەیخۆیت و پرسیار ناکەیت!

- داپیرە گیان خۆ هیچم نەوتووە!

- ئەزانم ئەتویست پرسیار بکەیت، ڕۆڵە تۆ لە نەنکتی نابەیتەوە.

- بە خوا ڕاست دەکەیت ویستم پرسیار بکەم، بەڵام نەتهێشت، باشە فەرمانت بەجێیە دەیخۆم و هیچ ناڵێم.

- باشە دەی خەریکبە و نانی خۆت بخۆ!

دەستی کرد بە خواردنی هێلکەکان، هەموویان کوڵاو بوون و تامیشیان ئاسایی بوو، بەڵام ئەم ڕەنگکردنە بۆ؟ ئەمە ئەو پرسیارە بوو کە لە مێشکیدا دەخولایەوە!

کە لە خواردنی هێلکەکان بوویەوە وتی: داپیرە ئێستا ڕێگەم بدە با لێتبپرسم بزانم نهێنیی ئەم خواردنە سەیروسەمەرەیە چی بوو؟

- ڕۆڵە ئەوە خواردن نەبوو بەڵکوو وانەی ژیان بوو.

- وانەی ژیان؟

- بەڵێ وانەی ژیان.

- چۆن وانەیەک داپیرە.

- باش گوێ بگرە کوڕم، ئافرەتان وەک ئەو هێلکە کوڵاوانەی ناو قاپەکە وان، کاتێک تەماشایان دەکەیت وا دەزانیت جیاوازن، بەڵام هەر ئەوەندەی توێکڵەکەت لێکردنەوە بۆت دەردەکەوێت هەموویان وەک یەکن! ئافرەتانی تر لە هاوسەرەکەی خۆت بە باشتر دەزانیت؛ چونکە تۆ تەماشای دەرەوەیان دەکەیت و بە ڕەنگی توێکڵەکەیان فریو دەخۆیت، بەڵام کوڕم بڕوام پێ بکە ئافرەتان لە ناوەوە هەموویان چوونیەکن، ئەم قسەیە بۆ پیاوانیش ڕاستە، ڕاستە هەر کەسێک شتێک جیاوازی لە کەسێکی تر هەیە، بەڵام ئەوانەش کە ئێمە بە جیاوازیان دەبینین لەبەر ئەوەیە هێشتا ئەزموونمان نەکردوون و لەگەڵیاندا نە ژیاوین، باش لە وانەکە تێگەیشتی کوڕم؟

- بەڵێ داپیرە گیان زۆر باش.

- دەی باشە ڕۆڵەکەم ئێستا هەستە و بگەڕێرەوە بۆ ماڵەوە ڕێزی هاوسەرەکەت بگرە و بیرشت نەچێت هەموو هێلکەیەک هەر سپییە!

تۆیش وانەی ئەم داپیرە وەربگرە، ئەمە یەکێکە لە گرنگترین وانەکانی ژیان، کۆمەڵێک خوو هەیە هەموو ئافرەتان تیایدا هاوبەشن، کۆمەڵێک خوی تر هەن پیاوان تیایدا هاوبەشن، ئەمە باش لە بەرچاو بگرە، نەکەی بە هێلکەی ڕەنگاوڕەنگ هەڵبخەڵەتێیت، کە توێکڵەکانت لابرد هەموو هێلکەکان وەک یەک سپین!

١- زۆربڵێیی:

تۆ پێت وایە هاوسەرەکەت زۆر بڵێیە و هەمیشە لەبەر خۆتەوە گلەیی ئەوە دەکەیت و دەڵێیت: باشە ئەم ژنەی من بۆ دەم لێک نانێت و بوار نادات منیش دوو کەلیمە قسە بکەم؟ بەخوا بڕوا ناکەم هیچ ژنێکی تر وەک ئەم ژنەی من ئاوا زۆربڵێ و دەمهەراش بێت!

ئەمە وا نییە ئەزیزەکەم، تۆ تەنها توێکڵی ئافرەتانی ترت دیوە و بێئاگایت لە دیوی ناوەوەی ژیانیان؛ بۆیە بە جیاواز دەیانبینیت، ئەگەر وەک هاوسەرەکەی خۆت بۆ ماوەیەکیش لەگەڵ ئەواندا بژیایتایە ئەوا بۆت ڕوون دەبوویەوە ئەوە خوویەکە نەک تەنها لە هاوسەرەکەی تۆدا، بەڵکوو لە هەموو ئافرەتانی تردا بوونی هەیە.

لێکۆڵینەوە زانستییەکان پێمان دەڵێن کە ئافرەت ڕۆژانە بە تێکڕایی بیست هەزار وشەی لە زار دەردەچێت، لە کاتێکدا پیاو تێکڕای وشەکانی لە سیازدە هەزار تێناپەڕێت!

ئەو قسە زۆر دەکات لەبەر ئەوەی ئافرەتە، نەک لەبەر ئەوەی هاوسەری تۆیە! تۆش لە ئەو کەمتر قسە دەکەیت لە بەر ئەوەی پیاویت، نەک لەبەر ئەوەی مێردی ئەویت!

تەنانەت لە ناو منداڵانیشدا کچ زووتر زمان دەگرێت هەتا کوڕ، ئەمە ئەو ڕاستییەیە کە ئێمە لە ماڵەکانی خۆماندا بە چاوی خۆمان دەیبینین و لەگەڵیدا دەژین، بە دەگمەن ڕێک دەکەوێت کوڕێکی سێ ساڵان وەک کچێکی هاوتەمەنی خۆی بە پاراوی قسە بکات، ڕاستە کوڕ دواتر کەم و کورتییەکانی زمانی قسە و گفتوگۆکردنی قەرەبوو دەکاتەوە و توانای دەربڕینی باشتر دەبێت، بەڵام پەیوەندی ئافرەتان بە قسە و گفتوگۆوە پەیوەندییەکی تۆکمەتر و لەپێشترە، هەرچەند ئەمە لەسەر ئاستی چەندایەتییە نەک چۆنایەتی، کەواتە ئا ئەمەیە هۆکاری زۆربڵێی ئافرەتان!

ڕەنگە پێم بڵێیت: دەی خۆ پیاویشمان هەیە لە ئافرەت زۆر بێژترە، هاوکات ئافرەتی کەمدووشمان هەیە!

منیش پێت دەڵێم ڕاستە، بەڵام ئەوە تاکوتەرایە و یاسایەکی گشتی نییە، عەرەبیش دەڵێت: شاز یاسای پێ هەڵناوەشێتەوە، یاسا گشتییەکە دەڵێت: ئافرەتان زۆرتر لە پیاوان قسە دەکەن!

وا نەزانیت زۆروتن تەنها پیشەی هاوسەرەکەی تۆیە، بەڵکوو ئەمە خوویەکی گشتییە و لە هەموو ئافرەتێکدا بوونی هەیە، بۆیە پێویستە لەسەر ئەو بنەمایە دەست و پەنجەی لەگەڵدا نەرم بکەیت و بە ئاسایی وەریبگریت، نەک هەوڵی گۆڕینی بدەیت؛ هەوڵ بدە تەنها لێی تێبگە!

٢- هەستیاری زیاد لە پێویست:

تۆ پێتوایە هاوسەرەکەت زۆر هەستیارە و لایەنی سۆزداری زاڵە بە سەریدا، دروستبوونی دەمەقاڵێیەکی بچووک لە نێوانتاندا بەسە بۆ ئەوەی دەست بکات بە شیوەن و گریان، کاتێک منداڵەکەی ئەنجامی تاقیکردنەوەکانی قوتابخانە وەردەگرێتەوە و نمرەی دەرچوونی بە دەست نەهێناوە، گریان قورگی دەگرێت، دیمەنە تراژیدییەکانی ناو هەر فیلمێک فرمێسکی بە خوڕ لە چاوەکانی دێنێتە خوارەوە، جاری واش هەیە هەر لە خۆیەوە و بەبێ هیچ هۆکارێکی ڕوون و ئاشکرا دەگری، تۆش هەوڵ دەدەیت بزانیت هۆکاری ئەم گریانەی چییە؟ دواجار بۆت ڕوون دەبێتەوە هۆکارەکە شتێکی زۆر کەمبایەخە و هەرگیز شیوەن و زاری پێ ناوێت، تۆش لە دڵی خۆتدا دەڵێیت: بە خوا هەر ئافرەتێکی تر هاوسەرم بوایە حاڵم بەم حاڵە تاڵەی ئێستا نەدەگەشت، لانی کەم گریانی کەمتر دەبوو، لە کاتی ناکۆکی و دەمەقاڵێدا خۆگرتر دەبوو، لەگەڵ نمرە کەمەکانی منداڵەکەیدا مامەڵەیەکی تەندروستی دەکرد، نەک بە گریان و زارییەکەی هێندەی تر باری دەروونی منداڵەکەی ئاڵوزتر بکات، دیمەنە تراژیدییەکانی ناو فیلمەکانیش وەک سیناریۆ مامەڵەی لەگەڵدا دەکردن، نەک وەک ڕووداوی ڕاستەقینە!

جارێکی تر دەگەڕێینەوە سەر ئامۆژگارییەکەی داپیرە، تۆ لات وایە ئەگەر ئافرەتێکی تر هاوسەرت بوایە ژیان لەناوماڵەکەتدا جیاوازتر دەبوو، ئەزانی ئەم بڕوایەت چۆن بۆ دروست بووە؟ تۆ هاوسەرەکەی خۆت لە ناوەوە باش دەناسیت و لەگەڵیدا ژیاویت و ئەزموونت لەگەڵیدا هەیە، بەڵام ئافرەتانی تر تەنها توێکڵە ڕەنگاوڕەنگەکەیانت دیون و بەس، بۆیە وا دەزانیت هێلکەکان لە ناویشەوە جیاوازن! نا ئەزیزەکەم کە توێکڵەکەت لێکردەوە دەبینی هەموویان وەک یەکن!

بیرت نەچێت ئەی پیاوی تۆکمە و توندوتۆڵ تۆ لە گڵ دروست بوویت! تۆزێک ئاو و چەند کاتژمێرێکی بەر هەتاو بەسن بۆ ئەوەی لەو گڵەوە گۆزە و دیزەیەکی توند و پتەو دروست بکرێت! بەڵام ئافرەت لە پەراسووە نزیکەکەی لای دڵەوە دروست بووە، خۆ تۆ خۆت باش دەزانیت دڵ نابێت بە ماسوولکە! دڵ هەست و سۆزە، ئەمەی باسم کرد بنچینەی دروستبوونی پیاو و ئافرەت بوو، پێشتر و لە سەرەتای ئەم کتێبەوە بەڵێنمان بە یەک دابوو ئەم وانە گرنگەمان بیر نەچێت!

ڕەنگە لە دڵی خۆتدا بڵێیت ئەم کابرایە زیادەڕەوی زۆر دەکات، مافی خۆتە ئەمە بۆچوونت بێت، بەڵام بۆ ئەوەی قسەکەت نەچێتە چوارچێوەی چێو لە تاریکی کوتانەوە، هەندێک ئاماری زانستی دەخەمە بەردەستت!

تێکڕای گریانی ئافرەت لە ساڵێکدا سیوشەش بۆ شەستوچوار جارە، لە کاتێکدا تێکڕای گریانی پیاو لە ساڵێکدا شەش بۆ حەڤدە جارە!

بە واتایەکی تر کام ئافرەتەی لە ساڵێکدا زۆر کەم دەگری هێشتا لە زۆربەی هەرە زۆری پیاوان پتر دەگری!

ئێمە کاتێک هاندەری یانەیەکین و دەیدۆڕێنێت ناگرین، منداڵەکانمان لە قوتابخانە نمرەی دەرچوونیان بە دەست نەهێنا ناگرین، ئەگەر جارێک خۆمان تاقی کردووە و چێشمان لێنا و بەسەر ئاگرەکەوە سووتا ناگرین، ئۆتۆمبیلەکەیان ڕووشاندین ناگرین، لەسەر کار و لەگەڵ هاوڕێیەکمان بوو بە دەمەقاڵێمان ناگرین، کاتێک ئوتووەکەمان لەسەر کراسەکە بیر دەچێت و دەیسووتێنێت ناگرین، ئێمە ئەو گڵەین خشت و بەرد و پرد و خانووی لێ دروست دەکرێت! بەڵام ئەوان پراسووە نزیکەکەی لای دڵن، ئای ئەبێ چ کارەساتێک بقەومێت کاتێک دڵ ڕەق دەبێت!

ڕەنگە دیسانەوە بڵێیت: ئەم قسەیەی تۆ کەی وایە؟! پیاو هەیە هەمیشە چاو بە فرمێسکە، شتی زۆر سادە و ساکار دەیهێنێتە گریان، لە بەرامبەریشدا ئافرەتمان هەیە بە دەگمەن فرمێسک بە چاوەکانیەوە دەبینیت!

جارێکی تر پێت دەڵێمەوە: ڕاستە! بەڵام ئەوە تاکوتەرایە و یاسایەکی گشتی نییە، عەرەبیش دەڵێت: شاز یاسای بەرکاری پێ هەڵناوەشێتەوە!

یاساکە دەڵێت: ئافرەتان پتر لە پیاوان دەگرین!

وانەزانیت گرینۆکی تەنها پیشەی هاوسەرەکەی تۆیە، بەڵکوو ئەمە خوویەکی گشتییە و لە هەموو ئافرەتێکدا بوونی هەیە، وەک ئەمری واقیع (دیفاکتۆ) مامەڵەی لەگەڵدا بکە، نەک وەک کارەسات، هەوڵی گۆڕینیشی مەدە، چونکە پێتناکرێت، تەنها لێی تێبگە!

### ٣- دوودڵی و ڕاڕایی لە هەڵبژاردنی جلوبەرگدا:

کاتێک کە لەگەڵ هاوسەرەکەتدا دەتانەوێت پێکەوە دەرچوونێک بکەن، یان بچن بە دەم بانگهێشتنامەیەکەوە، تۆ هەست بەوە دەکەیت

کە ئەو زۆر ڕاڕایە و دڵی لەسەر جلێک دانامەزرێت بۆ ئەوەی بیپۆشێت، ئەمەش زۆر جار دەبێتە هۆی بێزاری و توورەبوونی تۆ، بەڵام دڵت لە خۆت دانەمێنێت ئێمەش هەمان ئاریشەی تۆمان هەیە و بە دەست چاوەڕوانی و ڕاڕایی هاوسەرەکانمانەوە گیرمان خواردووە، زۆر لەوەش دڵنیاین کە ئەم ڕاڕاییەی ئەوان جگە لە کاتبەفیڕۆدان هیچ بەرهەمێکی تری نابێت، ئێمەش وەک تۆ سەرمان لەم دووفاقییەی ئەوان سووڕماوە! لە لایەک داوای کەنتۆری گەورەتر دەکەن، چونکە ئەوەی خۆیان بچووکە و جێگای جلوبەرگەکانیان نابێتەوە! لە لایەکی ترەوە هیچیان نییە بۆ ئەوەی بیپۆشین!

هەموو جارێک ئەمە دووبارە دەبێتەوە: هەتا لە ماڵەوەن کەنتۆری گەورەتریان دەوێت، کاتێکیش لە ماڵ دەردەچن شتێکیان نییە بۆ لەبەر کردن!

هاوڕێ! ئەمە تەنها پیشەی هاوسەرەکەی تۆ نییە، بەڵکوو ئەمە خوویەکی گشتییە و لە هەموو ئافرەتێکدا بوونی هەیە!

بە شێوەیەکی گشتی ئەگەر ئافرەت شەست ساڵ تەمەن بکات، ئەوا یەک ساڵی تەمەنی لە هەوڵی هەڵبژاردنی جلوبەرگدا بە خەرج دەدات، لە بەرامبەردا ئەگەر پیاو شەست ساڵ تەمەن بکات ئەوا تەنها سێ مانگی تەمەنی لەو پێناوەدا بە خەرج دەدات!

وەک دەبینیت جیاوازییەکی گەورە لە نێوان ئێمە و ئافرەتاندا هەیە، هۆکارەکەش بۆ ئەوە ناگەڕێتەوە ئافرەت حەز بە کەشخەیی دەکات و پیاویش گوێی پێنادات، بە پێچەوانەوە ئێمەی پیاوانیش حەزمان بە کەشخەیی و جوانپۆشی هەیە، بەڵام جیاوازییەکە لە نێوانماندا ئەوەیە ئەوان زیاتر لە ئێمەی پیاوان بایەخ بە دەوروبەریان دەدەن!

تۆ ئەگەر بۆ بەشداریکردن لە ئاهەنگی بووکگواستنەوەی خزمێکت جلوبەرگێکی جوان و قەشەنگت پۆشی و پاش چەند مانگێک جارێکی تر بانگهێشتی بۆنەیەکی تری هاوشێوە کرایتەوە بە لاتەوە ئاساییە هەمان جلوبەرگ بپۆشیتەوە بەو مەرجەی کەشخەیی و جوانیەکەی خۆی لە دەست نەدابێ، هەرگیز ئەو پرسیارەت بە مێشکدا نایەت: تۆ بڵێیت لەناو ئەم بانگهێشتکراوانەدا کەسێکی تیابێت پێشتر بەم جلوبەرگەوە منی دیبێت؟ لەمەدا ئافرەت زۆر پێچەوانەی پیاوە، جلوبەرگی ئاڵووالای نوێ بە بەشێکی دانەبڕاو لە ئاهەنگی بووکگواستنەوە دەزانێت، ئەگەر باری دارایی گونجاو بێت، ئەوا پێش هەموو شتێک بیر لە کڕینی جلوبەرگێکی مۆدیل نوێ دەکاتەوە، ئەو حەز دەکات بە شێوازێکی جیاواز و ناوازەوە دەربکەوێت، خۆ ئەگەر باری دارایی بواری کڕینی جلوبەرگی نوێی پێ نەدات، ئەو کات پەنا بۆ بژاردەکەی پیاو دەبات و بە ناو جلوبەرگە کۆنەکانیدا دەگەڕێت و جوانترینیان دەستنیشان دەکات بۆ ئەوەی لەو بۆنەیەدا بیپۆشێت، بەڵام سەیرێکی لیستی ناوی بانگهێشتکراوانیش دەکات و هەوڵ دەدات لەناو جلوبەرگە کۆنەکانیدا بەرگێک هەڵبژێرێت کە پێشتر هیچ کام لە ئامادەبوانی ئاهەنگەکە بەو بەرگەوە نەیاندیبێت!

خاڵێکی گرنگ هەیە کە زۆربەی پیاوان، بگرە هەموویان لێی بێئاگان ئەویش ئەوەیە: ئافرەت جیهانی ناوەوەی بڕیار لەسەر جیهانی دەرەوەی دەکات، لە بەشی داهاتووشدا باسی ئەوە دەکەین کە ئافرەت هەمیشە سایکۆلۆژیێتێکی ناجێگیری هەیە، ئافرەت کاتێک جلوبەرگێک دەستنیشان دەکات تەنها فشاری ئەو هۆکارە دەرەکییانەی لەسەر نییە کە باسمان کردن، بەڵکوو پاڵنەری

دەروونیشی لەگەڵدایە، هەڵبژاردنی ڕەنگ و شێوازی جلوبەرگەکانی ئەوەندەی ڕەنگدانەوەی سایکۆلۆژێت و میزاجی ئەو کات و ساتەیە کە جلوبەرگەکەی تێدا هەڵدەبژێرن، ئەوەندە بە گوێرەی گونجاوی نییە لەگەڵ جۆری ئەو بۆنەیەی کە بەشداریی تێدا دەکەن، پیاوان چونکە خۆیان بەو شێوەیە نین نازانن ئافرەتان ئاوهان!

ئێمەی پیاوان دەستنیشانکردنی جلوبەرگەکانمان بە گوێرەی گونجاویەتی لەگەڵ ئەو شوێن و بۆنانەی کە بۆیان دەچین و ڕەنگدانەوەی باری دەروونیمان نین، ئێمە نایەین کراسی شین لەبەر بکەین لەبەر ئەوەی یانەکەمان لە یارییەکی چارەنووسسازدا سەرکەوتنی تۆمار کردووە، هەرگیز جلوبەرگی ڕەنگ تاریکیش ناپۆشین لەبەر ئەوەی بەڕێوەبەرەکەمان لەگەڵماندا ناکۆکە، سایکۆلۆژێت و میزاجی ئێمەی پیاوان جێگیرترە و زۆر بە کەمی هەڵکشان و داکشان بە خۆیەوە دەبینێت!

ئەمانەی باسم کردن با هەمیشە لە یادت بێت! لەمڕۆ بەدواوە لە ڕارایی و دوودڵی هاوسەرەکەت باش تێبگە و بیشزانە ئەمە بە تەنها پیشەی ئەو نییە، بەڵکوو خوویەکی گشتییە و لە هەموو ئافرەتێکدا بوونی هەیە!

٤- هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی ڕابردوو:

تۆ زۆر بەوە بێزار دەبیت کە هاوسەرەکەت هەردەم لاپەڕەکانی ڕابردوو هەڵدەداتەوە، هەر ئەوەندەی لەسەر بابەتێک دەمەقاڵێیەک کەوتە نێوانتانەوە، یەکسەر هەرچی کای کۆن هەیە بە بای دەکاتەوە، بیرت دێنێتەوە فڵان شتت کرد و فڵان شتت وت و هتد... جاری وا هەیە هەندێ شتت بیر دێنێتەوە کە مێژووەکەی بۆ ڕۆژگاری دەستگیرانداری دەگەڕێتەوە، تۆش ئەمەت زۆر پێ

سەیرە و لە دڵی خۆتدا دەڵێیت باشە ئەمە ژنە یان سندووقە ڕەشەکەی فڕۆکەیە؟ خۆ هەموو شتێکی تۆمار کردووە و هیچی بیر نەچووەتەوە، پاشان بە خۆت دەڵێیت ئەرێ باشە ئەم ڕووداوە کۆنانەی ڕابردوو چ پەیوەندییەکیان بەم دەمەقاڵێی ئێمەوە هەیە، هەرچی دەیهێنێت و دەیبەیت هیچ پەیوەندییەک لە نێوانیاندا نابینیتەوە، دەشتەوێت بزانیت ئەم هاوسەرەی تۆ بۆ ئاوهایە!

نازانانم تا چەند سەبووریت بۆ دێت ئەگەر بڵێم ئەمە بە تەنها سروشتی هاوسەرەکەی تۆ نییە، بەڵکوو خوویەکە لە هەموو ئافرەتێکدا بوونی هەیە!

٥- لە ڕواڵەت و ڕووخساری خۆی ڕازی نییە:

دڵەڕاوکێی بەردەوامی هاوسەرەکەت لە ڕواڵەت و ڕووخساری خۆی دیسانەوە بێزار و نیگەرانت دەکات، خۆ گومان لەوەدا نییە تۆ حەز دەکەیت ئەو لەوپەڕی جوانی و شۆخوشەنگیدا ببینیتەوە و بە بۆن و بەرامەی خۆشی مەست و حەیرانت بکات، بەڵام تۆ دەتەوێت ئەو متمانەی زیاتری بە جوانیی خۆی هەبێت و هێندەش زیادەڕەوی نەکات لە پرسیارکردن سەبارەت بە شکڵ و شێوەی، هەروەها تێبینی ئەوەشت کردووە کە کاتێکی زۆر لەگەڵ بابەتی ئارایش و جلوبەرگی مۆدە بە فیڕۆ دەدات، بە شێوەیەکی گشتی نەک تەنها تۆ بەڵکوو هەموو پیاوان لەم ئەتوارەی ئەوان قەڵس و بێزارن!

بەڵام پێش ئەوەی قسەوباس لەسەر ئەو بکەین با جارێ لەسەر تۆی پیاو بدوێین!

ئەگەر جوانی و شۆخوشەنگیی هاوسەرەکەت ویست و خواستی هەمیشەیی تۆ بێت ئەوا نابێت قەڵس و بێزاریش بیت کاتێک ئەو هەست بە دڵەڕاوکێ دەکات و ترسی ئەوەی هەیە جوانییەکەی جێگەی ڕەزامەندی تۆ نەبێت!

هەروەک چۆن تۆی پیاو تێرکردنی حەز و ئارەزووەکانت بە ئەرکی سەرشانی ئافرەت دەزانیت، بە هەمان شێوە ئافرەتیش ئەمە بە ئەرکی سەرشانی خۆی و مافی پیاوەکەی دەزانێت، بۆیە ئەو دڵەڕاوکێی ئەوەیەتی کە نەتوانێت ئەم ئەرکەی سەرشانی خۆی بە تێروتەسەلی جێبەجێ بکات!

بیهێنەرە پێش چاوی خۆت کاتێک تۆ داواکارییەک پێشکەش بە کۆمپانیایەک دەکەیت بۆ ئەوەی لە بەرامبەر مووچەیەکدا کە هەردوولا لەسەری ڕێک دەکەون کاریان بۆ بکەیت، ئەوانیش بە مەبەستی هەڵسەنگاندنت چاوپێکەوتنت لەگەڵدا ساز دەکەن، تۆ کەسێکی لێوەشاوە و خاوەن هەموو پێداویستی و داخوازییەکانی ئەو کارەیت و تەواو پسپۆڕی تیایدا، لەگەڵ ئەم هەمووە توانا و ئامادەگییەدا هێشتا هەر هەست بە ترس و دڵەڕاوکێ دەکەیت کە جێگەی ڕەزامەندی لیژنەی هەڵسەنگاندن نەبیت!

سەرباری ئەوە ترسی ئەو ڕکابەرانەیشت لە دڵدایە کە وەک تۆ داوایان پێشکەش کردووە، ترست هەیە یەکێک لەوان لە تۆ لێوەشاوەتر بێت، یان خاوەنی زمانێکی لووس بێت و باوەڕ بە لیژنەکە بهێنێت کە ئەو لە تۆ شایستەترە و کارەکە بۆ خۆی مسۆگەر بکات!

ئەم ترس و دڵەڕاوکێیەی کە تۆ لەو کاتەدا هەتە ئافرەت لە هەموو کات و ساتێکدا هەیەتی، ئەو باش دەزانێت کە تاکە ئافرەتی جیهان نییە و دەوروبەریشی پڕە لە ئافرەتی شۆخوشەنگ، ئەگەرچی ئەو خاوەن جوانی خۆیەتی بەڵام جیهانی کێبڕکێ خۆی بۆ خۆی خاڵی نییە لە ترس و بیم، تۆ لیژنەی هەڵسەنگاندنیت و ئەویش چاوەڕوانی بڕیاری تۆیە!

بڕوام وایە دوای ئەو هەمووە قسە و باسانەی هەر لە سەرەتای کتێبەکەوە تا ئێستا کردمانن هیچ گومانێکت نەماوە لەوەی کە ئافرەتان لە ئێمەی پیاوان سۆزداتر و هەستیار ترن، ئەمە شتێکی بەڵگەنەویستە و بگرە ژیانیشی لەسەر بەندە!

لەمەوە دەتوانین ڕاستییەکی تر هەڵێنجین و وەڵامی ئەو پرسیارە وەرگرین کە: بۆچی ئافرەت هەمیشە ڕووداوەکانی ڕابردوو وێردی سەر زمانێتی و هاوشێوەی سندووقە ڕەشەکەی فڕۆکە تاکە ڕووداوێکیشی بیر ناچێتەوە؟ یادەوەری سۆزداری ئافرەت چەند قات لە یادەوری سۆزداری پیاو بەهێزترە!

بە واتایەکی تر و بە زمانێکی سادەتر ئافرەت بە ئاسانی ئەو ڕووداوانەی بیر دەچێتەوە کە هەست و سۆزی ناورووژێنن، لێی بپرسە ڕەنگە نەزانێت دوێنێ چی خواردووە، بەڵام ڕووداوێکی دڵخۆشکەر، یان خەم ئاوەری چەند ساڵێکی پێشووتری لە یادەوەریدا هەر ماوەتەوە، هۆکارەکەش ئەوەیە خواردنەکەی دوێنێی تەنها هەڵسوکەوتێکی ئاسایی ڕۆژانە و داماڵراو لە هەر هەست و سۆزێکی دەروونی بووە، بەڵام ڕووداوە دڵخۆشکەر و خەمئاوەرەکانی هەرگیز بیر ناچنەوە، نەک لەبەر ئەوەی ئەو ڕووداوانە لەوانە نین بە ئاسانی لە بیر بچنەوە، بەڵکوو لەبەر ئەوەی هەست و سۆزی بۆ ئەو ڕووداوانە ئاسایی نەبووە و لە ئەوپەڕی هێز و جۆش و خرۆشدا بووە!

ئـەو کاتێـک گرفتـە کۆنـەکان دەخاتـەوە بـەر بـاس و گفتوگـۆ نایەوێت پێت بڵێت من هەموو شتێکم تۆمار کردووە و هیچ شتێکم بیر نەچووەتـەوە، ئـەو تەنهـا دەیەوێت پێتبڵێت ئـەو گرفتانـە هێنـدە ئازاربەخـش بـوون تـا ئێسـتاش نەمتوانیـوە لـە بیریـان بکـەم!

ئـەوان بـەو ئەندازەیـەش تاریکبیـن نیـن، تەنهـا خاڵـە ڕەشـەکانی ڕابردوو ببینن و خاڵە گەشـەکانی فەرامۆش بکـەن، هەرچەنـدە کاتێک هەڵوێسـتێکی دڵخۆشـکەرت لـێ دەبینـن هەڵوێسـتە دڵخۆشـکەرەکانی ڕابـردووت بـۆ هەڵنادەنـەوە، چونکـە ئێمـەی مـرۆڤ زیاتـر بـاس لـە ئـازارەکان دەکەیـن وەک لـە خۆشـییەکان!

ڕەنگـە تێبینـی ئـەوەت کردبێـت هەمیشـە ئافرەتانـی بێـوەژن باسـی چاکـەی مێردە کۆچکردووەکانیـان لـە دەم داناگرن و هـەردەم وێـردی سـەر زمانیانـە، دەیانەوێـت لـەم ڕێگەیـەوە بڵێـن: ئێمـە ئێسـتاکە بێبەشـین لـەو هەسـتە خۆشـەی کـە چاکەکانی ئەوان جـاران پێیـان دەبەخشـین، وا نەزانیـت ئافـرەت تەنهـا شـتە نەرێنییەکانـی لـە بیـرە و بـەس! بـەڵام لـە بەرامبەریشـدا کاتێـک دەمەقاڵێیـەک لـە نێوانتانـدا دروسـت دەبێـت، نابـێ چاوەڕوانـی ئـەوەی لـێ بکەیـت پێـت بڵێـت: مـادەم تـۆ فڵانـە ڕۆژ فڵانـە چاکـەت لەگەڵمـدا کـرد و فڵانـە هەڵسـوکەوتی جوامێرانـەت لەگەڵمـدا نوانـد، ئیتـر مـن چـاو لـەم هەڵوێسـتە تونـدەی ئێسـتات دەپۆشـم! ئـەم خەمـەی ئێسـتای خەمـی ڕابـردووی بیـر دێنێتـەوە، ئافرەتـان هەموویـان ئاوهـان تەنهـا خەمێـک بەشـیان نـاکات و خەمـی تـری پێـوە دەلکێنـن، هـەوڵ بـدە لـەوە تێبگەیـت کـە ئەمـە بەشـێکە لـە سروشـت و پێکهاتـەی هەمـوو ئافرەتێـک و بـە تەنهـا خـووی هاوسـەرەکەی تـۆ نییـە!

لێکۆڵینەوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ئافرەت لە ڕۆژێکدا نۆ جار بیر لە سیما و ڕووخساری خۆی دەکاتەوە، سەرباری ئەوەش لێکۆڵینەوەکان ئاماژە بەوە دەکەن تەنها لە سەدا دووی ئافرەتانی جیهان لە جوانی خۆیان ڕازین، کەواتە ئەوە تەنها هاوسەرکەی تۆ نییە دڕدۆنگە لە دیمەن و ڕووخساری خۆی، بەڵکوو هەموو ئافرەتانی دنیا هاوشێوەی ئەون!

ڕاستە کاتێک تۆ داوا لە هاوسەرەکەت دەکەیت کە متمانەی زیاتری بە دیمەن و جوانی خۆی هەبێت ئەم داوایەی تۆ داوایەکی قورس و بەدەر لە توانای ئەو نییە، بەڵام دەبێت بزانیت تۆ بەرپرسیت لە چاندنی ئەو متمانەیە تێیدا! ئەو کاتێک کاتژمێرێک لە بەردەم ئاوێنەدا بەڕێ دەکات و خۆی تیفتیفە دەدات بۆ ئەوەی لە چاوی تۆدا بە جوانی دەرکەوێت باوەڕ بە جوانی خۆی ناهێنێت ئەگەر تۆ پێی نەڵێی جوانیت، بۆیە ئەگەر دەتەوێت ئەو متمانەیەی لە لا دروست ببێت، ئەوا پێویستە هەردەم بە جوانییەکەیدا، بە بۆن و بەرامەی عەتر و عەبیریدا، بە زوڵفی چین چینیدا، بە جلوبەرگی ئاڵووالآیدا هەڵبڵێی.

ئەو پیاهەڵدانەی تۆ ئەگەر دووریش بێت لە ڕاستییەوە ئیسلام ڕیگەی پێ داوە؛ چونکە دەچێتە خانەی دڵخۆشکردنی بەرامبەرەکەتەوە، ئەگەرچی ئەویش وەک تۆ باش دەزانێت جوانترین ئافرەتی جیهان نییە، بەڵام ئەگەر پێی بڵێیت تۆ لە جوانترینەکانی! لە خۆشیدا پەڕ و باڵ دەردەکات، خۆ نایەت قورئانێکت بۆ بێنێ و سوێندت بدات بزانێ تۆ بە ڕاستتە، یان تەنها دەتەوێت دڵی ئەو ڕازی بکەیت، بەبێ سوێندیش قسەکەت لێ وەردەگرێت و دڵی ئاو دەخواتەوە!

پاشان ئافرەت چۆن ترس و دڵەڕاوکێی لە جوانی خۆی بۆ دروست نابێت لە کاتێکدا ڕۆژانە دەیان چیرۆکی ناپاکی هاوسەرگیری دەبیستێت، فڵانە پیاو وازی لە هاوسەرەکەی خۆی هێنا بۆ ئافرەتێکی جوانتر! فڵانە پیاو لەگەڵ فڵانە ئافرەتی شۆخوشەنگدا پەیوەندی سۆزداریی هەیە! بیستنی ئەم جۆرە چیرۆکانە بەسن بۆ ئەوەی ئافرەت هەست بە ترس و بیم بکات، کاتێک بەڕێوەبەری ئەو کارگەیەی کە تۆ کاری تێدا دەکەیت بڕیار دەدات کارمەندانی کارگەکەی کەم بکاتەوە، ئاساییە ئەگەر تۆ هەست بە ترس و دڵەڕاوکێ بکەیت، ئەوەی ئەو ترسەت دەڕەوێنێتەوە ئەوەیە بەڕێوەبەرەکەت پێت بڵێت: تۆ کارمەندێکی کارامەیت و هەرگیز دەستبەردارت نابین، ئەگەر ئەم کارگەیە یەک کارمەندی تێدا بمێنێتەوە ئەوا دڵنیابە تۆ ئەو کارمەندە دەبیت! تۆ بەڕێوەبەرەکەیت و هاوسەرەکەشت کارمەندەکەی بەردەستتە، ئەو ئەیەوێت لە زاری تۆوە جوانی خۆی ببیستێتەوە و پێی بڵێیت: هیچ ئافرەتێکی تر جێگای تۆم بۆ پڕ ناکاتەوە!

ئێمە لە کتێبە ئەدەبییەکاندا دەیخوێنینەوە و لە ڕاگەیاندنەکانەوە دەبیستین و لە ڕۆژنامەکانەوە بەرچاومان دەکەوێت کە ئافرەتانی شۆخوشەنگ چی لە دڵی پیاوان دەکەن و چۆن لە هاوسەرەکانی خۆیانیان هەڵدەگێرنەوە، باشە بۆ دەبێ ئافرەتانی تر بتوانن خۆیان شۆخوشەنگ پیشان بدەن، بەڵام تۆ نەتوانیت؟ بۆ ئافرەتانی تر بتوانن دڵی مێردەکەت برفێنن، بەڵام تۆ نەتوانیت شەیدای خۆتی بکەیت؟ بۆ دەبێت مێردەکەت ئافرەتانی تر لە ئەوپەڕی جوانیدا ببینێت، بەڵام ئاخ و داخ هەڵبکێشێت کە تۆ وەک ئەوان نیت، ئەمڕۆ جیهان لە هەموو بوارەکاندا پێشکەوتنی گەورەی بە خۆیەوە دیوە،

لە ڕێی کەرەستەکانی ئارایشتەوە دەتوانرێ ئافرەتێکی ئاسایی وەک شاجوانێک پیشان بدرێت، پێش ئەوەی ئەرکی مێردەکەت بێت متمانە بەخۆبوونت تێدا دروست بکات، جارێ ئەرکی تۆیە خۆتی بۆ برازێنیتەوە، خۆ کەس نەیگوتووە: تۆ دەبێت لە نێوان کابانی ماڵ و خۆئارایشتکردندا تەنها یەکێکیان هەڵبژێریت! کۆکردنەوەی ئەم دووانە کارێکی ئەستەم نییە، ڕاستە کاروبارەکانی ژیان ماندووکەرن و پێداویستییەکانی زۆر و هەمەلایەنن، بەڵام بەشێکیش لە پێداویستییەکانی ژیان ئەوەیە تۆی ئافرەت گرنگی بە لایەنی خۆجوانکردن بدەیت، ئەرکی سەرشانتە لە ڕێی تێرکردنی حەز و ئارەزووەکانیەوە مێردەکەت بپارێزی و نەهێڵیت بکەوێتە داوی ئافرەتانی ترەوە!

کاتێک منداڵ بووم نەنکم بە ڕەحمەت بێت بۆ دڵخۆشکردنی من جارێک چیرۆکێکی خۆشی بۆ گێڕامەوە، بەڵام کاتێک گەورە بووم زانیم ئەم چیرۆکە تەنها بۆ بەسەربردنی کاتێکی خۆش نییە، بەڵکوو وانەیەکە پێویستە هەموو ئافرەتێک بیبیستێ و لێوەی فێر ببێت، خۆ ڕەنگە ئەم چیرۆکە هەر ڕووی نەدابێت وەک هەر چیرۆکێکی تری فۆلکلۆری و چیرۆکی داپیرەکان بە شێوەیەکی گشتی، بەڵام گومان لەوەدا نییە ئەم جۆرە چیرۆکانە زمانحاڵی واقیع و ڕەنگدانەوەی ژیانی خەڵکن.

نەنکم دەیگێڕایەوە دەیگوت: کاتی خۆی دوو پیاو هەبوون دراوسێی یەک بوون و نێوانیشیان زۆر خۆش بوو، دوای ئەوەی هەژاری تەنگیان پێ هەڵدەچنێ و لە شارەکەی خۆشیاندا کاریان دەست ناکەوێت، پێکەوە بڕیار دەدەن ماڵ و منداڵیان بەجێ بهێڵن و ڕوو لە شارێکی تر بکەن بۆ پەیداکردنی بژێوی ماڵ و منداڵیان، چوونە شارێکی دوورەدەستترەوە و دەستیان کرد بە کارکردن

هەرچیشیان پەیدا دەکرد بۆ هاوسەرەکانیان ڕەوانە دەکردەوە، هاوسەری یەکێکیان هەرچی بۆ ئەهاتەوە ئەیدا بە کەرەستەکانی ئارایشت و بۆنی خۆش و جلوبەرگی جوان، بەڵام ئەوی تریان بە پێچەوانەوە، ئەو پارانەی بۆی دەهاتنەوە هیچی بۆ خۆی خەرج نەدەکرد، بەڵکوو هات خانووەکەی پێ فراوان کرد و کەرەستە و پێداویستییەکانی ناو ماڵی پێ نوێ کردنەوە، لە پاش ساڵێک دووری لە ماڵ و منداڵیان بڕیاری گەڕانەوەیان دا، یەکەمیان کە گەشتە ماڵەوە جوانی و بۆن و بەرامەی خۆشی هاوسەرەکەی تەواو مەست و حەیرانی کرد و هەر بە یەکەم بینینی هەموو ئازار و مەینەتیەکانی ئەو ساڵەی بیر چوویەوە، هەر کە ژنەش دەیویست باسی خەرجکردنی ئەو پوول و پارانە بکات کە بۆی ڕەوانە کردبووەوە، یەکسەر پیاوەکە پێی دەگوت تخوا باسی چی ئەکەیت؟ هەرچیم هەیە هەمووی قوربانی تۆ بێت!

بەڵام ئەوەی تریان کە گەشتە ماڵەوە دیمەنی شپرز و ڕەنگی هەڵبڕسکاوی هاوسەرەکەی تەواو بێزار و نیگەرانی کرد، نە جلوبەرگێکی جوانی لەبەردا بوو، نە بۆن و بەرامەیەکی خۆشی لێ دەهات، بەڵام کە چاوێکی بەناو خانووەکە گێڕا تەماشا ئەکات خانووەکەی لە خانووی موختاری گەڕەک زۆر خۆشترە، هەر ئەملا و ئەولای دەکرد و چاوی بە ناو خانووەکەدا دەگێڕا، ژنەکەی پێی وت وا دیارە دەستکاریکردنی ئەم خانووە و تازەکردنەوەی کەرەستە و پێداویستییەکانی ناوی جێگەی ڕەزامەندی و سەرسامی تۆن، بۆیە ئاوا بە دیقەتەوە چاوی پیا دەگێڕی، وتی: نەخێر بەڵغەمێکم لە دەمدایە نازانم ڕۆی بکەمە کوێ، هەرچی شتی ناو ئەم خانووە هەیە هەمووی جوان و قەشەنگن پێم حەیفە بەڵغەمی تێدا ڕۆ بکەم، تەنها شتی ناشیرینی ناو ئەم خانووە ئەم ڕەنگ و ڕووخسارەی تۆیە!

**وتمـان ڕەنگە ئـەم چیرۆکە ئەفسـانە بێت و ڕووداوێکی ڕاسـتەقینە نەبێـت، خـۆ ئەگـەر ڕووداوێکـی ڕاسـتەقینەش بێت هەرگیـز پاسـاو و بەهانـە بـۆ هەڵوێسـتی تونـدی ئـەم پیـاوە ناهێنینـەوە، بـەڵام لـە بەرامبـەردا ئەگـەر سـەرنجێک لـە حاڵـی ئـەم دوو ئافرەتـە بدەیـن دەبینین هەڵوێستی توندی ئەم پیاوە کار نییـە، بەڵکوو کاردانەوەیـە!**

**بۆیە وریابە سـەرقاڵییەکانی ڕۆژگار خۆتت لە بیر نەباتەوە.**



## ڕەزیلی و چرووکی
## گەورەترین دوژمنی ئافرەتە

دەگێڕنـەوە: یەکێـک لـە پیاوماقوڵانـی عـەرەب لـە گەشـتێکدا و لـە بیابانێکـی کاکیبەکاکیدا ڕێـگا ون دەکات، لـە دوورەوە تارمایـی ماڵێکـی دەوارنشـین بـەدی دەکات و خـۆی پێـوە دەنێـت، کـە نزیـک دەبێتـەوە تەماشـا دەکات ئافرەتێکـی دەشـتەکی لەنـاو دەوارەکەدایـە، هاتـە دەرەوە و لێـی پرسـی کێیت و چ کارەیت؟ کابرا وتـی ڕێبوارێکـی ڕێگاونکـردووم، جـا نازانـم بـە میـوان رامدەگـرن یـان نـا؟

- یاخوا بەخێر بێیت سەر چاوانمان، فەرموو وەرە ژوورەوە.

چووە ژوورەوە و بەپەلە نان و خوانێکی باشـی بۆ ئامادە کرد و خسـتیە بـەر دەسـتی، هێشـتا دەسـتی لـە نانەکەدا بـوو مێردی ژنەکـە هاتـەوە، بـە ژنەکـەی وت ئـەوە کێیـە لـە ژوورەوە؟

وتی: ئەوە ڕێبوارێکە و بە میوانی لایداوە.

وتـی: دەک یاخـوا بـە خێـر نەیـەت، ئاخـر ئێمـە چیمـان داوە لـە میـوان، خۆمـان نـان نییـە بیخۆیـن، جـا بەشـی میوانـی لـێ بدەیـن؟

کابـرای ڕێبـوار کـە گوێـی لـە ئـەم قسـانە بـوو یەکسـەر دەسـتی لـە نانەکـە هەڵگرت و بـە بێدەگـی هاتـە دەرەوە و سـواری ئەسـپەکەی بـوو، جارێکـی تـر بـە ناشـارەزایی ملی ڕێگای گرتـەوە، کـە شـەوی بـە سـەردا هـات چـووە بنـی دارێکـەوە و تـا بەیانـی لێـی خـەوت، کـە دنیا

بووم و لێڵ بوو، درێژەی بە ڕۆشتنەکەی دا و هەتا نزیکی خۆرئاوا بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن، برسێتی و تینوێتی تەنگی پێ هەڵچنی بوو، ماندووبوونی ڕێگاش با لەو لاوە بوەستێت، لە دوورەوەماڵێکی دەوارنشینی بەدی کرد، ئیتر ئاهێکی بە بەردا هاتەوە بە خێرایی ڕووەو ماڵەکە ڕۆشت بەو هیوایەی نان و ئاوێکی پێ بدەن و ڕێگای گەڕانەوەشی پێ پیشان بدەن، کە لە ماڵەکە نزیک بوویەوە ئافرەتێکی دەشتەکی هاتە دەرەوە.

وتی: تۆ کێیت چ کارەیت؟

وتی: ڕێبوارێکی ڕێگاونکردووم و هاتووم بە میوان ڕامبگرن.

- دەک یاخوا بە خێر نەیەیت، جا بۆ خۆمان هیچمان هەیە بیخۆین هەتا بەشی میوانی لێ بدەین؟

لەم قسەوباسانەدا بوون و مێردی ژنەکە هاتەوە و ڕووی دەمی کردە کابرا، وتی: کێیت و چۆن ڕێت کەوتۆتە ئەم ناوە؟

- میوانم.

- باشە یاخوا بە خێر بێیت!

فەرمووی لێ کرد بۆ ژوورەوە و پاشان خۆی چوو نان و خوانێکی شاهانەی بۆ ساز کرد و خستیە بەردەستی، کابرای میوانیش تێروپڕی خوارد و پشوویەکی باشی دا و ڕووداوەکەی دوێنێی بیر کەوتەوە و زەردەخەنەیەکی کردا!

خاوەن ماڵ پرسیی: ئەوە بە چی پێدەکەنیت؟

ئەویش چیرۆکەکەی بۆ گێڕایەوە و وتی دوێنێ لە ماڵێکدا بووم ژنەکە سەخی و پیاوەکە ڕەزیل بوو، کەچی ئەمڕۆ پێچەوانەوە بووەتەوە، لە ماڵێکدام پیاوەکە سەخییە و ژنەکە ڕەزیل، خاوەن ماڵەکە قەسەکەی لە دەم وەرگرت و وتی ئەمە هیچ سەرسوڕمانێکی ناوێت، ئەو ئافرەتەی تۆ باسی دەکەیت ئەوە خوشکی منە

و مێردەکەیشی برای هاوسەرەکەمە، هەر یەکەمان سروشتی خانەوادەکەمان زاڵە بە سەرماندا!

بە دەستی ئەنقەست بەم چیرۆکە دەستم پێ کرد، بۆ ئەوەی شتێکی گرنگ بڵێم، ئەویش ئەوەیە ئاکار و ڕەوشت تەنها لە پیاوان یان لە ئافرەتاندا قەتیس نامێنێت، بەڵکوو هەم لەناو پیاوان و هەمیش لەناو ئافرەتاندا بوونی هەیە، لەناو پیاواندا هاوشێوەی ئافرەتان ڕەزیل هەیە و سەخیش هەیە، لەناو ئافرەتانیشدا هاوشێوەی پیاوان باش و خراپ هەن، کاتێک دەڵێم ڕەزیلی دوژمنی گەورەی ئافرەتە، یان دەڵێم ئامان سەد ئامان نەکەیت ڕەزیل و چرووک بێت! مەبەستم ئەوە نییە تەنها پیاوان بە ڕەزیلی تۆمەتبار بکەم و پاکانە بۆ ئافرەتان بکەم، بەڵکوو ئەمەش وەک ڕزق و ڕۆزی خوای گەورە دابەشی کردووە مرۆڤەکان تیایدا هەژار و دەوڵەندیان هەیە!

ڕەزیلی دوژمنی ئافرەتە، نەک تەنها لە پارە و پوولدا، بەڵکوو لە سۆز و ئەوینیشدا، بەڵام قسەی ئێمە لێرەدا تەنها لەسەر ڕەزیلییە لە پارە و پوولدا، جا لەبەر ئەوەی بە زۆری وایە پیاوان بەخێوکەری خێزانن و زۆربەی هەرە زۆری ئافرەتانیش کابانی ماڵن و خاوەنی داهاتی تایبەت بە خۆیان نین، تەنانەت ئەوانەشیان کە خاوەنکارن مووچەکانیان تێکەڵ بە مووچەی پیاوەکانیان دەکەن، بۆیە هاتم ڕووبەرێکی باشی ئەم کتێبەم تەرخان کرد بۆ باسی ڕەزیلی و مشتقوچاویی پیاوان.

زۆربەی خەڵکی وادەزانن ڕەزیلی و بەخشندەیی پەیوەندی بە ئەندازەی ئەو پارە و پولەوە هەیە کە لە بەردەستی مرۆڤدایە، بە ڕای من ئەمە بیرکردنەوەیەکی هەڵەیە، زۆربەی چرووک و ڕەزیلەکان لەناو چینی دەوڵەمەند و خواپێداوەکاندایە، لە بەرامبەردا هەژارەکان

ئامادەن ئەو تەنها کولێرەیەی کە هەیانە لەگەڵتدا بیکەن بە دوو کەرتەوە؛ چونکە ئەوان لە مانای نەبوونی تێدەگەن، بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێین کە هەموو دەوڵەمەندێک ڕەزیل و هەموو هەژارێکیش سەخی نییە، هەروەک ئەنیشتاین دەڵێت: هەموو گشتاندنێک هەڵەیە، تەنانەت بەم گشتاندنەی ئێمەشەوە!

هەروەها ڕەزیلی و بەخشندەیی پەیوەندی بە پۆست و زانست و ئاستی ڕۆشنبیریی کەسەکانەوە نییە، مێژوو پێمان دەڵێت: خەلیفە ئەبوجەعفەری مەنسوور تا بڵێی پیاوێکی ڕژد و ڕەزیل بووە، دووبارە کتێبە مێژوویی و ئەدەبییەکان بۆمان دەگێڕنەوە کە ئەبوئەسوەدی دوئەلی نەحویش کەسێکی ڕەزیل و مشتقوچاو بووە، ئەگەر تەماشایەکی ژیان و گوزەرانی ئەبوجەعفەری مەنسوور بکەیت، تێناگەیت ئەم پیاوە چی وای لێ دەکات ڕەزیل و چرووک بێت، خۆ ئەو خەلیفە بووە و هەرچی سەرەوەت و سامانی دنیا هەیە هەمووی لە بەردەستیدا بووە، ئەی ئەبوئەسوەدی دوئەلی بۆ ناڵێی کە دانەری زانستی نەحو و شۆڕەسواری مەیدانی زمان و ئەدەبی عەرەبی بووە، ئەوە ئەو بوو بە فەرمانی ئیمامی عەلی کوڕی ئەبو طالیب خاڵی لەسەر پیتەکانی قورئان دانا، لەگەڵ ئەم پێگە گەورەیەی کە لە زانستدا هەیبووە نەیتوانیوە لەم سیفەتی ڕژدییە خۆی قوتار بکات، مەسەلەیەک هەیە دەڵێت: قسە قسە ڕادەکێشێت، با بەسەرهاتێکی ئەم ئەبو ئەسوەدەتان بۆ بگێڕمەوە، هەرچەند ڕەنگە بەردێک نەخاتە سەر مەڵۆی ئەم کتێبە، بەڵام دەکرێت بەرچاوڕوونیت پێ بدات کە ئەم خووی ڕەزیلییە تا چ ئاستێک ناشیرینە و چۆن مرۆڤەکان دەخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە!

جارێک ئەبوئەسوەدی دوئەلی خواردنێکی لە بەردەستدا بوو خەریک بوو لێی دەخوارد، کابرایەکی دەشتەکی هات بۆ لای و

سەلامی لێ کرد، ئەویش وەڵامی سەلامەکەی دایەوە بەبێ ئەوەی فەرمووی لێ بکات، لە کاتێکدا کابرا ڕێگەیەکی دوور و پڕ لە هەوراز و نشێوی بڕیبوو، نەریتی عەرەبیش وابووە خواردنی دەمی خۆیان گرتووەتەوە بۆ میوان، کابرای دەشتەکی هەر خت و پشی ئەوەی بوو ئەبوئەسوەد فەرمووییەکی لێ بکات و لەو خواردنە بەتامەی بەردەستی بخوات، بۆیە هەوڵی دا ڕازی قسەی لەگەڵدا دابمەزرێنێت، بەڵکوو دڵی نەرم ببێت و فەرمووییەکی لە دەم دەربچێت!

کابرای دەشتەکی وتی: قوربان بە لای ماڵەکەی ئێوەدا تێپەڕیم!

ئەبوئەسوەد وتی: ماڵەکەم لەسەر ڕێگاکەت بوو، هیچ ئەرکێکت نەکێشاوە.

- هاوسەرەکەت دووگیانە!

- کە جێم هێشت دووگیان بوو.

- منداڵیشی بوو!

- ئێ ئافرەتی دووگیان هەر دەبێ منداڵی ببێت.

- دوو کوڕی بوو بە جارێ!

- دایکیشی هەروا بوو، دوو دوو منداڵی دەبوو.

- بەڵام یەکێک لە منداڵەکانی مرد!

- دیارە شیری مەمکی بەشی هەردووکیانی نەکردووە.

- کورە ئەویتریشیان مرد!

- خەفەتی مردنی براکەی کوشتی.

- داکیشیان مرد!

- بەرگەی مردنی منداڵەکانی نەگرت.

- ئەو خواردنەی بەردەستت چەند خۆشە!

- ئاخر بۆیە بە تەنها ئەیخۆم، بە خوا تامی ناکەیت، هەی دەشتەکی!

بە هەمان شێوە ئیمامی بوخاری لە صەحیحەکەیدا بۆمان دەگێڕێتەوە کە ئەبوسوفیانیش پیاوێکی ڕەزیل و گیر بووە، هاوسەرەکەی کە ناوی هیندی کچی عوتبە بوو، هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەبوسوفیانی مێردم پیاوێکی ڕەزیل و ڕژدە، ئەوەندەم ناداتێ بە ئاسانی بەشی خۆم و منداڵەکانم بکات، جا ئەگەر بە دزیی ئەوەوە لە ماڵەکەی ببەم بۆ خەرجی خۆم و منداڵەکانم گوناهبار دەبم؟ پێغەمبەری خواش لە وەڵامیدا فەرمووی: نەخێر، بەو مەرجەی تەنها ئەوەندە ببەیت کە پێداویستی خۆت و منداڵەکانتی پێ پڕ بکەیتەوە و زیادەڕەوی نەکەیت!

خۆ بینیت ئافرەت چەندە ئازار دەکێشێت بە دەست ڕەزیلیی پیاوەکەیەوە؟ ئەو کاتێک دەبینێت مێردەکەی پارەی لە دەستدایە و ئەمی لێ بێبەش دەکات، تەنها ڕێگا لە بەردەمیدا بۆ فەراهەمکردنی خەرجی و پێداویستییەکانی ژیانی ڕۆژانەی ئەوەیە دزی لە مێردەکەی بکات!

ئەمە وەک یاسایەک لێی بڕوانە: هەر سەروەت و سامانێک سوودت لێ نەبینی، وەک ئەوە وایە هی تۆ نەبێت!

دەگێڕنەوە: کاتی خۆی کابرایەکی ڕەزیل و پیسکە هەبوو، هەرچی ئاڵتوون و پارە و پولی هەبوو هەمووی برد و لەژێر درەختێکی دوورە دەستدا شاردییەوە، هەموو هەفتەیەکیش بۆ دڵنیایی خۆی ئەچوو دەریدەهێنا و تەماشایەکی دەکرد و دەیخستەوە شوێنی خۆی، لە کاتێکدا ماڵ و منداڵی زۆر هەژار و ڕووت و ڕەجاڵ بوون،

دزێک تێبینیی ئەوەی کرد ئەم کابرایە هەموو هەفتەیەک ڕوو لەو شوێنە دەکات، بۆیە بڕیار ئەدات ئەمجارە بە دزییەوە شوێنی بکەوێت بۆ ئەوەی بزانێت چ باسە، ڕۆژێک شوێنی دەکەوێت و بۆی دەردەکەوێت شتێکی لەژێر ئەو درەختەدا حەشار داوە، هەر ئەوەندەی کابرا پشتی هەڵکرد، چوو هەموو ئاڵتوون و پارە و پوولەکەی دەرهێنا و بردی، کابرای ڕەزیل وەک عادەتی خۆی هەفتەی دواتر هاتەوە بۆ بنی درەختەکە، تەماشا ئەکات هەرچی ئاڵتوون و پارە و پولە هەموویان دەرهێناوە، ئیتر کابرا دێتەوە بۆ ماڵەوە دەست دەکات بە قژ ڕنینەوە و هاتوهاوار، دەرودراوسێکانی لێی کۆ دەبنەوە بۆ ئەوەی بزانن ئەم کابرایە چی لێ قەوماوە، ئەویش حاڵ و مەسەلەیان بۆ دەگێڕێتەوە، یەکێک لە دراوسێکانی پێی دەڵێت: ئەرێ تۆ هەموو هەفتەیەک ئەچوویت سەرت ئەدا لە ئاڵتوون و پارە و پوولەکەت هیچت لێ دەرئەکرد؟ وتی: نەخێر، هەر تەماشایەکم ئەکردن و ئەمخستنەوە شوێنی خۆی، دەڵێ: دەی زۆر باشە ئێستاش بەردەوامبە و هەموو هەفتەیەک بچۆ سەیرێکی چاڵەکە بکەو وا بزانە پارە و پوولەکەتی هەر تیایە، مادەم تۆ هیچت لێ دەر نەئەکرد کەواتە بوون و نەبوونی وەک یەک وایە!

ئەگەر پێویست بێت لەسەر ئافرەت دان بە خۆیدا بگرێت و دەست لە هەندێک پێداویستی و دواکارییەکانی ژیانی خۆی هەڵبگرێت لەبەر هەژای و کەمدەستیی مێردەکەی، ئەوا هیچ پاساوێک بۆ دانبەخۆداگرتنی نامێنێتەوە کاتێک دەبینێت مێردەکەی پارەی باشی لە دەستدایە و ئەمی لێ بێبەش دەکات، ڕەزیلی ئەگەر ژیانی ژنومێردایەتیش هەڵنەوەشێنێتەوە، ئەوا مانای ئەوە نییە ژیان لەو ماڵەدا بە خێر و خۆشی دەگوزەرێ، پەیوەندی ژن و پیاو بە شێوەیەکی تەندروست بەردەوام نابێت، ئەگەر یەکتر تێر نەکەن لە هەموو بوارە جیاوازەکاندا،

سێکسی، سۆزداری، ماددی، ڕێز، گرنگیپێدان، هیچ کام لەمانە شتی لاوەکی و ناپێویست نین، بەڵکوو شتی بنچینەیی و لە پێشینەن، ناڵێین هەر یەکێک لەمانە ژیانی پێوە بەندە، بەڵام پشتگوێخستنیشیان خۆی بۆ خۆی مردنێکی لەسەرخۆیە! ئەو ئافرەتەی کە لە لای پیاوێکی ڕەزیلە، خوا خۆی دەستی بە باڵیەوەیەتی، ئەگینا ژیان لەگەڵ مرۆڤی چرووکدا گەلێک ئەستەمە!

پێتناڵێم ڕەزیل و چرووک مەبە، چونکە باش دەزانم ئەمە تەنها قسەیە و هیچ مرۆڤێکی مشتقوچاو ناکات بە کەسێکی بەخشندە، تەنها ئەوەندە بەسە بە قووڵی بچیتە ناو ئەم بەسەرهاتانەی کە هێنامانن و بیریش لەوە بکەیتەوە تۆ لە کوێی هەموو ئەمانەدای، ئەگەر تۆ سەخییەکی واقیعی بیت و پارە لە شوێنی خۆیدا خەرج بکەیت، نە دەستبڵاو بیت و نە ڕەزیل، ئەوا تۆ لەسەر ڕێگە ڕاستەکەیت و ماڵێکی بێوەی و تەندروستت بنیات ناوە، خۆ ئەگەر ئاوا نەبوویت هەر درز و کەلێنێک بکەوێتە نێوان تۆ و هاوسەرەکەتەوە، ئەوا تۆ لێی بەرپرسیت، لە هەمووی کارەساتبارتر ئەوەیە ڕەزیلیی پیاو تەنها لە سنووری شتە ماددییەکاندا قەتیس نامێنێت، بەڵکوو دواجار ئەو ساردوسڕییەی کە لە پەیوەندی نێوان ژنومێرددا دروست دەبێت، دەرەنجامی ئەو ڕەزیلی و مشتقوچاوییەیە، خۆزگە ئێمە ئەگەر بۆ ساتێکیش بوایە بیرمان لەوە بکردایەتەوە ئەم سەروەت و سامانەی کە ئێمە پاسی دەکەین و ترسمان هەیە لە کەمی بدات ڕۆژێک دێت بەجێی دێڵین و هیچی لەگەڵ خۆماندا نابەین، چونکە کفنەکان گیرفانیان نییە!

ماوەتەوە ئامۆژگارییەکی ئافرەتان بکەین، ڕەنگە لێمان بپرسن ئێمە چۆن مامەڵە لەگەڵ مێردە ڕەزیلەکانماندا بکەین؟

پسپۆڕانی بواری خێزان ئەم ئامۆژگارییانەی لای خوارەوە دەکەن:

- هەوڵ بدە بزانیت هۆکاری ڕەزیلی پیاوەکەت چییە؟ هەندێک لە پیاوان چرووکن لەبەر ئەوەی لە ئامێزی دایک و باوکێکی ڕەزیلەوە پەروەردە بوون، هەر بۆیە ئەو جۆرە کەسانە ڕەزیلی بە ڕێگا ڕاست و دروستەکە دەزانن، دەبێ هەوڵی گۆڕینی ئەم بیروبۆچوونە بدەیت ئەگەرچی ئەمە کارێکی ئاسان نییە، بەڵام خۆ مەحاڵیش نییە، ئەمانە ئەگەر تێکەڵ بە خەڵکانی ئاسایی بکرێن، یان تێبگەیەنرێن ژیان بەبێ ڕەزیلیش هەر دەچێت بەڕێوە، ڕەنگە بێنە ژێر بار و گرفتەکە چارەسەر ببێت، هەوڵ بدە ژیانی کۆمەڵایەتیتان بەهێز بکەیت و پێکەوە سەردان و گەشت بکەن، بەڵام با لە سەرەتاوە گەشتەکانتان گەشتی کەم خەرجی بێت، ئەمە ڕێگاچارەیەکی ئەزموونکراوە و تا ڕادەیەکی باشیش گۆڕانکاری بەسەر پیاوانی چرووکدا هێناوە.

هەندێکی تر لە پیاوان هۆکاری ڕەزیلییەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لە ڕابردوودا ژیانی سەخت و کولەمەرگی زۆریان دیوە، بۆیە ئەو پارە و پوولەی دێتە بەردەستیان هەمووی لە ماڵەوە کەڵەکە دەکەن و دەستی بۆ نابەن؛ چونکە ترسی دووبارەبوونەوەی سیناریۆی ڕابردوویان هەیە، ئەم حاڵەتەیان لە حاڵەتی پێشوو سووکترە،

ئەمانە ئەگەر هەندێک قسەیان بۆ بکرێت دەربارەی پشتبەستن بە خوای گەورە و گومانی باشبردن پێی، هەروەها پێیان بوترێت ئەوەی لە ڕابردوودا ڕوویداوە مەرج نییە جارێکی تر دووبارە ببێتەوە، ئەمەی ئێستا خودا پێی داویت قەرەبوی ڕابردووە بۆتی کردووەتەوە، ئەگەر تۆ لە ڕابردوودا بە دەستی نەبوونییەوە ناڵاندبێتت، نابێ ئێستا تۆش هەمان تاڵاو بکەیت بە قوڕگی ماڵ و منداڵتدا!

- با پیاوەکەت ببینێت خۆت و منداڵەکانت چەندە بەختەوەر و دڵشادن کاتێک پێداویستییەکتان بۆ دەکرێت، ئەگەرچی شتێکی سادە و ساکاریش بێت، تەنانەت کەسی ڕەزیلیش دواجار مرۆڤە، کاتێک بەهۆی چاکەیەکیەوە دڵشادی و بەختەوەری لە ڕووخساری بەرامبەرەکەیدا بەدی دەکات و سوپاس و پێزانینی ئاراستە دەکرێت، ئەوە وای لێ دەکات ئەو چاکەیە دووبارە بکاتەوە، هەندێک جار دەنگدانەوەی کارێکی ئێمە لە لای ئەوانی تر پاڵمان پێوە دەنێت بۆ ئەوەی ئەو کارە دووبارە و چەند بارە بکەینەوە!

- دەستی بگرە و لەگەڵ خۆتدا بیبە بۆ بازاڕ با بە چاوی خۆی گرانی نرخی شتومەکەکان ببینێت، ئێمە هەندێک لە پیاوان بە ڕەزیل دەزانین، بەڵام لە ناوەڕۆکدا وا نین، ئەو کەسەی خۆی بۆ خۆی شتومەک ناکڕێت وا دەزانێت نرخەکان هەر لە شوێنی خۆیاندان و گۆڕانکارییان بەسەردا نەهاتووە، کاتێک بە دیار چاویەوە شتومەک دەکڕیت و دوکان بە دوکان دەکەیت بۆ ئەوەی هەرزانترت دەست بکەوێت ئەو کات دەزانێت تۆ چەند بە تەنگ بەفیڕۆنەدانی سامانەکەی ئەوەوەیت و بازاڕکردنی تۆش هیچ کات تەخشان و پەخشانکردنی پارە و پولی ئەو نییە، هەندێک جار هەڵە لە دەستنیشانکردنی گرفتەکەدا ڕوودەدات، وا دەزانین هۆکاری گرفتەکە ڕەزیلییە کەچی شتێکی ترە!

- نەبوونی دیالۆگ لەنێوان ژن و پیاودا، یان دابەشکردنی ئەرکەکان بە شێوەیەکی وا هیچ لایەکیان کاریان بە کاری ئەوی تریانەوە نەبێت، ئاماژەیە بۆ ئەوەی ڕژدی و ڕەزیلییەک لێرە و لەوێ بوونی هەیە، پێکەوە دانیشن و شەنوکەوی داهات و خەرجییەکانتان بکەن، هەندێک جار هەموو پێداویستییەکانی ماڵ ئافرەت دەیانکڕێت

و ئەگەر داوای برە پارەیەکیش بکات، ڕەنگە مێردەکەی بە زۆری بزانێت، چونکە نازانێت چۆنی خەرج دەکات و بە چیی ئەدات، بۆ دەبێت ژن و پیاو لە بەڕێوەبردنی کاروباری ماڵدا هێندە بێئاگا و دابڕاو بن لە یەک، مادام ئەوان شەریکی ژیانن، پێویستە پێکەوە نەخشە بکێشن و پێکەوەش خەرج بکەن!

- جاری وا هەیە ئێمە هەڵسەنگاندنەکانی خۆمان دەکەین بە پێوەر و لەسەر ئەو بنەمایە بڕیاری چاک و خراپ بەسەر ئەم و ئەودا ئەدەین، ڕەنگە خوی ڕەزیلی لە پیاوەکەدا بوونی هەر نەبێت، گرفتەکە لەوەدایە ژنەکە دەستبڵاوە!

بۆ نموونە ئەو کەسانەی شوێنە بەرز و بڵندەکان بە شوێنێکی دڵڕفێن و ئارامبەخش دەزانن ڕەنگە بڕیاری ترسنۆکی بدەن بەسەر ئەوانەدا کە سامیان لە شوێنە بڵندەکان هەیە! ئەو کەسەی کە چێژ لە ڕاوەماسی دەبینێ نازانێ هەوادارێکی یاری تۆپی پێ چەندە چێژ لەو یارییە دەبینێ!

مەبەستەکە ئەوەیە بۆ هەڵسەنگاندنی شتەکان نابێت ئێمە خۆمان بکەین بە پێوەر، هەرچی لەگەڵ بیرکردنەوە و حەزی ئێمە گونجا ئەوە تەواوە و هەرچیش نەگونجا، ئیتر ئەوە بێکەڵکە، هەندێک جار گرفتەکە لە خودی خۆماندایە نەک بەرامبەر!



## به شانوباڵی خۆتدا هەڵمەڵێ!

ئەفسانەیەک هەیە دەڵێت: نارسیس کە لە هەموو جیهاندا ناوبانگی هەیە و ڕاوچییەکی خەڵکی سیسیبیا بووە، کابرایەکی هەتا بڵێی جوانخاس و پێکەوتوو بووە، بەڵام لەبەر ئەوەی لەو سەردەمەدا ئاوێنە نەبووە تا ڕووخساری خۆی ببینێت، نەیزانیوە هێندە جوان و دڵڕفێنە، تا ڕۆژێک بە دەم ڕاوکردنەوە ڕێی دەکەوێتە سەر دەریاچەیەکی مەنگ، دادەنەوێتەوە بۆ ئەوەی هەردوو مشتی پڕ بکات لە ئاو و بیخواتەوە، لەو کاتەدا وێنەی خۆی لەناو ئاوەکەدا بەدی دەکات، زۆر سەرسامی جوانی خۆی دەبێت تا ئەو ئاستەی دەنوسێت بە شوێنەکەی خۆیەوە و ناتوانێت لە جێگای خۆیدا بجووڵێ، بە سەرسامییەوە لە ڕووخساری خۆی دەڕوانێت و چاوی لێ کلا ناکات هەتا ئەو کاتەی گیانی دەسپێرێت!

ئەم ئەفسانە بۆ ماوەی چەند سەدەیەک لە دووتوێی کتێبە یۆنانییەکاندا بە شاراوەیی مابوویەوە تا ئەو کاتەی فرۆید هات و توانی لە ئەم ئەفسانەیەوە یەکێک لە بیردۆزەکانی خۆی لە زانستی دەروونناسیدا هەڵێنجێ و ناوی لێ بنێ گرێی نارسیسی، بە کورتی ئەم گرێی نارسیسیە هەروەک لە ئەفسانەکەوە دەردەکەوێت بریتیە لەوەی مرۆڤ زیاد لە پێویست بە خۆی سەرسام ببێت، تا ئەو

ئاستەی جگە لە خۆی کەسی تر نەبینێت! بە پێناسەیەکی کورت و پوخت تر بریتیە لە گرێوگۆڵی لەخۆباییبوون!

ئەگەر ئەم ئەفسانە باس لە خۆهەڵکێشانی مرۆڤ بکات بە هۆی قۆزی و جوانیی ڕووخسارییەوە ئەوا من هەر لە سەرەتاوە مەبەستم ئەم جۆرە لە خۆهەڵکێشان نەبووە، بەڵکوو مەبەستەکەم جۆرێکی ترە لە خۆهەڵکێشان و نارسیسیەت، ئەویش شانازیکردنی پیاوە بەوەی لە ڕابردوودا ئەزموونی زۆری لەگەڵ ئافرەتاندا هەبووە و توانیویەتی چەندین پەیوەندی سۆزداریشیان لەگەڵیاندا ببەستێت، زۆرێک لە پیاوان دەیانەوێت لە ڕێی گێڕانەوەی پەیوەندییە سۆزدارییەکانیانەوە خۆیان وەک پاڵەوان پیشان بدەن و بیسەلمێنن شانسیان لە ئافرەتان هەیە و دەتوانن بە ئاسانی بچنە ناو دڵیانەوە!

ڕەنگە کەسێک پرسیار بکات و بڵێت: چۆن دەبێت تۆ لە سەر بنەمای ئەفسانەیەکی کۆنی یۆنانی حوکمێک بنیات بنێیت کە زادەی خەیاڵدانی مرۆڤە و لە زەمینی واقیعدا ڕووی نەداوە؟!

ئەمە قسەیەکی ڕاستە و تێبینییەکی بە جێیە، بەڵام لە هەمان کاتدا وەڵامەکەشی زۆر ئاسانە، ئەویش ئەوەیە هیچ کەس ناتوانێت نکۆڵی بوونی ئەم جۆرە پیاوانە لەناو کۆمەڵگادا بکات، بڕواش ناکەم کەسمان هەبێت ئەو جۆرە کەسانەمان نەدیبێت و پەیوەندییە سۆزدارییەکانی ڕابردووی خۆیانیان بە شانازییەوە بۆ نەگێڕابێتینەوە!

ئەم کەسایەتییە لەخۆباییانەی کە شانازی بە پەیوەندی سۆزداری ڕابردووی خۆیانەوە دەکەن لە هەموو کات و سەردەمێکدا هەر هەبوون، بەڕای من ئەم جۆرە کەسانە لەناو زۆربەی چین و

توێژەکانی کۆمەڵگادا هەن؛ چونکە ئەمە زیاتر پەیوەندی بە پێکهاتەی سایکۆلۆژیتی مرۆڤەوە هەیە نەک ئاستی ڕۆشنبیری و ئابووری، دەکرێ کەسی دەوڵەمەند یان هەژار، خوێندەوار یان نەخوێندەوار، پیاو یان ژن، شانازی بە پەیوەندی سۆزداری ڕابردووی خۆیەوە بکات، بەڵام ئەمە لە ئافرەتاندا زۆر کەمتر ڕوودەدات وەک لە پیاوان، ئەگەر لەناو ئافرەتانیشدا ڕووبدات ئەوە ئەو باسوخواسە تەنها پێش پرۆسەی هاوسەرگیریی دەکرێت و دوای ئەو پرۆسەیە ئەو کەیسە بە یەکجاری دادەخرێت، بەڵام پیاوان بە پێچەوانەوەن و هەرگیز ناتوانن واز لە بالۆرەی توانای ڕاکێشانی سەرنجی ئافرەتان بەلای خۆیاندا بێنن تەنانەت دوای هاوسەرگیریش، جاروباریش ئەمە دەدەن بە گوێی هاوسەرەکانیاندا، کە من زۆر مەبەستمە لە سەر ئەم خاڵە ڕابوەستم و ئەم شێوروێوییەشم هەر بۆ ئەوە بوو!

بۆ ئەوەی ئەم بیرۆکەیە بەزیندوویی بهێڵینەوە و بیخەینە بواری پراکتیکەوە نموونە بە شاعیری هەستناسکی عەرەب عومەری کوڕی ئەبی ڕەبیعە دێنینەوە کە شیعرەکانی لێوانلێون لە نارسیسیەت، ئەم دیاردەیە لەناو شیعری عەرەبیدا سەرەتاکەی لە ئەم شاعیرەوە دەستی پێ کرد، ئەوەندەی من بزانم شاعیرەکانی تری عەرەب لەم جۆرە شیعرەیان نەهۆنیوەتەوە، تەنها کەمێک لە شیعرەکانی امریء القیس نەبێت ئەویش تەنها حاڵەتە و وەک شیعرەکانی عومەری کوڕی ئەبی ڕەبیعە نەبوونەتە دیاردە هەتا هەڵوێستەیان لە سەر بکرێت، عومەر لە زۆربەی شیعرەکانیدا بە شانوباڵی خۆیدا هەڵدەڵێ نەک ئافرەتان! ئەگەر جارێکیش باسی ئافرەتان بکات بۆ ئەوە باسیان دەکات بڵێت ئەوە ئەوانن عاشق و خولیای منن نەک من شەیدا و هۆگری ئەوان بم! ئەو زیاتر خۆی وەک مەعشووق پیشان دەدات نەک عاشق، ئەم جۆرە لە شیعری دڵداری پێشتر عەرەب بە خۆیەوە نەدیوە!

هاوچەرخانی ئەم شاعیرە هەر لە سەرەتاوە تێبینی ئەم خاڵەیان لە شیعرەکانیدا کردووە، بۆیە جارێک ئەم شاعیرە دوای ئەوەی شیعرێکی دڵداری دەخوێنێتەوە ابن أبی عتیق پێی دەڵێت: تۆ شیعرت بە باڵای یارەکەتدا نەوت، بەڵکوو بە شانوباڵی خۆتدا هەڵدا، لە جیاتی ئەوەی بڵێیت: پێم وت، دەڵێی: پێی وتم!

نموونەی بەخۆداهەڵگوتن لە شیعری ئەم شاعیرەدا گەلێک زۆرە، بەڵام ئێمە تەنها دوو نموونە دێنینەوە بۆ ئەوەی زۆر لە مەبەستەکە دوور نەکەوینەوە!

عومەر دەڵێت:

أومت بعينيها من الهودج

لولاک هذا العام لم أحجج

أنت إلى مكه أخرجتني

لو تركت الحج لم أخرج

واتە: یارەکەم لە کەژاوەکەیەوە بە چاوەکانی ئاماژەی بەوە کرد ئەگەر تۆ نەبوویتایە ئەمساڵ من حەجم نەدەکرد، تۆ بوویت منت بەرەو مەککە راپێچ کرد، ئەگەر تۆ نەهاتیتایە بۆ حەج ئەوا منیش رێگای حەجم نەدەگرتەبەر.

ئەو دەیەوێت لە رێی ئەم شیعرە دڵدارییەوە چیرۆکێکمان بۆ بگێڕێتەوە، یارەکەی هاتووە بۆ حەج تەنها مەبەستی بینینی ئەم بووە و هیچی تر، ئەگەر بیزانیایە کە ئەم نایەت بۆ حەجی ئەمساڵ ئەوا ئەویش ئەم رێگە دوورەی نەئەدایە بەر خۆی، ئەمە ئەو نارسیسیەتەیە کە لە کەسایەتی ئەم شاعیرەدا رەنگی داوەتەوە، دەیەوێت وا پیشان بدات دۆستەکەی ئەوەندەی ئەمی دەوێت ئەوەندە خودای ناوێت!

لە شیعرێکی تردا دەڵێت:

بيها ينعتنني أبصرنني
دون قيد الميل يعدو بي الأغر
قالت الكبرى أتعرفن الفتى؟
قالت الوسطى: نعم هذا عمر!
قالت الصغرى وقد تيمتها
قد عرفناه وهل يخفى القمر

واتە: لەو کاتەدا کە ئەو سێ دەستەخوشکە پێکەوە دانیشتبوون و باسوخواسی جوانیی منیان دەکرد، لە پڕ لە دووری میلێکەوە کە بە سواری ئەسپە مارۆکەمەوە بە خێرایی بەرەوڕووی ئەوان دەهاتم بەدییان کردم، کە نزیک بوومەوە خوشکە گەورەکەیان پرسی: ئەرێ ئەم گەنجە جوانە ئەناسن؟ ناوەنجییەکە وەڵامی دایەوە: بەڵێ ئەوە عومەرە، بچووکەکەش وتی: ئەی چۆن نایناسین، بۆچی مەگەر مانگ لە شەوی ساماڵدا بزر دەبێت؟ بە خوا بە جوانییەکەی تەواو شێت و شەیدای خۆی کردووم.

کەس نازانێت ئەم شاعیرە چۆنی زانی ئەم سێ خوشکە دانیشتوون و باسی ئەو دەکەن؟ دیارە لەبەر جوانییەکەی هەمیشە جێگەی قسەوباسی ئافرەتان بووە، پاشان وەک دێوی ناو چرا جادووییەکە مل دەنێت بەرەو لایان بۆ ئەوەی درێژە بە هۆنینەوەی شیعرەکەی بدات و دەست بکات بە پیاهەڵدانی خۆی، هەموویان دەیناسن، ناوەنجییەکە دەڵێت: ئەی چۆن نایناسین؟ مەگەر ئەوە عومەر نییە؟ بچووکەکەش شێت و شەیدای بووە و پێی وایە مانگێکە و ئەدرەوشێتەوە!

ئەمەوێت زانیارییەکت دەربارەی ئەم شاعیرە پێ ڕابگەیەنم، هەرچەند هیچ پەیوەندییەکی بە ناوەڕۆکی ئەم کتێبە و تەنانەت ئەو قسانەشەوە نییە کە تۆزێک پێش ئێستا لەسەر ئەم کابرایە

کردمان، بەڵام لەبەر پاراستنی ئەمانەتی زانستی دەیخەمە ڕوو، مادەم ئێمە ئەم شاعیرەمان تۆمەتبار کرد بەوەی کە کەسێکی نارسیسیە و بە شانوباڵی خۆیدا هەڵدەڵێ، ئەگەرچی ئەمە ناچێتە خانەی تۆمەتبارکردنەوە، بەڵکوو ئەمە دەرەنجامی لێکۆڵینەوەیە لە شیعرەکانی ئەم شاعیرە، وەک عەرەب دەڵێن: (من فمک أدینک)، واتە: لە زاری خۆتەوە سەرکۆنەت دەکەم!

عومەری کوڕی ئەبی ڕەبیعە لە کاتی سەرەمەرگیدا هەر دوعای دەکرد و دەپاڕایەوە خودا ڕەحمی پێ بکات و لێی خۆش بێت، پێیان وت: ئاخر تۆ تازە دوای چی داوای لێخۆشبوون ئەکەیت؟

دەستی برد بۆ شەرواڵەکەی و وتی: سوێند بە خوا هێشتا دۆخێنی حەرامم نەکردووەتەوە، ئەوەی هەمبووە تەنها قسەی خۆش بووە و هیچی تر!

(دیارە ئەویش وەک شێخ ڕەزای خۆمان هەر بوختانی بۆ خۆی کردووە).

لە هەموو ئەمانە گرنگتر ئەوەیە ئێمە بێین ئەوە پشتڕاست بکەینەوە کە هەندێک کەس هەن چێژ لەوە دەبینن باسی ئەزموونی پەیوەندی سۆزداریی ڕابردووی خۆیان بۆ خەڵکانی تر بکەن!

بەڵام ڕاستییەک هەیە زۆربەی پیاوان لێی بێئاگان، ئەویش ئەوەیە شانازیکردن و باسکردنی پەیوەندی دڵداری ڕابردوو گەلێک ئازاری ژن ئەدات، ئەگەرچی پیاو لەم باسکردنەدا مەبەستی ئازاردانی هاوسەرەکەی نەبێت، بەڵام خۆ نیەتی باش کاری چەوت ڕێک ناکاتەوە!

جوامێری و پیاوەتی وا دەخوازێت هەر بە گەشتنی پیاو و ژن بە یەکتری، ئیتر لاپەڕەکانی ڕابردوو دابخرێن، ئەو ئێستا هاوسەر و

نامووس و دایکی منداڵەکانی تۆیە، ئاوڕدانەوە لە ڕابردوو ئەگەرچی هەر تەنها بە قسەش بێت، یاخود بۆ شانازی و خۆهەڵکێشان بێت، کاریگەرییەکی خراپ لەسەر دەروونی ئافرەت بەجێ دێڵێت، ئەو هەستە تاڵەی لە لا دروست دەکات کە ئەم بەس نییە و نەیتوانیوە ڕابردوو لە بیری مێردەکەی بباتەوە!

سەیرە! ئەو پیاوانەی شانازی بە پەیوەندی خۆشەویستی پێش هاوسەرگیری خۆیانەوە دەکەن، بە هیچ جۆرێک قسەی لەو شێوەیە لە هاوسەرەکانیان قبووڵ ناکەن، خۆ ئەگەر جارێک باسێکی پەیوەندی سۆزداری ڕابردووی خۆیان بکەن، ئەوا جگە لە تەڵاق و جیابوونەوە، نابێت چاوەڕوانی هیچ بژاردەیەکی تر لە مێردەکانیان بکەن؛ چونکە پیاو ئەوە بە سووکایەتی و بێڕێزیکردن بەرامبەر بە خۆی دەزانێت، باشە بۆ ئێمەی پیاوان ڕێگە نادەین هەندێک قسەوباس کە ئازارمان ئەدات لە زاری هاوسەرەکانمانەوە ببیستین، کەچی خۆمان دێین پەیوەندییە سۆزدارییەکانی ڕابردوو وەک قارەمانێتی ئەدەینەوە بە گوێی ئەواندا و بەمەش برینێکی قووڵ لە دڵ و دەروونیاندا دروست دەکەین؟

ڕابردوو بۆ لەبیرچوونەوەیە، ئەگەر نەشتوانی بۆ شاردنەوەیە، نەک بۆ شانازی و خۆهەڵکێشان، وەک چۆن تۆی پیاو پێت خۆشە هەست بە خاوەندارێتی جەستە و هەست و نەست و تێڕوانینی هاوسەرەکەت بکەیت، بە هەمان شێوە ئافرەتیش پێی خۆشە هەست بەوە بکات تەنها خاوەندارێتی لە جەستەی پیاوەکەی ناکات، بەڵکوو لەناو قووڵایی دڵ و دەروونیشیدایە، تامەزرۆیی پیاو بۆ ڕابردوو ئەو هەستە ناخۆشە لە لای ئافرەت دروست دەکات کە ئەم ئەڵتەرناتیڤێکی باش نەبووە بۆ ئەو ڕابردووە جوانەی کە مێردەکەی بە تاسەوە باسی لێوە دەکات و خۆزگەی بۆ دەخوازێت!

لە هەمووی خراپتر ئەوەیە هەندێک لە پیاوان هەن چیرۆکی درۆینەی دڵداری بۆ خۆیان دادەتاشن، وا دەزانن لەم ڕێگەیەوە دەتوانن هاوسەرەکانیان بترسێنن و ئەو پەیامەیان پێ بدەن کە: ئەگەر لە ڕابردوودا توانیبێتم سەرنجی ئافرەتان بە لای خۆمدا ڕابکێشم ئەوا ئێستاش هەمان توانا و وزەم بۆ ئەو کارە تێدایە!

بەهەرحاڵ، شانازیکردن بە پەیوەندیی سۆزدارییەوە ڕووی دابێت یاخود نا، شوێنەوارێکی خراپ لەسەر دڵ و دەروونی ئافرەت بەجێ دێڵێت، کە ئەویش بریتییە لە بێمتمانەیی، هەمیشە هەست بە مەترسی هەڵوەشاندنەوەی ژیانی ژنومێردایەتی خۆی دەکات هەر کە یارە کۆنەکەی کە بە عەزرەتەوە باسی دەکات سەری هەڵدایەوە، یان توانی پەیوەندی نوێی خۆشەویستی دروست بکاتەوە، کاتێک چیرۆکێکی ئەوینداری خۆتی بۆ دەگێڕیتەوە وا نەزانیت تەنها چیرۆکێکی مردووی ڕابردووت بۆ گێڕاوەتەوە، بەڵکوو هاتوویت جۆری کەسایەتی خۆتت پیشان داوە، نەهاتووی مێژووی ژیانی خۆتی بۆ بگێڕیتەوە، بەڵکوو هاتووی کار و پڕۆژەی داهاتووی خۆتت خستووەتە بەردەستی!

کارکردن بۆ پتەوکردنی پەیوەندی ژیانی ژنومێردایەتی ئەرکی ژن نییە بە تەنها، بەڵکوو ئەرکی هەردوو لاتانە پێکەوە، مەل بە تەنها باڵێک نافڕێت، قەیچی (مقص) بە تەنها شفرەیەک کوتاڵ نابڕێت، چەپڵە بە دەستێک لێنادرێت! تۆش بە هەمان شێوە بەرپرسیت لە توندوتۆڵکردنی ئەو پەیوەندییە و هیچ منەت و ماڵاواییەکیشی بەسەردا مەکە، چونکە ئەمە ئەرکی سەر شانتە، هەوڵ بدە لە ئێستادا بژیت، ڕابردوو مەگوێزەرەوە بۆ ئێستا، ڕابردوویەکیش دروست مەکە کە تیایدا نەژیابیت!



## ڕابردووی خۆت بۆ خۆت...
## ڕابردووی خۆی بۆ خۆی

ئیمامی شەعبی عامر بن شراحیل الکوفی، کە یەکێکە لە گەورە پێشەوایانی تابعین و لە سەردەمی حوکمڕانی ئیمامی عومەردا هاتووەتە دنیاوە، کەسێکی شەرعزانە و چەندین فەرموودەی پێغەمبەریشی گێڕاوەتەوە، لەبەر توانا و لێهاتووییەکەیشی عومەری کوڕی عبدالعزیز لە سەردەمی خۆیدا کردی بە قازی، دەگێڕێتەوە: جارێک کابرایەک دێتە خزمەتی ئیمامی عومەر، دەڵێت: قوربان کچێکم هەیە لە سەردەمی نەفامیدا هاتووەتە دنیاوە، دوای مسوڵمانبوونی تووشی زینا و داوێنپیسی بووە، بەڵام هەر زوو پەشیمان بوویەوە، بۆ سڕینەوەی ئەو پەڵەیەش پەلاماری چەقۆی دا و هێنای بە ملی خۆیدا، تا من گەیشتمە سەری دەمارەکانی لاملی خۆی بڕی، ئیتر بەردەوام خۆم بە دەمییەوە بووم و چارەسەریم بۆ کرد هەتا هەرچۆنێک بوو چاک بوویەوە، ئێستاش تەوبەکارە و ڕووی لە قورئانخوێندن و نوێژکردن کردووە، وا ئەمڕۆ خوازبێنیکەرانی هاتوون، جا نازانم لە ڕابردووی کچەکەم ئاگاداریان بکەمەوە، یاخود نا؟

ئیمامی عومەریش بە کابرای فەرموو: بەتەمایت ئەوەی خودا بۆی پۆشیوە هەڵیماڵیت؟ سوێند بە خوا بیبیستمەوە کەتنی کچەکەت

بۆ باس کردوون ئەتکەم بە پەندی زەمانە! بچۆ کچەکەتیان بدەری بە نرخی هەر ئافرەتێکی تری مسوڵمانی داوێنپاک!

بە هەوانتە پێغەمبەری خوا نەیفەرمووە: ئەگەر پێغەمبەر لە دوای من بهاتایە عومەر دەبوو!

لێرەوە ژیری و سەلیقەی بێهاوتای ئیمامی عومەر دەردەکەوێت، میهرەبانییە بێوێنەکەشی تەنها لە ڕەوشتی پێغەمبەراندا بەدی دەکرێت!

ئافرەتێک لە سەردەمی نەفامیدا هاوسەرگیریی کردووە، پاشان مێردەکەی لە دەست داوە، ئایا بەهۆی جیابوونەوەوە بووبێت، یاخود مردن، پاشان تووشی داوێنپیسی بووە، دواتر هێندە پەشیمان دەبێتەوە کە پەنا بۆ خۆسەربڕین دەبات، باوکی ئەگاتە سەری و شکست بە هەوڵەکەی دێنێت، دەرمانی بۆ بەکار دێنێت تا بە تەواوی چاک دەبێتەوە.پاشان تەوبەیەکی یەکجاری دەکات و دەبێتە ئەهلی قورئان و نوێژ، باوکی دێت پرسیار لە ئیمامی عومەر دەکات ئایا ئەوەی لە ڕابردوودا لە کچەکەی ڕوویداوە بۆ خوازبێنیکەرانی باس بکات یاخود نا! ئیمامی عومەریش بە تووڕەییەوە لێی دەپرسێت: باشە بە چ حەقێک نهێنییەک کە خوا پۆشیویەتی تۆ دێیت ئاشکرای دەکەیت؟ هەر بەوەشەوە ناوەستێت، بەڵکوو هەڕەشەی توندیشی لێ دەکات: ئەگەر نهێنی کچەکەی بدرکێنێت بە توندترین شێوە سزای دەدات، فەرمانی پێ دەکات وەک هەر ئافرەتێکی تری داوێنپاکی مسوڵمان بە مێردی بدات!

ئیمامی عومەر باش دەزانێت ڕابردووی ئەم ئافرەتە ئەگەر باس بکرێت ئێستا و داهاتووشی وێران دەبێت؛ بۆیە فەرمان بە شاردنەوەی دەکات!

وا ئێستا وردە وردە خەریکە دەگەینە شوێنی مەبەست و لە شێوەی پرسیاردا دەیخەینە ڕوو: ئایا پیاو و ژن ڕابردووی سۆزداریی خۆیان بۆ یەکتر بدرکێنن بۆ ئەوەی ڕاشکاو و بەرچاوڕوون بن بەرامبەر بە یەکتری، یان ئەوەی ڕۆیشت ڕۆشت و باشتر وایە هەر بە نهێنی بمێنێتەوە؟

پرسیاری دووەم: ئایا پیاو ئەو مافەی هەیە هەوڵ بۆ هەڵدانەوەی ڕابردووی هاوسەرەکەی بدات و ژێر بەڕە بهێنێتە سەر بەڕە؟ لە کاتێکدا باش دەزانێت ڕابردوو پێچراوەتەوە و جارێکی تر ناگەڕێتەوە، هاوژینەکەی باسی ڕابردووی خۆی ناکات و کاریگەریشی لەسەر ژیانی نەماوە، ئایا ژن ئەو مافەی هەیە بە پەرۆشەوە پرسیاری رابوردووی مێردەکەی لە هەموو ئەو کەسانە بکات کە ڕۆژێک لە ڕۆژان ناسیویانە و هەڵسوکەوتیان لەگەڵیدا کردووە، لە کاتێکدا پیاو باسی ڕابردووی خۆی ناکات و کاریگەریشی لەسەر ژیانی نەماوە؟

سەبارەت بە وەڵامی پرسیاری یەکەم:

زۆرجار مرۆڤ جا پیاو بێت یان ئافرەت پێش ژیانی هاوسەرگیری بە قۆناغی تێکەڵی و پەیوەندیکردندا تێدەپەڕێت، ئیتر جاری وا هەیە ئەم پەیوەندییە لە یەکتر ناسینێکی ئاسایی بۆ ماوەیەکی کورت و دیاریکراو تێناپەڕێت، جاری واش هەیە سەردەکێشێت بۆ خۆشەویستی بە ئامانجی هاوسەرگیری، بەڵام دواجار سەر ناگرێت، بێگومان ئەم جۆرە یادەوەرییانە لە سەرەتاوە زۆر بە بایەخەوە تەماشا ناکرێن، بەڵام دواجار دەبێتە یادگارییەک و بۆ هەتا هەتایە مرۆڤ لەگەڵیدا دەژی و ناتوانێت دەستبەرداری ببێت.

کاتێک مرۆڤ بە فەرمی دەچێتە ناو ژیانی هاوسەرگیرییەوە دەکەوێتە ناو قۆناغێکی نوێی ژیانەوە و دەبێت هەموو ئەزموونە شکستخواردووەکانی ڕابردوو لە بیر بکات، بەڵام پرسیاری گرنگ لێرەدا ئەوەیە ئایا پێویستە پیاو و ژن ڕاشکاو بن بەرامبەر بە یەکتر و باسی پەیوەندییە سۆزدارییەکانی پێش هاوسەرگیری خۆیان بۆ یەکتری بکەن؟ باشە ئەمە چ کاریگەرییەک لەسەر ژیانی ژنومێردایەتی و متمانەی نێوانیان دروست دەکات؟ ئایا ئەم ڕاشکاوییە متمانە زیاد دەکات یان دڵکرمین دەکات؟!

لە ڕاستیدا ئەوەندەی من بینیومە و بیستوومە و خوێندوومەتەوە خەڵک وەڵامی جیاواز و جۆراوجۆریان بۆ ئەم پرسیارە هەیە، هەندێک پێیان وایە ڕابردوو موڵکی خاوەنەکەیەتی و باسکردنی دەرگای بەدگومانی و دڕدۆنگی دەکاتەوە! ئەمە لە کاتێکدایە هەندێکی تر پێیان وایە ڕاشکاوی و هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی ڕابردوو ڕۆڵی کاریگەری هەیە لەسەر پتەوکردنی بنەمای متمانە لە نێوان ژنومێرددا!

من وەک خۆم ڕای یەکەمم لەلا پەسەندە، چونکە ئەم بابەتە بابەتێکی ماتماتیکی نییە تەنها یەک ئەنجام بدات بە دەستەوە و بەس، مەرج نییە هەر پیاوێک ڕاشکاوانە پەیوەندییە سۆزدارییەکانی ڕابردووی خۆی باس کرد، ئیتر هاوسەرەکەی متمانەی پێی زیاتر ببێت و لەوە تێبگات ئەوە ڕابردوویەک بوو کۆتایی هات و بڕایەوە، هەروەها مەرج نییە هەر ئافرەتێکیش باسی پەیوەندییە سۆزدارییەکانی ڕابردووی خۆی کرد ئیتر مێردەکەی لێی تێ بگات و باوەشی پیا بکات و سوپاسی بکات لەسەر ئەو ڕاشکاوییەی و پێی بڵێت: ئازیزەکەم ئەوەی تۆ باسی دەکەیت ڕابردوویەک بوو کۆتایی هات من ئێستا لە جاران زیاتر متمانەم پێت هەیە!

زۆر بە پێچەوانەوە ئەمە بابەتێکی میزاجییە نەک ماتماتیکی، میزاجی خەڵکیش ناتوانرێت پێشبینی بۆ بکرێت، بەڵکوو ئەوەی هەستی پێ دەکرێت و دەبینرێت ئەوەیە ئەم ڕاشکاوییە زۆرجار درز و کەلێن لە نێوان پەیوەندی ژنومێرددا دروست دەکات ئەگەر بە یەکجاری تێکیشی نەدات!

بۆیە بە پیاو دەڵێم: ڕابردووی خۆت بۆ خۆت و ئاشکرای مەکە، ڕابردووی هاوسەرەکەیشت با هەر بۆ خۆی بێت و بە شوێنیدا مەڕۆ!

بە ژنیش دەڵێم: ڕابردووی خۆت بۆ خۆت و ئاشکرای مەکە، ڕابردووی مێردەکەیشت با هەر بۆ خۆی بێت و بەدوایدا ڕامەکە!

بۆ ئەوەی قسەکەم بڕوا بە تۆی بەڕێز بهێنێت و بناغەیەکی تۆکمەشی هەبێت پێویستە پێکەوە ئەم چەند تێبینییە بخوێنینەوە:

١- کەس نەیگوتووە پیاو دەبێت کتێبێکی کراوە بێت لە بەردەم هاوسەرەکەیدا و لە بەرگەوە بۆ بەرگ پەڕەکانی ژیانی هەڵبداتەوە، ژنیش بەهەمان شێوە ئەو کتێبە کراوە بێت لە بەردەست مێردەکەیدا، ئیتر ئەگەر وا نەبوون دیارە ئەم هاوسەرگیرییە هاوسەرگیرییەکی فشۆڵ و شکستخواردووە!

ئەمە پێچەوانەکەی ڕاستە، نەدرکاندن و پارێزگاریکردنی ژن و پیاو لە هەندێک شتی تایبەت بە خۆیان نەک تەنها لە سەر ئاستی نهێنییەکان، بەڵکوو لەسەر ئاستی ژیان بە شێوەیەکی گشتی یەکێکە لە گرنگترین هۆکارەکانی سەرکەوتنی ژیانی ژنومێردایەتی!

کاتێک ژن لە کۆبوونەوەیەکی خێزانی ماڵە خەزوورانیدا ئامادە دەبێت، بە هەڵوێستێکی دایک یان خوشکی مێردەکەی قەڵس و بێزار دەبێت، بەڵام خۆی دەخواتەوە و هیچ ناڵێت، کاتێکیش دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە ئەم باسوخواسە بۆ مێردەکەی ناگێڕێتەوە؛ چونکە دەزانێت

دایک هەر بە دایکی دەمێنێتەوە ئەگەر هەرچییەکیش ڕوویدابێت، خوشک هەر بە خوشکی دەمێنێتەوە ئەگەر هەر هەڵوێستێکیشی نواندبێت، ئەو ناتوانێت دەستبەرداری دایک و خوشکی خۆی ببێت و ئاسانیش نییە دادوەری لە نێوانیاندا بکات، بۆیە هەڵوێستی ئەم تەنها دان بەخۆدا گرتنە، سەرەڕای بێزاری و دڵتەنگییەکەیشی، ئەم کارەی ئەم ئافرەتە دەیکات تەنها شاردنەوەی نهێنی نییە، بەڵکوو ئەمە سەلیقە و ژیری ئەو ئافرەتە پیشان ئەدات کە دەزانێت چۆن هەڵسوکەوت بکات و چۆنیش پارێزگاری لەماڵەکەی خۆی بکات!

لە بەرامبەریشدا کاتێک پیاو هەڵوێستێکی ماڵە خەزوورانی قەڵس و بێزاری دەکات، بەڵام لەبەر خاتری هاوسەرەکەی چاوپۆشی لێدەکات و ناشیداتەوە بە ڕوویدا، ئەوە ئەم پیاوە بەم کارەی نەهاتووە بەربەستێک لە نێوان خۆی و هاوژینەکەیدا دروست بکات و نهێنی لێ بشارێتەوە، بەڵکوو بەم کارەی پارێزگاری لە پردی پەیوەندی نێوان خۆی و هاوسەرەکەی دەکات!

تەماشا دەکەیت هەندێک جار وا باشترە تەنانەت هەڵسوکەوتی ژیانی ڕۆژانەش بشارێتەوە چجای ژیانی ڕابردوو!

کەواتە دەکرێت پەیوەندی ژنومێردایەتیتان لە ئەوپەڕی بەهێزیدا بێت و پەرتووکی ژیانیشتان هەندێک لاپەڕەی تێدا بێت هیچ لایەکتان نەیخوێننەوە، هەندێک شت هەیە نەزانینی زیانی زۆر کەمترە لە زانینی، ڕابردووی هەریەک لە ژنومێرد پەیوەندی بە خودی خۆیانەوە هەیە؛ بۆیە وا باشترە پارێزگاری لێبکەن و ئەوەی خودا بۆی پۆشیون ئەمان بەدەمی خۆیان ئاشکرای نەکەن!

٢- کێ گوتوویەتی دەبێت شتە شاراوەکانی نێوان خۆمان و خودا بۆ دەوروبەرمان ئاشکرا بکەین؟! ئەمە پێچەوانەکەی

ڕاست و دروستە، نابینیت دەستگیرۆییکردنی هەژاران بە شێوەی نهێنی و دوور لە چاوی خەڵک دەبێتە هۆی ئەوەی لە دواڕۆژدا لەژێر سێبەری بارەگای عەرشی خوادا جێگەت ببێتەوە، وەک لە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتووە (ورجل تصدق بصدقه فأخفاها فلا تعلم شماله ما أنفقت يمينه)

واتە: یەکێک لەوانەی لەژێر سایە و سێبەری بارەگای عەرشی خوادا جێگایان دەبێتەوە، کەسێکە دەستگیرۆیی هەژارێک بکات بە پەنامەکی، دەستی چەپی نەزانێت دەستی ڕاستی چی بەخشیوە!

مەگەر لە فەرموودەیەکی تریشدا نەهاتووە: ئیماندار بە شەونوێژکردن پلەوپایەی لای خودا بەرز دەبێتەوە؟ بەڵێ ئەو نوێژەی لە نیوەشەودا و دوور لە چاوی خەڵک ئەنجامی ئەدەیت پلەوپایەت پێی بەرز دەبێتەوە، هیچ زیانێکت پێ ناکەوێت ئەگەر خواپەرستییەکانت بە نهێنی و دوور لە چاوی خەڵک ئەنجام بدەیت، بەڕای من گرفتەکە لەوەدایە بە دیار چاوی خەڵکەوە پێی هەڵبستیت، چونکە ڕییا و ڕووپامایی کاتێک دروست دەبێت کە چاوی خەڵکت لەسەر بێت!

لە بەرامبەردا پێغەمبەری خوا دەفەرموێت:

(كل أمتي معافى إلا المجاهرين، وإن من المجاهرة أن يعمل العبد بالليل عملا ثم يصبح قد ستره ربه، فيقول: يافلان قد عملت البارحه كذا وكذا، وقد بات يستره ربه، ويصبح يكشف ستر الله عليه)!

واتە: ئومەتەکەم هەموویان بەر لێبووردنی خوا دەکەون، ئەوانەیان نەبێ کە نهێنی خۆیان هەڵدەماڵن، وەک ئەوەی کابرایەک لە شەودا کارێکی خراپ دەکات، خودا بۆی دەپۆشێت، کە چی بۆ بەیانی کابرا بە دەمی خۆی ئاشکرای دەکات و دەیگێڕێتەوەو دەڵێ: دوێنێ شەو وام کرد و وام کرد، خودا بە شەو گوناه و نەنگییەکەی

بۆ دەپۆشێ کەچی بە ڕۆژ پەردە لە سەر شوورەییەکەی خۆی هەڵدەداتەوە!

ئای لەو میهرەبانییە! بەندە لەژێر فشاری حەز و ئارەزووەکانیدا خۆی پێناگیرێت و دەکەوێتە ناو هەڵە و تاوانەوە، خوداش بە میهرەبانی و بەخشندەیی خۆی بۆی دەپۆشێت و لێشی خۆش دەبێت بەو مەرجەی نەیەت ئاشکرای بکات و شانازی پێوە بکات، بەڵام هەر ئەوەندەی درکاندی و باسی کرد بۆ ئەم و ئەو ئیتر هەر بە ئەوە خۆی دەخاتە دەرەوەی لێبووردنی خواییەوە!

ئێمە ئەگەر بە شاردنەوەی کاروکردەوە چاکەکانمان پاداشتی زیاتر دەست بخەین، ئەوا بە شاردنەوەی گوناه و تاوانەکانمان خۆمان دەخەینە بەر لێبووردنی خواییەوە، چ پێویست دەکات پەردە لە سەر ڕابردووی ڕەشی خۆمان هەڵبدەینەوە، بۆ بچینە ناو وردەکارییەکانی ژیانی ڕابردوومانەوە، هەرچیمان کردبێت بە باش و خراپیەوە باسی بکەین؟! با نهێنییەکانی ڕابردوومان تەنها لە نێوان خۆمان و خوادا بێت و بەس؛ چونکە خودا چاپۆشیمان لێ دەکات و لێمان خۆش دەبێت، بەڵام خەڵک هەردەم باسی دەکەن و بیریان ناچێتەوە!

٣- پەیوەندی هاوسەرگیری پەیوەندییەکی پیرۆزە، ئەم پەیوەندییەش لە ساتی گرێبەستی هاوسەرگیرییەوە دەکەوێتە کارەوە و هەریەکەیان دەبێتە موڵکی ئەوی تریان ئەگەر ئەم دەستەواژەیە دروست بێت، بەڵام پێش گرێبەستی هاوسەرگیری و پێش ئەوەی بێنە ناو ژیانی یەکترییەوە، هەریەکەیان خاوەندارێتی لە ڕابردووی خۆیان دەکەن و هیچ لایەکیان مافیان نییە ڕابردووی ئەوی تریان

هەڵبداتەوە؛ چونکە ئەمە دەستێوەردانە لە شتێکدا کە دوور و نزیک پەیوەندی بە ئەوەوە نییە.

یەکێک لە یاساکانی میرات لە شەریعەتی ئیسلامدا ئەوەیە: ئەگەر کوڕێک مرد و باوکی لە ژیاندا بوو ئەوا کاتێک باوکەکە دەمرێت کوڕە مردووەکە میرات لە باوکی نابات، هۆکارەکەش ئەوەیە میرات بەشی زیندووە نەک مردوو، پەیوەندییە سۆزدارییەکانی پێش هاوسەرگیریش وەک مردنی ئەو کوڕە وایە لە ژیانی باوکیدا، وەک چۆن ئەو مافی نییە میرات لە باوکی بگرێت ژنومێردیش مافی هەڵدانەوەی ڕابردووی یەکتریان نییە!

نموونەیەکی ئاسانتر و نزیکتر لە واقیعەوە:

تەلەفیزیۆنێک لە ماڵەکەتدا هەیە دەتەوێت بیفرۆشیت، کڕیار دێت و لەسەر نرخەکەی ڕێک دەکەون و پێی دەفرۆشیت، دوای هەفتەیەک بڕیار ئەدەیت خانووەکەشت بفرۆشیت بە هەموو کەلوپەل و پێداویستییەکانی ناوییەوە، ئایا ئەم کڕیارە نوێیە مافی ئەوەی هەیە داوای ئەو تەلەفیزیۆنە بکات کە هەفتەی ڕابردوو بە کەسێکی ترت فرۆشتووتە؟!

نەخێر بۆی نییە، چونکە فرۆشتنی تەلەفیزیۆنەکە مامەڵەیەکی کۆنترە و پێش هاتنی ئەم کڕیارە نوێیە کۆتایی هاتووە، هەر لە بنەڕەتەوە تەلەفیزیۆن لەناو ئەم مامەڵە نوێیەدا نەبووە!

ڕابردووی هەریەک لە ژن و پیاو ئەو تەلەفیزیۆنەیە کە پێشتر فرۆشراوە، هیچکامیان مافیان نییە داوای بکەن، ئەرکی هیچ لایەکیشیان نییە وەڵامی ئەو داواکارییە بدەنەوە!

هاوسەرگیری گرێبەستێکە بۆ ئێستا و داهاتوو نەک بۆ ڕابردووش، هەموومان دەبێت بە باشی ڕەچاوی ئەم خاڵە بکەین!

٤- وتمـان یەکێـک لـە ئـەو بنەمـا گرنگانـەی کـە هاوسـەرگیری لـە سـەر بەنـدە بریتییـە لـە متمانـە، ژن و پیـاو پێویستە لـە سـەریان هەڵوێسـت و هەڵسـوکەوتیان بـە جۆرێـک بێـت کـە متمانـەی نێوانیـان پتەوتـر بـکات، پێـم وانییـە هەڵدانـەوەی پەڕەکانـی ڕابـردوو فاکتەرێـک بێـت بـۆ چەسـپاندن و پتەوکردنـی متمانـەی نێوانیـان، بـە پێچەوانـەوە لـە باشـترین حاڵەتـدا ئاشـکراکردن و باسـکردنی ڕابـردوو هیـچ ئامانجێکـی لـە پشـتەوە نییـە جگـە لـە لادانـی پـەردە نەبێـت لەسـەر هەندێـک نهێنـی، ئەگـەر لـە بیرکردنـی ڕابـردوو بـە ورد و درشـتیەوە و ڕووکردنـە ژیانـی نـوێ متمانـە بەهێـز بـکات، پێچەوانەکەشـی هـەر دروسـتە، جـاری وا هەیـە باسـکردن و ئاشـکراکردنی ڕابـردوو بڕبـڕەی پشـتی هاوسـەرگیرییەکەتان دەشـکێنێت، بۆیـە بـۆ پارێزگاریکـردن لـە جوانـی ئێسـتایان پێویسـتە ڕابـردووی خۆیـان بشـارنەوە!

٥- ژنومێـرد ئەرکیـان بەرامبـەر بـە یەکتـری ئەوەیـە هەسـت و نەسـتی یەکتـر برینـدار نەکـەن، خـۆ مـرۆڤ تەنهـا گۆشـت و خوێـن نییـە، بەڵکوو هەسـت و سۆز و هەڵچوونیشـی هەیە، بۆیە باسـکردن و ئاشـکراکردنی پەیوەندییە سـۆزدارییەکانی ڕابردوو لـە جیاتـی ئـەوەی ببێتـە مایـەی دڵخۆشـکردن دەبێتـە هـۆی ئـازاردان و بریندارکردنـی هەسـت و نەسـتی بەرامبـەر!

کەواتـە شـاردنەوەی ڕابردوو تەنهـا لـە بەرژەوەندی خۆماندا نییـە، بەڵکـوو سـوودی بـۆ هاوسـەرەکانیشـمان هەیـە لـەو ڕووەوە تووشـی دڕدۆنگـی و بەدگومانیـان ناکەیـن!

٦. لە کۆتاییدا دوو پرسیار دەکەین:

پرسیاری یەکەم:

ئایان ئامانج لە درکاندنی نهێنییەکانی ڕابردوو چییە؟

- ئەگەر مەبەست لێی دڵسۆزی و دڵپاکی بێت، ئەوا دڵسۆزی و دڵپاکی دەبێت لە ژیانی ئێستادا بێت نەک لە ژیانی ڕابردوو، پێم نالێیت کارێک کە گوزەشت چۆن دەتوانیت تیایدا دڵسۆز بیت، پزیشکەکان لە نەخۆشخانەکاندا ڕوو لە ژووری بەفرگری تەرمی مردووان ناکەن بۆ ئەوەی برینەکانیان چارەسەر بکەن، بەڵکوو ڕوو لە ژووری نەشتەرگەری و بەشی ڕووداوە کتوپڕەکان دەکەن، مردوو تازە بووە بە ڕابردوو، هەرچی بۆ بکەیت بێسوودە، ئەبێت ئاگایان لە بریندارە زیندووەکان بێت، کەواتە درکاندن و پێڵێنانی پەیوەندییەکانی ڕابردوو بە هیچ شێوەیەک ناچێتە خانەی دڵسۆزییەوە!

- ئەگەر ئامانجەکە ئەوەیە بە هاوبەشەکەی ژیانت بڵێیت ئەوە ڕابردوویەک بوو کۆتایی هات، باشە کە ئەزانی کۆتایی هاتووە ئیتر بۆچی بۆی باس دەکەیت؟ خەڵک لە ژیانی ڕۆژانەیاندا نایەن باسی گرانبوونی نرخی نان بکەن لە ساڵی ڕابردوودا، بەڵکوو دێن باسی گرانبوونی نرخی سووتەمەنی دەکەن کە ڕووداوێکی نوێیە.

- خراپترین شت ئەوەیە ئامانج لە باسکردنی رابردوو شانازیکردن و خۆهەڵکێشان بێت پێیەوە! ئامان سەد ئامان نەخەڵەتابی کاری وا بکەیت؛ چونکە ئەوە تەنها هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی ڕابردوو نییە، بەڵکوو هەڕەشەیەکی شاراوەیە، ئەم بابەتە پێشتر قسەوباسمان لەسەر کرد و پێویست بە دووبارەکردنەوەی ناکات.

پرسیاری دووەم:

ئایا ژنومێرد مافیان هەیە هەوڵی کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر رابردووی یەکتری بدەن لەبەر ئەوەی بوون بە هی یەکتر؟

وابزانم لەناو وەڵامی پرسیاری یەکەمدا ناڕاستەخۆ وەڵامی ئەم پرسیارەشمان دایەوە، بەڵام بۆ ئەوەی بیرۆکەکە باشتر بچەسپێت، هەوڵ ئەدەین ڕوونتر وەڵامەکە بخەینە ڕوو: مادام تۆ هەست بەوە ناکەیت کە ڕابردوو بە زیندوویی لەناو دڵ و دەروونی هاوژینەکەتدا ماوەتەوە، ئەوا تۆش ڕۆڵی لێکۆڵەرە ئەمنی و دەزگا هەواڵگرییەکان مەگێڕە و هەوڵی کۆکردنەوەی زانیاری مەدە لەسەر ژیانی ڕابردووی؛ چونکە ئەوە دەچێتە خانەی سیخوڕیکردنەوە، بەڵێ ئەمە سیخوڕیکردنە، هەر هەوڵێک بۆ بەدەستهێنانی زانیاری لەسەر هەر کەسێک کە مافی کۆکردنەوەی زانیاریت نەبێت لە سەری تەنانەت ئەگەر هاوسەرەکەی خۆیشت بێت، دەچێتە خانەی سیخوڕیکردنەوە، بە تایبەتی مەبەستی تۆ لەم کارەدا ئەوەیە وەک کارتێکی فشار لە دژی بەکاری بهێنیتەوە، خوای گەورەش لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت (ولا تجسسوا)، واتە سیخوڕی بەسەر یەکەوە مەکەن.



## سەقفی چاوەڕوانییەکانت دابەزێنە

زۆرجار مرۆڤ دەبێتە قوربانی چاوەڕوانی و پێشبینییەکان، جا ئیتر چاوەڕوانی خۆی بێت لە خەڵکانی تر، یان بە پێچەوانەوە، ئێمە کاتێک سەقفی چاوەڕوانییەکانمان بەرز دەکەینەوە وا دەزانین وەک خۆی و بێ زیاد و کەم دێتە دی، بەڵام کاتێک دەبینین بەو شێوەیەی کە چاوەڕوانمان کردووە نایەتە دی ئیتر بێهیوایی باڵ دەکێشێت بە سەرماندا؛ بۆیە پێویستە سەقفی چاوەڕوانییەکانمان لە ئاستی مامناوەندا بێت؛ چونکە ئەگەر زۆر بەرزی بکەینەوە بە سەرماندا دەڕووخێت!

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەم بیرۆکەیە با پێکەوە ئەم چیرۆکە خەیاڵییە نوکتەئامێزە بخوێنینەوە:

لە یەکێک لە شارەکاندا مۆڵێک کرایەوە بۆ فرۆشتنی ژن، بۆ هەر پیاوێک هەبوو سەردانی ئەو مۆڵە بکات و ژنێکی باش بکڕێت و بیکات بە هاوسەری خۆی، بەڵام لە دەرگای چوونەژوورەوەی مۆڵەکەدا یاسایەک نووسرا بوو کە دەبوو کڕیارانی ناو مۆڵەکە پەیڕەوی لێ بکەن، یاساکەش بەم شێوەیەی لای خوارەوە بوو:

١. کڕیار لە ژیانیدا تەنها یەک جار بۆی هەیە سەردانی ئەم مۆڵە بکات.

٢. دەبێت بە پێی ڕیزبەندیی نهۆمەکان و لە نهۆمی یەکەمەوە دەست پێ بکات، ئەگەر ژنەکانی نهۆمی یەکەمی بە دڵ نەبوو دەتوانێ بچێت بۆ نهۆمی دووەم و سێیەم و هەر وەها...

٣. کڕیار هەر نهۆمێکی بەجێ هێشت و چووە نهۆمی سەرترەوە ڕێگەی پێنادرێت بگەڕێتەوە بۆ نهۆمی خوارتر.

یەکێک لەو گەنجانەی کە خوازیاری هاوسەرگیری بوو بیرۆکەی ئەم مۆڵەی زۆر لە لا پەسەند بوو، بۆیە بڕیاری دا سەردانی ئەم مۆڵە بکات بۆ ئەوەی ژنێکی باش دەستنیشان بکات و بیکاتە هاوسەری، لە دەرگای چوونەژوورەوە مەرجەکانی بە باشی خوێندەوە، ڕاستەوخۆ خۆی کرد بە نهۆمی یەکەمدا، لەسەر دەرگاکەی تایبەتمەندییەکانی ژنانی ناو ئەو نهۆمە نووسرابوون، کە بریتیبوون لەمانە: ژنانی ئێرە خاوەن کاری خۆیانن، هەروەها بڕواداریشن!

لە دڵی خۆیدا وتی: جا ئەمانە چ جیاوازییەکیان هەیە لەگەڵ ئافرەتانی دەرەوەدا، لە دەرەوەش ئافرەتانی خاوەن کار و بڕوادار گەلێک زۆرن، قەیناکا با بچم بۆ نهۆمی دووەم بەڵکوو ئافرەتانی ئەوێ تایبەتمەندی زیاتریان هەبێت، خۆی گەیاندە نهۆمی دووەم و بینی لەسەر دەرگاکەی نووسراوە ئافرەتانی ئێرە خاوەن کاری خۆیانن، بڕوادارن، مێردەکانیشیان خۆش دەوێت!

لە دڵی خۆیدا وتی: بەخوا ئەمانیش زۆر جیاوان نین، ئەم جۆرە ئافرەتانە لە دەرەوەش دەست دەکەون، با سەرێکی نهۆمی سێیەمیش بدەم بزانم لەوێ چ باسە؟ چووە نهۆمی سێیەم و بینی لەسەر دەرگاکەی نووسراوە: ئافرەتانی ئێرە خاوەن کاری خۆیانن، بڕوادارن، هاوسەرەکانیان خۆش دەوێت و جوانیشن!

لە دڵی خۆیدا وتی: وا دیارە هەتا بچیتە سەرەوە تایبەتمەندییەکان زیاد دەکەن، ئافرەتانی نهۆمی یەکەم تەنها خاوەن

کار و بڕوادار بوون، پاشان ئافرەتانی نهۆمی دووەم سەرەڕای ئەوانە مێردەکانیشیان خۆش دەویست، کە هاتمە نۆمی سێیەم جوانیش زیادی کرد، باشە بۆ نەچمە نهۆمی چوارەم؟ بەڵکوو ئافرەتانی ئەوێ باشتر بن، کاتێک چووە نهۆمی چوارەم دەبینێت لەسەر دەرگاکەی نووسراوە ئافرەتانی ئێرە خاوەن کاری خۆیانن، بڕوادارن، جوان و شۆخوشەنگن، نەک هەر مێردەکانیان بەڵکوو کەسوکاری مێردەکانیشیان خۆش دەوێت!

لە دڵی خۆیدا وتی: ئەم تایبەتمەندییانە یەکجار باش و سەرنجڕاکێشن، بەڵام بێگومان نهۆمی پێنجەم باشتری لێیە، سیاسەتی ئەم مۆڵە ئاوایە هەتا بچیتە سەرتر شتی باشتر دەبینیت، پێویست بە بیرکردنەوە ناکات با زوو خۆم بگەیەنمە نهۆمی پێنجەم! کە گەشتە نهۆمی پێنجەم ئەوەی پێشبینی دەکرد کتومت وا دەرچوو، تەماشا ئەکات لەسەر دەرگاکە نووسراوە: ئافرەتانی ئێرە خاوەن کاری خۆیانن، بڕوادارن، مێردەکانانیان خۆش دەوێت، جوان و شۆخوشەنگن، کەسوکاری مێردەکانیان خۆش دەوێت، بەشێک لە خەرجییەکانی ماڵیش لە ئەستۆی خۆیان دەگرن!

لە دڵی خۆیدا وتی: ئای خوایە ئەم ژنانەی ئێرە چەند ناوازە و تایبەتن! بەڵام با سەرکەوم بۆ نهۆمی شەشەمیش؛ چونکە هەمیشە باشتر لە سەرەوەیە، گەشتە نهۆمی شەشەم و لەسەر دەرگاکەی نووسرابوو: ئافرەتانی ئێرە خاوەن کاری خۆیانن، بڕوادارن، مێردەکانانیان خۆش دەوێت، جوان شۆخوشەنگن، بەشێک لە خەرجییەکانی ماڵ لە ئەستۆ دەگرن، ڕۆمانسیشن!

لە دڵی خۆیدا وتی: باشە تۆ بڵێی لەمانە باشتر هەبن، بە خوا ئافرەتانی ئێرە ناوازە و نموونەیین، بەڵام با خۆم بگەیەنمە نهۆمی حەوتەمیش دیارە لە ئەوێ لەمانەش باشتر هەیە!

کاتێک گەشتە نهۆمی حەوتەم لەسەر دەرگاکەی نووسرابوو:

ئازیزەکەم! تۆ میوانی ژمارە ٦٥٣٢٤١٩٨، ئەم مۆڵە بە هیچ شێوەیەک ئافرەتی لێ نییە، ئەم نهۆمی حەوتەمەش بەڵگەی ئەوەیە پیاوان بە هیچ شتێک تێر نابن! سوپاس بۆ بازارکردنت لە مۆڵی فرۆشتنی ژنان، کە لەم مۆڵە چوویتە دەرەوە ئاگات لە هەنگاوەکانت بێت، هیوای ڕۆژێکی خۆشت بۆ دەخوازین!

ئەم چیرۆکە ئەگەرچی چیرۆکێکی خەیاڵییە، وەلێ ئەمە ئاوێنەی بیرکردنەوەی زۆربەی هەرە زۆری پیاوانە لە ژیاندا! بەڵام ئایا ئەم شتە تەنها لە پیاواندا هەیە و ئافرەتان لێی بێبەشن؟ ئەڵبەت نەخێر، ئەوەی لە پیاواندا هەیە سەبارەت بە بەرزی سەقفی چاوەڕوانییەکانیان هەمان شت لە ئافرەتانیشدا بوونی هەیە! هەرچەندە ئەم چیرۆکە پیاو وەک هەڵپەکار پیشان دەدات، بەڵام خۆ هێندەش قورس نییە بێین چیرۆکەکە لنگەوقوچ بکەینەوە و کارەکتەری سەرەکی ناو چیرۆکەکە لە پیاوەوە بگۆڕین بۆ ئافرەت و چیرۆکەکە ئاوا لێ بکەین:

ئافرەتان بە ئاسانی ڕازی نابن و داناکەون!

لە یەکێک لە شارەکاندا مۆڵێک کرایەوە بۆ فرۆشتنی مێرد، هەر ئافرەتێک بۆی هەبوو سەردانی ئەو مۆڵە بکات و مێردێکی باش بکڕێت و بیکات بە هاوسەری خۆی، بەڵام لە دەرگای چوونەژوورەوەی مۆڵەکەدا یاسایەک نووسرا بوو کە دەبوو کڕیارانی ناو مۆڵەکە پەیرەوی لێ بکەن، یاساکەش بەم شێوەیەی لای خوارەوە بوو:

١- کڕیار لە ژیانیدا تەنها یەک جار بۆی هەیە سەردانی ئەم مۆڵە بکات.

٢- دەبێت بە پێی ڕیزبەندیی نهۆمەکان و لە نهۆمی یەکەمەوە دەست پێ بکات، ئەگەر پیاوەکانی نهۆمی یەکەمی بە دڵ نەبوو دەتوانێ بچێت بۆ نهۆمی دووەم و سێیەم و هەروەها...

٣- کڕیار هەر نهۆمێکی بەجێهێشت و چووە نهۆمی سەرترەوە ڕێگەی پێ نادرێت بگەڕێتەوە بۆ نهۆمی خوارتر.

یەکێک لەو ئافرەتانەی کە خوازیاری هاوسەرگیری بوو بیرۆکەی ئەم مۆڵەی زۆر لە لا پەسەند بوو، بۆیە بڕیاری دا سەردانی ئەم مۆڵە بکات بۆ ئەوەی دەستنیشانی پیاوێکی باش بکات و بیکاتە هاوسەری خۆی، لە دەرگای چوونەژوورەوە مەرجەکانی بە باشی خوێندەوە، ڕاستەوخۆ خۆی کرد بە نهۆمی یەکەمدا، لەسەر دەرگاکەی تایبەتمەندییەکانی پیاوانی ناو ئەو نهۆمە نووسرابوون، کە بیریتی بوون لەمانە: پیاوانی ئێرە خاوەن کاری خۆیانن، هەروەها بڕواداریشن!

لە دڵی خۆیدا وتی: جا ئەمانە چ جیاوازییەکیان هەیە لەگەڵ پیاوانی دەرەوەدا، لە دەرەوەش پیاوانی خاوەن کار و بڕوادار گەلێک زۆرن، قەیناکا با بچم بۆ نهۆمی دووەم بەڵکوو پیاوانی ئەوێ تایبەتمەندی زیاتریان هەبێت، خۆی گەیاندە نهۆمی دووەم و بینی لەسەر دەرگاکەی نووسراوە پیاوانی ئێرە خاوەن کاری خۆیانن، بڕوادارن، هاوسەرەکانیشیان خۆش دەوێت!

لە دڵی خۆیدا وتی بە خوا ئەمانەش زۆر جیاوان نین، ئەم جۆرە پیاوانە لە دەرەوەش دەست دەکەون، با سەرێکی نهۆمی سێیەمیش بدەم بزانم لەوێ چ باسە، چووە نهۆمی سێیەم و بینیی لەسەر دەرگاکەی نووسراوە: پیاوانی ئێرە خاوەن کاری خۆیانن، بڕوادارن، هاوسەرەکانیان خۆش دەوێت و کەشخە و قۆزیشن!

لە دڵی خۆیدا وتی وا دیارە هەتا بچیتە سەرەوە تایبەتمەندییەکان زیاد دەکات، پیاوانی نهۆمی یەکەم تەنها خاوەن کار و بڕوادار بوون، پاشان پیاوانی نهۆمی دووەم سەرەڕاوی ئەوانە هاوسەرەکانیشیان خۆش دەویست، کە هاتمە نۆمی سێیەم کەشخە و قۆزییش زیادی کرد، باشە بۆ نەچمە نهۆمی چوارەم؟ بەڵکوو پیاوانی ئەوێ باشتر بن، کاتێک چووە نهۆمی چوارەم دەبینێت لەسەر دەرگاکەی نووسراوە پیاوانی ئێرە خاوەن کاری خۆیانن، بڕوادارن، کەشخە و قۆزن، نەک هەر هاوسەرەکانیان بەڵکوو کەسوکاری هاوسەرەکانیشیان خۆش دەوێت!

لە دڵی خۆیدا وتی ئەم تایبەتمەندییانە یەکجار باش و سەرنجڕاکێشن، بەڵام بێگومان نهۆمی پێنجەم باشتری لێیە، سیاسەتی ئەم مۆڵە ئاوایە هەتا بچیتە سەرەوە شتی باشتر دەبینیت، پێویست بە بیرکردنەوە ناکات با زوو خۆم بگەیەنمە نهۆمی پێنجەم، کە گەشتە نهۆمی پێنجەم ئەوەی پێشبینیی دەکرد کتومت وا دەرچوو، تەماشا ئەکات لەسەر دەرگاکە نووسراوە: پیاوانی ئێرە خاوەن کاری خۆیانن، بڕوادارن، هاوسەرەکانیان خۆش دەوێت، کەشخە و قۆزن، کەسوکاری هاوسەرەکانیان خۆش دەوێت، هاوکاری هاوسەرەکانیشیان دەکەن لە کاروباری ناوماڵدا!

لە دڵی خۆیدا وتی ئای خوایە ئەم پیاوانەی ئێرە چەند ناوازە و تایبەتن، بەڵام با سەرکەوم بۆ نهۆمی شەشەمیش؛ چونکە هەمیشە سەرووتر باشتری لێیە، گەشتە نهۆمی شەشەم و لەسەر دەرگاکەی نووسرابوو: پیاوانی ئێرە خاوەن کاری خۆیانن، بڕوادارن، هاوسەرەکانیان خۆش دەوێت، جوان و هەڵکەوتوون، هاوکاری هاوسەرەکانیان دەکەن لە کاروباری ناوماڵدا، ڕۆمانسیشن!

لە دڵی خۆیدا وتی: باشە تۆ بڵێی لەمانە باشتر هەبن؟ بەخوا پیاوانی ئێرە ناوازە و نموونەیین، بەڵام با خۆم بگەیەنمە نهۆمی حەوتەمیش، دیارە لەوێ لە ئەمانەش باشتر هەیە!

کاتێک گەیشتە نهۆمی حەوتەم لە سەر دەرگاکەی نووسرابوو:

ئازیزەکەم تۆ میوانی ژمارە ٦٥٣٢٤١٩٨، ئەم مۆڵە بە هیچ شێوەیەک پیاوی لێ نییە، ئەم نهۆمی حەوتەمەش بەڵگەی ئەوەیە ئافرەتان بە هیچ شتێک تێر نابن! سوپاس بۆ بازاڕکردنت لە مۆڵی فرۆشتنی پیاوان، کە لەم مۆڵە چوویتە دەرەوە ئاگات لە هەنگاوەکانت بێت، هیوای ڕۆژێکی خۆشت بۆ دەخوازین!

خۆ دیتت دروستکردنی چیرۆک چەند ئاسانە؟ هەر چیرۆکێک بە خراپ وێنای پیاو بکات بە ئاسانی دەتوانیت کارەکتەری سەرەکی چیرۆکەکە لە پیاوەوە بۆ ئافرەت بگۆڕیت و بە پێچەوانەشەوە، کارەکە زۆر سەخت نییە بۆ یەکێک بیەوێت، بەڵام ڕاستییەک هەیە ناتوانین لێی ڕابکەین ئەویش ئەوەیە لە هەناوی ئەم جۆرە چیرۆکە دروستکراوانەدا شتێک لە ڕاستی هەیە و بە شێوەک لە شێوەکان چیرۆکی هاوشێوە لە زەمینی واقیع و لەناو ئاڵۆزی و جەنجاڵییەکانی ژیاندا ڕوویانداوە!

کاتێک چیرۆکی بازاڕی فرۆشتنی ژنانم بۆ گێڕایەوە دوابەدوای ئەوە چیرۆکی بازاڕی فرۆشتنی پیاوانیشم دروست کرد، من مەبەستم ئەوە نییە پیاوان دەبێت لە ژیاندا تەنها لە نهۆمی یەکەم هەڵبژێرن و نابێت ڕوو لە نهۆمەکانی تر بکەن، هەروەک چۆن مەبەستیشم ئەوە نییە ئافرەت هەرکە یەکەم خوازبێنیکەر لە دەرگای دا ئیتر ملی بۆ بدات و پێی ڕازی بێت! زۆر بە پێچەوانەوە هەموو مرۆڤێک مافی هەیە لە مێشکی خۆیدا کۆمەڵە مەرجێک بۆ ئەو

کەسە دابنێت کە دەبێتە هاوژینی، پیاو سەرزەنشت ناکرێت ئەگەر مەرجی جوانی دابنێت بۆ هاوژینی داهاتووی، هەروەک چۆن نەنگیش نییە بۆ ئافرەت ئەگەر دڵخوازی پیاوێکی قۆز و پێکەوتوو بێت، ڕاستە زیادەڕەویکردن لە مەرجەکانی هاوسەرگیریدا بە شێوەیەک بە تەمای ئەوە بیت کەسێکی نموونەیی ببێتە هاوسەرت ئەمە ئەگەرچی خەونێکی ڕەوایە، بەڵام شتێکی نالۆژیکییە؛ چونکە خۆمان نموونەیی نین هەتا داوای هاوسەری نموونەیی بکەین، هیچ مرۆڤێک نییە مەگەر کەموکورتییەکی هەر هەیە، تەنها خودایە تەواو بێ کەموکورتییە، بەڵام مادام مرۆڤ بتوانێت بە شوێن هاوسەرێکدا بگەڕێت زۆرترین تایبەتمەندیی تێدا بێت با هەوڵی بۆ بدات، ئەمە ناچێتە چوارچێوەی بەرزی و نزمی سەقفی چاوەڕوانییەکانەوە ئەگەرچی شتێکیشی لەو بابەتە هەر تیایە!

ئەوەی مەبەستمە بیڵێم ئەوەیە ژن و پیاو کە دەچنە ژیانی هاوسەرگیرییەوە و لە چوارچێوەی خانوویەکدا کۆدەبنەوە دەبێ سەقفی چاوەڕوانییەکانیان لە بەرامبەر یەکتردا نزم بکەنەوە، پێویستە لەوە تێبگەین ئافرەت هەرچەندە هەوڵ بدات ناتوانێت ببێتە فریشتە، پیاویش بە هەمان شێوە، دواجار ئێمە هەموومان مرۆڤین و بێ هەڵە و پەڵە نابین، هەڵدەچین، دڵ تەنگ دەبین، دڵخۆش دەبین، نەخۆش دەکەوین، هەموو ئەم بارودۆخانەی کە لە ژیاندا بەسەر مرۆڤدا دێت کاریگەری دەبێت لەسەر پەیوەندی بە دەوروبەرییەوە، هەندێک ڕەفتار و هەڵسوکەوتی بەرامبەر هەیە لە حاڵەتێکی دەروونیدا بە ئاسایی وەریدەگرین، بەڵام ڕەنگە لە حاڵەتێکی تری جیاوازدا کاردانەوەی توندمان ببێت، کەچی ڕەفتارەکە هەر یەک ڕەفتارە، بەڵام ئێمە خۆمان لە هەموو کاتێکدا خۆمان نین! یەکەم سەقفێک کە پێویستە دایبەزێنین ئەوەیە بزانین ئێمە لەگەڵ مرۆڤێکدا ژیانی هاوسەرگیریمان پێکهێناوە، نەک فریشتە!

مرۆڤ نییە هەڵنەچێت هەرچەندە ئاستی هەڵچوون و پەرچەکردارەکان لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت، لەجیاتی ئەوەی پێشبینی خۆت سەبارەت بە هاوسەرەکەت ببەیتە سەری و چاوەڕوانی هیچ گرژی و ئاڵۆزییەک لە نێوانتاندا نەکەیت، کاتێکیش گرژییەک دروست بوو، خەم داتبگرێت و وابزانیت هاوسەرگیری نێوانتان شکستی هێناوە، ئەوا پێویستە هەر لە سەرەتاوە ئەوە بزانیت تووڕەبوون و هەڵچوون هەر ڕوودەدات و دەبێت خۆتی بۆ ئامادە بکەیت و لە کاتی ڕوودانیدا مامەڵەیەکی تەندروستی لەگەڵدا بکەیت، خۆئامادەکردن و دەست و پەنجە نەرمکردن لەگەڵ ژیانی ڕاستەقینە و واقیعیدا پاڵنەرە بۆ بەرەوپێشچوون و هەلی بەردەوامبوونمان پێ دەبەخشێت، بەڵام بنیاتنانی ژیان لەناو خەیاڵدا و بەتەما بیت ببێت بە واقیع، ئەوە یەکەم هۆکاری هەرەسهێنانی ژیانی ژنومێردایەتییە!

هەندێک جار لە ئەنجامی ئەو چاوەڕوانییە بەرزەی کە هەمانە سەبارەت بە خۆمان بێت، یان ئەوانی تر خۆمان هیوابڕاو و نائومێد دەکەین!

بۆ نموونە هەندێک کەس وا بیر دەکەنەوە هەر بە تەواوکرنی زانکۆ، ئیتر کاریان چنگ دەکەوێت و ژیانیان بە یەکجاری دەگۆڕێت، ئەم جۆرە بیرکردنەوانە لە لایەک ستەم لەخۆکردنە و لە لایەکی ترەوە نەخوێندنەوەی واقیعە، بە هەمان شێوە سەقفی چاوەڕوانییەکانمان سەبارەت بە ژیانی هاوسەرگیریش هێندە بەرز دەکەینەوە وا دەزانین هەر کە چووینە ژیانی هاوسەرگیرییەوە ئیتر هەموو گۆڕانکارییەکان بە گوێرەی حەز و ویستی ئێمە دەبێت!

نەک تەنها لە ژیانی هاوسەرگیریدا، بەڵکوو لەگەڵ ئەوانەشدا کە پەیوەندی هاورێیەتیمان لەگەڵیاندا هەیە نابێت سەقفی چاوەڕوانییەکانمان زۆر بەرز بکەینەوە، چونکە ئەوە بێزارکەرە هەم بۆ ئێمە و هەم بۆ ئەوانیش!

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی بیرۆکەکە بە وردی ئەم چیرۆکە بخوێنەرەوە:

کارمەندی فەرمانگەیەک بە دەست هەژارییەوە دەینالاند، بۆیە داوای لە بەڕێوەبەرەکەی کرد لەبەر ئەوەی ئەرکەکانی سەرشانی بە دڵسۆزی و لەخۆبوردووییەوە جێبەجێ دەکات پلەکەی بەرز بکاتەوە بۆ ئەوەی مووچەکەشی شتێک هەڵبکشێت، وەڵامی بەڕێوەبەرەکەشی دڵخۆشکەر بوو، بەڵێنی پێدا لێکۆڵینەوە لە داواکەی بکات و پشتیوان بە خودا ئەنجامەکەی بە دڵی ئەو دەبێت!

ئەم کارمەندە سەقفی چاوەڕوانییەکانی یەکجار بەرز کردەوە، لە دڵی خۆیدا وتی: دڵنیام لەوەی لانی کەم مووچەکەم بەڕێژەی لە ٥٠٪ بۆ زیاد دەکات!

دوای چەند ڕۆژێک بەڕێوەبەرەکە پەیوەندی پێوە کرد و وتی: پاش گەڕانەوە بۆ ژمێریاری و ڕەچاوکردنی توانای داراییمان بڕیارمان دا بە زیادکردنی موچەکەت بە ڕێژەی ١٠٪!

کارمەندەکە بە بیستنی هەواڵەکە هەستی بە بێزارییەکی زۆر کرد، پێی وابوو بەڕێوەبەرەکەی هەوڵ و ماندووبوونەکانی ڕەچاو نەکردووە و مافی خۆی پێ نەداوە! لە ڕاستیدا بەڕێوەبەرەکە هەموو هەوڵێکی خۆی خستبووە گەڕ و ئەوەی پێی کرابوو کردبووی، لانی کەم لە خەمەکەی گەیشتووە و دەستی هاوکاری بۆ درێژ کردووە، بەڵام ئەوەی وای لەم کامەندە کرد کە ئەو هەستە نەرێنییەی لە لا دروست ببێت، بەرزی سەقفی

چاوەڕوانییەکانی بووە، کە خۆی و بەڕێوەبەرەکەشی پێوە وابەستە کردبوو، کاتێک ئەنجامەکە دڵخوازی ئەو نابێت هەست بە تووڕەیی و دڵتەنگی دەکات و وا دەزانێت بەڕێوەبەرەکەی کەمتەرخەم بووە بەرامبەری!

لە بابەتی هاوسەرگیریشدا بە هەمان شێوە مامەڵە دەکەین و سەقفی چاوەڕوانییەکانمان زۆر بەرز دەکەینەوە، کاتێکیش چاوەڕوانییەکانمان وەک خۆیان نایەنە دی، ئیتر هەست بە تووڕەیی دەکەین و خەم و پەژارە دڵ و دەروونمان دادەگرێت و بەرامبەرەکانمان بە کەمتەخەم ئەدەین لە قەڵەم، هۆکاری زۆربەی گرفتەکان ئەوەیە کە تێڕوانینەکان بۆ ژیان تێڕوانینێکی خەیاڵپلاوانەن، یان ڕاستر بڵێین هۆکارەکە ئەوەیە ئەوەندەی چاوەڕوانی بەدەستهێنانی مافی خۆمان لە دەوروبەرمان دەکەین، هەرگیز ئەوەندە ئەرکەکانی سەرشانمان بەرامبەریان بەجێ ناهێنین!

کەسێکی واقیعی بە:

خراپ نییە ئەگەر هەوڵ بۆ دەستبەرکردنی ژیانێکی نموونەیی بدەیت، بەڵام وریابە لەپێناو بەدەستهێنانیدا نەبیتە قوربانی، هەمیشە ئەوە لە بەرچاو بگرە ژیانێکی واقیعی و ڕاستەقینە لەگەڵ هاوسەرەکەتدا و لە چواچێوەی خانوویەکدا زۆر باشتر، لە هەزار ژیانی خەیاڵی کە وەک شارە خەیاڵاوییەکەی ئەفلاطون بێت (مدينة أفلاطـون الفاضلـة)، کە هەرگیز نابێتە واقیع و لە مەرەکەبی سەر کاغەز تێناپەڕێت!



## ناکۆکی و مشتومڕ هەر ڕوودەدات

نەنکم هەرچەند نەخوێندەوار بوو، بەڵام ئافرەتێکی تا بڵێی ژیر و دانا بوو، لە ئەوەوە فێر بووم ژیان قوتابخانەیەکی گەورەیە، ئەو کەسەی ژیان فێری نەکات، هیچ زانکۆیەکی جیهان ناتوانێت فێری بکات، ژیان لە هەموو چرکەیەکدا وانەیەکمان پێ ئەدات، ئەوەی پێویستە لەسەر ئێمە ئەوەیە قوتابییەکی وریا بین و پەند لە ڕووداوەکانی ڕۆژگار وەربگرین، مرۆڤی ژیر وەک چۆن سوود لە ئەزموونەکانی خۆی وەردەگرێت، بە هەمان شێوە سوود لە ئەزموونی ئەوانی تریش وەردەگرێت!

دووبارە لە نەنکمەوە فێر بووم بڕوانامە تەنها بۆ بەدەستهێنانی کار بەکەڵک دێت و ژیریش بۆ ژیان!

لە ژیاندا زۆر گرنگ نییە بڕوانامەکەت لە چ ئاستێکدایە، چەند پارە و پوولت کەڵەکە کردووە، گرنگ ئەوەیە بڕوانامەکەت چ کاریگەرییەکی لەسەر ژیانت دروست کردووە، تاچەند ئاسۆی بیرکردنەوەتی فراوان کردووە، ئایا مامەڵە و هەڵسوکەوتی تۆی لەگەڵ دەوروبەرتدا گۆڕیوە، ڕێژەی تەڵاق و جیابوونەوە لەناو چینە ڕۆشنبیر و قەڵەمبەدەستەکانەوە کەمتر نییە لە ڕێژەی جیابوونەوە لەناو چینە سادە و نەخوێندەوارەکەی کۆمەڵگادا، چونکە گرفتەکە لە عەقڵییەت و بیرکردنەوەدایە، نەک لە بڕوانامە. من نامەوێت لە نرخی

بڕوانامە بهێنمە خوارەوە، بە پێچەوانەوە خەڵکانی ئەکادیمی لە هەموو کەس شایانترن بۆ ئەوەی باشتر لە ژیان بگەن و مامەڵەی تەندروست لەگەڵ دەوروبەریاندا بکەن، بەڵام وەک دەزانن زۆربەی کات شتەکان وەک ئەوەی پێویستە ڕێچکەی دروستی خۆیان ناگرن!

ئەو دڵخۆشی و تام و چێژەی لە ژیانی باوباپیرنماندا بوونی هەبووە، لەناو ماڵەکانی ئێستادا هەستی پێ ناکرێت؛ چونکە وەک گوتم ڕەگی گرفتەکان لە خوێندەواری و نەخوێندەواریدا نییە، بەڵکوو لە عەقڵیەت و شێوازی مامەڵەکردنە لەگەڵ دەوروبەردا.

پارە و پوولیش وەک بڕوانامە و ئاستی خوێندەواری بە تەنها بەس نییە بۆ بنیاتنانی هاوسەرگیرییەکی تۆکمە و سەرکەوتوو، ئەگەرچی زۆربەی خەڵک وا بیر دەکەنەوە، من لە گرنگی پارە و پوول کەم ناکەمەوە وەک چۆن پێشتر لە گرنگی بڕوانامەم کەم نەکردەوە، پارە تەکانێکی باش بە ژیان دەدات و یەکێکە لە ئامرازەکانی بەدەستهێنانی خۆشبەختی، بەڵام هەموو شتێکیش نییە، ئەوەتا ئەبینیت ڕێژەی تەڵاق و جیابوونەوە لەناو چینی دەوڵەمەند و خواپێداواندا کەمتر نییە لە ڕێژەی جیابوونەوە لەناو چینی هەژاراندا، بوونی پارە لە بەردەستی مرۆڤدا وەک بوونی بەرد وایە لە بەردەستی ئەندازیارێکی بیناسازیدا کە کار لە شوێنەوارێکی پادشانشینی کۆندا دەکات، دەتوانێت بەو بەردانە پردێکی پەڕینەوە بۆ گەیشتن بە شوێنەوارەکە دروست بکات، دەشتوانێت دیوارێکی بەربەستی لێ دروست بکات و ڕێگەی گەیشتن بە شوێنەوارەکە بە یەکجاری دابخات، زۆر گرنگ نییە چیمان لە بەردەستدایە، گرنگ ئەوەیە چۆنی بەکاری دێنین!

ڕەنگە کەسێک بپرسێت و بڵێت:

یەکەم: باشە پەیوەندی نەنکت بە هەموو ئەم شتانەوە چییە؟

دووەم: ئەو تایتڵەی سەرەوە (ناکۆکی و مشتومڕ هەر ڕوو دەدات) چ پەیوەندییەکی بە بڕوانامە و پارە و پوولەوە هەیە؟

سەبارەت بە پرسیاری یەکەم:

وەڵامەکەی ئەوەیە: نەنکم بە ڕەحمەت بێت حیکایەتخوانێکی زۆر کارامە و بەتوانا بوو، سەدان چیرۆکی سەرنجڕاکێشی لەبەر بوو کە هەر یەکێک لەو چیرۆکانە دەکرێ چەندین وانەی لە ژیاندا لێ وەربگیرێت، کە هیچ کات بڕوانامەی ئابووری و فیزیا و ماتماتیک و ئەندازیاری هێندەی ئەو چیرۆکانە سوودیان بۆ سەرخستن و پتەوکردنی پەیوەندیی ژیانی ژنومێردایەتی نییە!

سەبارەت بە پرسیاری دووەمیش:

وەڵامەکە ئەوەیە: هاوسەرگیری هەر کەسێک بێکات هەر هاوسەرگیرییە و ناکۆکی و مشتومڕیش هەر دروست دەبێت، نەک لەبەر ئەوەی دەوڵەمەندین یان هەژار، خوێندەوارین یان نەخوێندەوار، بەڵکوو لەبەر ئەوەی مرۆڤین!

ڕەنگە پێم بڵێیت: بەڵام ئەوانەی خوێندەوارن باشتر دەتوانن چارەسەری کێشە خێزانییەکانیان بکەن!

لە وەڵامدا دەڵێم: دەبێ وابێت، بەڵام ئەگەر تۆ پێتوابێت ڕێژەی جیابوونەوە لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا کەمترە لە ڕێژەی جیابوونەوە لە گوندە دوورەدەستەکانی وڵاتی میسر، ئەوا تۆ بە هەڵەدا چوویت، ئامارەکان پێچەوانەی ئەمەمان پێ دەڵێن، نە ڕۆشنبیری و دەوڵەمەندیی خەڵکی پاریس دەتوانێتماڵەکان بپارێزێت، نە هەژاری و نەخوێندەواریی گوندنشینەکانی میسریش ماڵەکان تێکدەدات، بەڵکوو ئەوەی بەردەوامی بە ژیانی ژنومێردایەتی ئەدات، حەزی پێکەوە ژیانە، توانای دەستگرتنە بە ئەوی ترەوە،

دوورکەوتنەوەیە لە خۆپەرستی و لووتبەرزی، تێکەیشتنە لەوەی ناکۆکی خێزانی بەشێکە لە ژیانی ژنومێردایەتی، ئا ئەمانەیە ماڵەکان دەپارێزێت و بەردەوامیان پێ دەدەن!

ژن و پیاوێکی دانیشتووی پاریس کاتێک دەگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە و دەرگا لەسەر خۆیان دادەخەن، ئیتر بەرزیی بورجی ئیفڵ و بوونی گەشتیارێکی زۆر لە دەوری هیچ کاریگەرییەکی ئەرێنی لەسەر ژیانی ژنومێردایەتیان دانانێت، بە هەمان شێوە ژن و پیاوێکی گوندنشینی میسریش زۆری بەرهەمی گەنمەشامی و لۆکە نابێتە فاکتەری سەرخستنی هاوسەرگیرییەکەیان! لە بەرامبەریشدا کەمی گەشتیار لە پاریس و کەمی بەرهەم لە گوندەکانی میسر پەیوەندی ژیانی ژنومێردایەتی تێکنادات!

خۆمان نەبێ هیچ شتێک ناتوانێت هاوسەرگیری سەرکەوتوو، یان شکست پێبهێنێت، شتە دەرەکییەکان یارمەتیدەرن بۆ بەردەوامی، یان هەڵوەشاندنەوەی خێزان، بەڵام شتێک هەیە پێویستە هەموومان بیزانین، ئەویش ئەوەیە هیچ هێزێک لە دنیادا نییە بتوانێت شکست بە هاوسەرگیرییەک بهێنێت، مادام ژن و پیاوەکە یەکیان بوێت، هیچ هێزێکیش لە دنیادا نییە بتوانێت هاوسەرگیرییەک سەرکەوتوو بکات، مادام ژن و پیاوەکە یەکیان نەوێت!

ناکۆکی هەردەم ڕوودەدات، هیچ ماڵێک نییە گرفت و ناکۆکی تیا نەبێت، بەڵام هەندێک خەڵک هەن ژیانیان وەک کتێبێکی کراوە وایە و هیچ شتێکیان شاراوە نییە، هەندێکی تریش بە پێچەوانەن و خۆیان نەبێت کەس بە گیروگرفتەکانیان نازانێت!

نەنکم بۆی گێڕامەوە: کاتی خۆی ئافرەتێک هەبووە زۆر بێزار و وەڕەس بووە لە دەست مێردەکەی، دێتە سەر ئەو بڕوایەی کە ئیتر ژیان لەگەڵ ئەم پیاوەدا زۆر ئەستەمە و بڕیار ئەدات لێی

جیا ببێتـەوە، بۆیـە ڕوو ئەکاتـە لای مـەلای گوندەکەیـان بـۆ ئـەوەی هـاوکاری بـکات و لـە مێردەکـەی جیـا بکاتـەوە، مامۆسـتای گونـد کـە لـە کێشـەکەی کۆڵییـەوە بـۆی دەرکـەوت کێشـەکە هێنـدە گـەورە نییـە پێویسـت بـە جیابوونـەوە بـکات و ئـەو جـۆرە کێشـانە لـە هەمـوو ماڵێکـدا ڕوودەدەن، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی ئـەم ئافرەتـە زۆر تێکەڵـی خەڵکـی نەکـردووە و ئەزموونـی لـە ژیانـدا کەمـە، بۆیـە ئـەو بڕیـارە سـەرپێییەی داوە، مامۆسـتا زۆر هەوڵـی دا لـە بڕیارەکـەی پەشـیمانی بکاتـەوە، بەڵام بێسـوود بـوو، کـە زانـی قسـە سـوودی نییـە ئەمجـارە ڕێگەیەکـی تـری گرتـە بـەر بـۆ ئـەوەی پەشـیمانی بکاتـەوە، وتـی باشـە هاوکاریـت دەکـەم، بـەڵام دەبێـت کولێـرە بەقیمەیەکـم بـۆ دروسـت بکەیـت!

ئافرەتەکـە بـە مامۆسـتای وت: جەنابـی مامۆسـتا: ئـەم داوا سـەیرە چییـە دەیکەیـت و چ پەیوەندییەکـی بـە گرفتەکـەی منـەوە هەیـە؟

- ئەمـە مەرجـی منـە بـۆ هاوکاریکردنـت!

- باشـە بـە سـەر چـاو مەرجەکـەت ئاسـانە و جێبەجـێ دەکـەم، هـەر ئەمـڕۆ کولێـرە بەقیمەکـەت لـە بەردەسـتدا دەبێـت.

- بەڵام مەرجێکـی تریشـم هەیـە.

- چییـە؟

- دەبێـت پێکهاتـەی کولێـرە بەقیمەکـە لـە دەرودراوسـێکانت کـۆ بکەیتـەوە، نابێـت یـەک شـتی نـاو ماڵەکـەی خـۆتی تیـا بـەکار بهێنیـت، تەنانـەت خوێـش!

- ئاخـر جەنابـی مامۆسـتا هەرگیـز نەبـووە شـت لـە ماڵـە دراوسـێ داوا بکـەم، ئێمـە شـوکر بـاری داراییمـان زۆر باشـە و داواکردنـی ئـەم جـۆرە شـتە سـادە و سـاکارانە لـە دەرودراوسـێ شـتێکی سـەیر و نامـۆ دەبێـت بـە لایانـەوە.

- هیچ ملەجەڕەیەک مەکە، ئەمە مەرجی منە و پێویستە جێبەجێی بکەیت، من کولێرەبەقیمەیەکم لێت دەوێت کە پێکهاتەکانی لە دراوسێکانت کۆ کردبێتەوە، ئەگەر وا نەکەیت هاوکاری من بە دەست ناهێنیت بۆ جیابوونەوە لە مێردەکەت!

- باشە ئەمرت بەجێیە قوربان!

ئافرەتەکە لە ماڵی مامۆستا چووە دەرەوە، بڕیای دا فەرمانەکە وەک خۆی جێبەجێ بکات، گرنگ ئەوەیە دواجار بتوانێت لە مێردەکەی جیا ببێتەوە!

چووە یەکەم ماڵە دراسێ و داوای تۆزێک ئاردی کرد.

ژنە دراوسێکە وتی: وەی بەسەر چاو هاوسێی ئازیز، بەڵام تخوا بیبوورە ئەم پرسیارە ئەکەم: خۆ ئێوە شوکر باری داراییتان زۆر باشە و ئاردیش لە ماڵتان نابڕێت، چۆنە وا هاتوویت بۆ ئارد بۆ ماڵی ئێمە؟

- بەڵێ، سوپاس بۆ خودا باری داراییمان زۆر باشە و ئاردێکی زۆریش لە ماڵماندا هەیە!

- ئەی کە خۆتان هەتانە ئیتر بۆ لە ئێمەی داوا دەکەیت؟

- چونکە مەلا لە مێردەکەمم جیا ناکاتەوە هەتا کولێرە بەقیمەیەکی بۆ دروست نەکەم، مەرجیشی ئەوەیە دەبێت پێکهاتەکانی لە ماڵە دراوسێکان کۆ بکەمەوە، وا تۆ یەکەم ماڵە دراوسێیت لە دەرگام داویت!

- ئەی بۆچی ئەتەوێت لە مێردەکەت جیا ببیتەوە؟

ئیتر ژنە دەستی کرد بە باسکردنی هۆکارەکانی پشت بڕیاری جیابوونەوە، دوابەدوای ئەو ژنە دراوسێکەش دەستی کرد بە باسکردنی مێردەکەی خۆی و وتی بە خوا حاڵی منیش لەوەی تۆ باشتر نییە، بە خوا منیش هەمان دەردی تۆم هەیە، دڵنیام ژنانی تریش وەک ئێمە وان!

ئاردەکەی وەرگرت و سوپاسی هاوسێکەی کرد لەسەر هاوکاریکردنی و گوێگرتن لە خەمەکانی، پاشان ڕووی لە ماڵە دراوسێی دووەم کرد و وتی: هاتووم بۆ هەندێک پیاز، ژنە هاوسێکەی وتی: وەی بە سەر چاو هاوسێی ئازیز، بەڵام تخوا ببوورە ئەم پرسیارە ئەکەم: باشە خۆ ئێوە شوکر باری داراییتان زۆر باشە و بڕواش ناکەم لەو ماڵە کەمتەرخەمانە بن بهێڵن پیاز لە ماڵتان ببڕێت، چۆنە وا هاتوویت بۆ ماڵی ئێمە بۆ چەند سەلکەپیازێک؟

- سوپاس بۆ خودا باری داراییمان باشە و پیازێکی زۆریش لە ماڵماندا هەیە.

- ئەی کە خۆتان هەتانە ئیتر بۆچی لە ئێمەی داوا دەکەیت؟

- چونکە مەلا لە مێردەکەمم جیا ناکاتەوە هەتا کولێرە بەقیمەیەکی بۆ دروست نەکەم، مەرجیشی ئەوەیە: دەبێت پێکهاتەکانی لە ماڵە دراوسێکان کۆ بکەمەوە، وا تۆ دووەم ماڵە دراوسێیت هاتوومەتە ماڵەکەتەوە!

- ئەی باشە بۆچی ئەتەوێت لە مێردەکەت جیا ببیتەوە؟

ئیتر ژنە دووبارە شانی کردەوە بە باسکردنی هۆکارەکانی پشت بڕیاری جیابوونەوە، هەرچییەکی بۆ دراوسێ یەکەمەکەی باس کردبوو بۆ ئەمیشی باس کردەوە، دوابەدوای ئەو ژنە دراوسێکەش دەستی کرد بە باسکردنی مێردەکەی خۆی و وتی: بە خوا منیش وەک تۆ گرفتارم و بە دەست مێردەکەمەوە حاڵم شڕە، کورە بە خوا نەک هەر ئێمە هەموو ئافرەتێک کەم تا زۆر گرفتی لەگەڵ مێردەکەیدا هەیە!

پیازەکەی وەرگرت و سوپاسی کرد لەسەر بەخشندەیی و هاوخەمییەکەی، پاشان ڕووی لە ماڵە دراوسێی سێیەم کرد و ئەمجارە داوای ڕۆنی کرد!

هەر بەم شێوەیە لەم ماڵە دراسێ بۆ ئەو ماڵە دراوسێ، لە سێیەم داوای ڕۆنی کرد و لە چوارەم داوای خوێی کرد و لە پێنجەم داوای گۆشتی کرد و لە شەشەم داوای خومرەی کرد!

ئەچووە هەر ماڵە دراوسێیەکەوە هەمان قسەوباس دووبارە دەبوونەوە، هەموو ژنەکان حەزیان دەکرد بزانن بۆچی ئەیەوێت لە هاوسەرەکەی جیا ببێتەوە، هەمووشیان وەک ئەم گرفتیان لەگەڵ هاوسەرەکانیاندا هەبوو!

دوای کۆکردنەوەی هەموو پێکهاتەکانی خواردنەکە بۆی دەرکەوت مێردەکەی ئەمیش یەکێکە وەک ئەو هەمووە خەڵکە، ئەوەی لە مێردەکەی ئەمدا هەیە، لە خەڵکانی تریشدا هەیە، ئەوەی لە ماڵەکەی ئەمدا دەگوزەرێ ماڵەکانی تریش لێی بێبەش نین!

ژنەکە کولێرە بەقیمەکەی ساز کرد و بردی بۆ مامۆستا، وتی: قوربان! ئەمە خواردنەکەیە دروستم کردووە، یاخوا نۆشی گیانت بێت، بەڵام من پەشیمان بوومەتەوە و ئەمەوێت لەگەڵ مێردەکەمدا بمێنمەوە!

مامۆستا زەردەخەنەیەکی کرد و وتی: چۆن بوو وا لە بڕیارەکەت پاشگەز بوویتەوە، ئەویش هەموو ئەو قسانەی کە لە ژنە دراوسێکانی بیستبووی بۆی گێڕایەوە، وتی من لە قسەی ئەوانەوە بۆم دەرکەوت مێردەکەی منیش وەک هەر مێردێکی ترە و ماڵەکەی منیش هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ ماڵەکانی تردا نییە!

لەو کاتەدا مامۆستا وتی: کچم من هیچ پێویستییەکم بەم خواردنە نییە، هەموو ئەوەی من ویستم، ئەوە بوو بچیتە ماڵی خەڵکی ترەوە و قسەی ژنە دراوسێکانت ببیستیت و بزانیت تۆش یەکێکیت لەو خەڵکە!

ئایا ئەم چیرۆکە چیرۆکێکی مەزن نەبوو؟ وانەی بەپێزی تێدا نەبوو؟ لە کام زانکۆ قوتابی وانەی ئاوا فێر دەبێت؟

خۆ ڕەنگە ئەم چیرۆکە هاوشێوەی هەر چیرۆکێکی تری داپیرەکان هەر ڕووینەدابێت، بەڵام گرنگ ئەوەیە کۆمەڵێک وانەی لێ وەردەگیرێت کە هیچ کەس ناتوانێت ملی بۆ نەدات، کێ هەیە بتوانێت نکوڵی لەوە بکات کە هەموو ماڵێک بەشی خۆی گرفت و ئاریشەی تێدایە؟ هەرچەند ڕێژە و سروشتی کێشەکان بەهۆی جیاوازی بارودۆخی کەسەکانەوە لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێت، بەڵام دواجار ماڵی بێکێشە تەنها لە بەهەشتدا هەیە!

ئەم جۆرە چیرۆکانە لە خۆیانەوە دروست نەبوون، بەڵکوو ئەمانە ئەدەبی میللین و ئەدەبی میللیش زادەی خەیاڵدانی مرۆڤ نییە، بەڵکوو بەرهەمی ئەزموونی ژیانی مرۆڤەکانە.

لە بەرامبەردا ڕەنگە کەسێک بپرسێت: تۆ وای نابینیت ئەم چیرۆکە ئەوە دووپات دەکاتەوە کە سەرچاوەی گرفتەکان هەمیشە پیاوانن؟ ئەوەتا پیاوانی ئەو گوندە هەموویان هاوشێوەی یەکن و ژنەکانیان گلەیی و گازەندەیان لە دەست دەکەن!

لە وەڵامدا دەڵێم: نەخێر!

ئەم چیرۆکە تەنها ئەوە دووپات دەکاتەوە کە کێشە و گیروگرفت لە هەموو ماڵێکدا بوونی هەیە، بەڵام ئەوەی کە لە چیرۆکەکەوە دەخوێندرێتەوە گوایە پیاوان سەرچاوەی کێشەکانن، ئەوە بۆ سروشتی چیرۆکەکە و ڕووداوەکانی ناو چیرۆکەکە دەگەڕێتەوە، ئەگینا پێشتر ئێمە لەسەر ئەو پرەنسیپە ڕێک کەوتین کە هەر چیرۆکێک دەربارەی پیاوان بێت و مەبەست لێی پێشکەشکردنی پەند و ئامۆژگاری بێت، زۆر ئاسانە چیرۆکێکی هاوشێوە دەربارەی ئافرەتان دروست بکرێت و هەمان پەند و ئامۆژگاری لێ وەربگیردرێت، وەک دەزانیت پێشتر چیرۆکی (بازاڕی فرۆشتنی پیاوان)م دروست کرد، لە بەرامبەر چیرۆکی (بازاڕی فرۆشتنی ژنان)دا؛ بۆ ئەوەی پیشانتان

بەدەم دروستکردنی چیرۆک چەند ئاسانە، زۆر گرنگی بەوە مەدەن ئایا چیرۆکەکە ڕوویداوە یان نا، زیاتر گرنگی بەوە بدەن ئەم چیرۆکە چ پەند و ئامۆژگارییەکی لە خۆ گرتووە.

پێتان چۆنە چیرۆکێک دروست بکەین هاوشێوەی چیرۆکی ژنەکە لەگەڵ جەنابی مامۆستادا، ئەم جارەیان بۆ ئەوە نیە بیسەلمێنین دروست کردنی چیرۆک ئاسانە، ئەوەمان تەواو کرد، بەڵکوو بۆ ئەوەیە دیمەنەکە تێروتەسەل بکەین!

بڕیارم دا خۆم ئەم چیرۆکەتان بۆ دروست بکەم:

لە سەردەمی کۆندا گەنجێک هەبوو نزیکەی ساڵێک بوو هاوسەرگیریی کردبوو، بەڵام بەردەوام لەگەڵ هاوسەرەکەیدا ناساز و ناتەبا بوون، ئیتر گەیشتە ئەو بڕوایەی ژیان لەگەڵیدا گەیشتووەتە بنبەست و بەهۆی بەریەککەوتن و کێشمەکێشمی نێوانیانەوە ناتوانێت بەردەوام بێت لەگەڵیدا؛ بۆیە بڕیاری دا لێی جیا ببێتەوە! چوو بۆ لای باوکی و پێی ڕاگەیاند نیازێکی ئاوام هەیە و ناتوانم لەگەڵ وەها ئافرەتێکدا بژیم، بەڵام باوکی دوای ئەوەی لە بابەتەکەی کۆڵییەوە بۆی دەرکەوت کێشەکان هێندە گەورە نییە تا پێویست بە جیابوونەوە بکات، ئەو جۆرە کێشانە کێشەی ئاساییн و هیچ ماڵێکی لێ بەدەر نییە، بۆیە باوکی دەستی کرد بە ئامۆژگاریکردنی کوڕەکەی و پێی وت: ڕۆڵە دەبێت دان بە خۆتدا بگریت، هەموو ژن و پیاوێک دەنووکە تەقە لە نێوانیاندا هەر ڕوودەدات، بەڵام کوڕە هەر بەردەوام بوو لەسەر بڕیاری خۆی!

کە باوکی زانیی ئامۆژگاری سوودی نییە، ئەمجا ویستی لەجیاتی ئامۆژگاری وانەیەکی پراکتیکیی پێ بدات!

وتی: باشە ڕۆڵە ڕازی ئەبم لە هاوسەرەکەت جیا ببیتەوە بەڵام بە مەرج!

کوڕەکەش یەکسەر وتی: بەسەرچاو باوکە گیان، پێش ئەوەی مەرجەکەت بڵێیت پێی ڕازیم، خوا ئەکات دەستم لە دەستی ئەم ژنە نالەبارە دەبێتەوە هەموو مەرجێک قەبووڵ دەکەم.

- مەرجەکەم ئەوەیە جلوبەرگی جەژنم بۆ بکڕێت، هەر وەک چون تۆ منداڵ بوویت و من جلوبەرگی جەژنم بۆ تۆ دەکڕی.

- ئاخر باوکە جلوبەرگی جەژن چ پەیوەندییەکی بە جیابوونەوەی منەوە هەیە لە هاوسەرەکەم؟

- ئیتر ئەوە مەرجی منە.

- باشە باوکە گیان، مەرجەکەت زۆر ئاسانە.

- بەڵام مەرجێکی تریشم هەیە کوڕم.

- چییە باوکە گیان؟

- نابێ پارەی ئەو جلوبەرگانە لە گیرفانی خۆت بدەیت، بەڵکوو دەبێت لە دەرودراوسێی کۆبکەیتەوە، ئەویش نەک بە قەرز، بەڵکوو دەبێت پێیان بڵێیت جلوبەرگی جەژنی پێ دەکڕم بۆ باوکم و بۆشتان ناهێنمەوە، هەروەها نابێت لە هەر دراوسێیەک پارەی یەک پارچە زیاتری لێ وەربگریت!

- ئەم مەرجە سەیرانە چین باوکە؟ من خۆم دەوڵەمەندم و هەرچییەکم بوێت دەتوانم بیکڕم، ئیتر بۆ ئەبێت داوای پارە لە خەڵکانی تر بکەم؟ تکات لێ ئەکەم مەمخەرە بارودۆخێکەوە تیایدا هەست بە شەرمەزاری بکەم!

- ئەوە تاکە مەرجی منە، ئیتر تۆش کەیفی خۆتە، جلوبەرگی جەژنم لێت دەوێت و دەبێت پارەکەشی لەم و لەو کۆ بکەیتەوە، هەر کەسێکیش پارەی یەک پارچە زیاتری لێ وەرناگریت، وابزانم قسەکەم هیچ ناڕوونییەکی تێدا نییە.

- باشە، خوا کەریمە!

مەرجەکانی ئەم باوکە سەیر بوون، کوڕەکە لەوە تێنەدەگەیشت جلوبەرگی چەژن و جیابوونەوەی ئەم لە هاوسەرەکەی چ پەیوەندییەکیان بە یەکەوە هەیە، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر مەبەستی بوو لە دەست هاوسەرەکەی ڕزگاری بێت لەو پێناوەدا ملی بۆ هەموو مەرجێک دا...

کوڕەکە دەستی کرد بە جێبەجێکردنی مەرجەکانی باوکی و خۆی کرد بە یەکەم ماڵە دراوسێدا و وتی: هاتووم بۆ هەندێک پارە بۆ ئەوەی کراسێکی پێ بکڕم بۆ باوکم و لە ڕۆژی جەژندا لەبەری بکات!

دراوسێکەی وتی: وەی بە چاوان هاوسێی ئازیز، بەڵام تخوا ببوورە ئەم قسەیە ئەکەم: باشە خۆ شوکر ئێوە دەوڵەمەندن، کەی پێویستتان بە پارەی کراسێکە!

- بەڵێ ڕاستە دەوڵەمەندین.

- ئەی ئیتر بۆ هاتوویت بۆ پارە و ئەشڵێیت نایهێنمەوە؟

- ئاخر ئەمە مەرجی باوکمە بۆ ئەوەی ڕازی ببێت لە هاوسەرەکەم جیا ببمەوە!

- ئەی بۆچی ئەتەوێت لە هاوسەرەکەت جیا ببیتەوە؟

گەنجەکە دەستی کرد بە باسکردنی گیروگرفتەکانی خۆی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا، هەر کە لێبوویەوە لە قسەکانی دراوسێکەشی دەستی کرد بە باسکردنی هاوسەرەکەی خۆی و وتی: بە خوا حاڵی منیش لە حاڵی تۆ باشتر نییە، تۆ تەنها نیت و منیش هاودەردتم، دواجار پارەی کراسەکەی لێ وەرگرت و زۆر سوپاسی کرد لەسەر ئەو هاوکارییەی پێشکەشی کرد بۆ ئەوەی دەستی لە دەستی هاوسەرەکەی ببێتەوە، دوابەدوای ئەو خۆی کرد بە ماڵە دراوسێی دووەمدا و هەمان دیالۆگ دووبارە بوویەوە، وتی:

هاتووم بۆ ئەوەی هەندێک پارەم پێ بدەیت بۆ ئەوەی پانتۆڵێکی پێ بکڕم بۆ باوکم، لە ڕۆژی جەژندا لە پێی بکات، بەڵام ئەوەش بزانە دوایی پارەکەت بۆ ناهێنمەوە!

دراوسێی دووەمیش وەک یەکەم وتی: وەی بە سەر چاو، بەڵام تخوا ببوورە ئەم قسەیە ئەکەم، باشە خۆ شوکر ئێوە خۆتان دەوڵەمەندن، کەی پێویستتان بە پارەی پانتۆڵێکە؟

- بەڵێ شوکر دەوڵەمەندین.

- ئەی کە دەوڵەمەندن، ئیتر بۆ داوای پارەی ئەکەیت؟

- ئاخر ئەمە مەرجی باوکمە، ئەبێ جلوبەرگی جەژنی بۆ بکڕم و پارەی هەر پارچەیەکیش لە ماڵە دراوسێیەک وەربگرم و پاشان بۆشیان نەگێڕمەوە، ئەگەرنا هاوکاریم ناکات بۆ جیابوونەوەم لە هاوسەرەکەم!

- ئەی بۆچی ئەتەوێت لە هاوسەرەکەت جیا ببیتەوە؟

دیسانەوە دەردی دڵی خۆی لای هاوسێی دووەمیش باس کرد و وتی: ژیانم نەماوە بە دەست هاوسەرە لاسارەکەمەوە و ناتوانم ئیتر لەگەڵیدا بژیم، هاوسێی دووەمیش وەک یەکەم باسی هەندێک گیروگرفتی خۆی و هاوسەرەکەی بۆ کرد و پاشان وتی: بە خوا هەر من و تۆ وا نین هەموو ماڵێک کەم تا زۆر لە گیروگرفت خاڵی نییە!

پارەی پانتۆڵەکەی لە ئەمیش وەرگرت و سوپاسی کرد لەسەر هاوخەمی و بەدەمەوەهاتنی، دوای ئەو ڕووی لە ماڵە دراوسێی سێیەم کرد، هەر بەم شێوەیە لەم ماڵە دراوسێ بۆ ئەو ماڵە دراوسێ، لەم پارەی پشتێن و لەو پارەی پێڵاو و لە یەکێکی تر پارەی گۆرەوی، ئەچووە هەر ماڵێکیشەوە باسی گرفتی خۆی و خێزانەکەی دەکرد و خاوەن ماڵیش هاوشێوەی ئەو باسی کێشە

خێزانییەکانی خۆی بۆ دەکرد، دوای ئەوەی پارەی جلوبەرگەکەی هەموو کۆکردەوە، بۆی دەرکەوت ئەمیش یەکێکە وەک ئەو خەڵکە و هاوسەرەکەشی هەروەها، ماڵی ئەو خەڵکەش وەک ماڵەکەی ئەم خاڵی نییە لە کێشەی خێزانی!

چوو بۆ بازاڕ، جلوبەرگەکانی کڕی و پاشان خۆی گەیاندە لای باوکی و وتی: باوکە گیان فەرموو ئەوە جلوبەرگەکانی چەژنت وا بۆم کڕیویت، یاخوا پیرۆزت بێت و بە خۆشی بیپۆشیت، بەڵام من لە بڕیارەکەم پاشگەز بوومەتەوە و نامەوێت لە هاوسەرەکەم جیا ببمەوە!

باوکی زەردەخەنەیەکی کرد و زانیی ئامانجەکەی خۆی پێکاوە، بەڵام پرسیاری لێ کرد و وتی: چۆن بوو وا پەشیمان بوویتەوە؟

کوڕە هەرچی بیستبوو لە هاوسێکانی هەمووی بۆ باوکی گێڕایەوە، پێی ڕاگەیاند لە ئەوانەوە بۆی دەرکەوتووە کێشە و گیروگرفت بەشێکە لە ژیان.و هیچ ماڵێکی لێ بەدەر نییە!

لەو کاتەدا باوکەکە بە کوڕەکەی وت: ڕۆڵە خۆ تۆ باش دەزانیت من هیچ پێویستییەکم بەم جلوبەرگانە نییە و خاوەنی سەروەت و سامانێکی زۆرم و هەر شتێکم بوێت بە ئاسانی دەتوانم بیکڕم، بەڵام ویستم بچیتە ماڵی خەڵکانی ترەوە و گوێبیستی ئاریشە و گرفتەکانی ئەوانیش بیت بۆ ئەوەی بۆت دەربکەوێت تۆش یەکێکیت وەک ئەوان!

کێشەی خێزانی شتێکی سروشتییە لە ژیانی هەر ژنومێردێکدا، خەمەکانی ژیان دەیسەپێنێت و هیچ پەیوەندییەکی بە ڕادەی خۆشەویستی نێوان ژنومێردەوە نییە، ڕاستە خۆشەویستی یەکێکە لەو فاکتەرە گرنگانەی وامان لێ دەکات بە ئاسانی باز بەسەر کێشە و گرفتەکاندا بدەین و تێیانپەڕێنین، بەڵام دەبێت هەمیشە ئەو

ڕاستیەشمان لە پێش چاو بێت، تەنانەت ئەو ماڵانەشی کە پڕن لە خۆشەویستی ژیان تێیاندا بەبێ کێشە و گیروگرفت گوزەر ناکات!

هەرگیز ئەوە بە بیرتدا هاتووە کە کێشەی خێزانی لە ماڵی پێغەمبەرانیشدا ڕووی دابێت؟

ڕەنگە لە لات سەیر بێت و لە دڵی خۆتدا بڵێت ئەمە چ قسەیەکە ئەم کابرا دەیکات، بۆ؟ پێغەمبەرانیش لەگەڵ هاوسەرەکانیاندا ناکۆکی دەکەوێتە نێوانیانەوە؟

ئیمامی ئەحمەد لە موسنەدەکەیدا و نەسائی لە سونەن کوبراکەیدا و ئەبو داود لە صەحیحەکەیدا و زەهەبی لە سییەر ئەعلامەکەیدا دەگێڕنەوە:

ئەبوبەکر خوای لێ ڕازی بێت ڕۆژێک هات بۆ ماڵی پێغەمبەری خوا لە دەرەوە گوێبیستی هاتوهاواری عائیشەی کچی بوو، بەمە زۆر قەڵس و بێزار بوو، بۆیە کاتێک چووە ژوورەوە پەلاماری عائیشەی کچی دا و دەستی بەرز کردەوە بۆ ئەوەی زللەیەکی پیا بماڵێت و وتی: چۆن دەبێت دەنگ بەسەر پێغەمبەری خوادا بەرز بکەیتەوە، بەڵام پێغەمبەر ڕێگەی پێ نەدا زللەکەی پیا بماڵێ، پاش ئەوەی ئەبوبەکر بە تووڕەییەوە لە ماڵی پێغەمبەر چووە دەرەوە پێغەمبەری خوا بە عائیشەی فەرموو: خۆ دیت چۆن ڕزگارم کردیت لە دەستی باوکت، پاش چەند ڕۆژێک ئەبوبەکر هاتەوە تەماشا دەکات پێکهاتوونەتەوە، پێی وتن بمخەنە ناو ئاشتییەکەتانەوە وەک چۆن منتان خستە ناو شەڕەکەتانەوە، پێغەمبەریش فەرمووی: ئەوا تۆمان خستە ناو ئاشتییەکەمانەوە!

عائیشە لە ڕووی ئیمانەوە یەکێکە لە کامڵترین ئافرەتانی ئەم ئوممەتە، بەڵام دواجار ئەویش ژنە، پێغەمبەری خواش باشترین مرۆڤی ڕووی زەوییە، بەڵام دواجار ئەویش مێردە،

ئەوەتا ئەبینیت ناکۆکی لە نێوانیاندا دروست ببێت و عائیشە دەنگی بە سەردا بەز دەکاتەوە، ئەمەش شتێکی ئاسابیە و لە هەر ئافرەتێکی تری ئەم جیهانە ڕوودەدات، باوکیشی بەسەر ڕووداوەکەدا دێت و ئەو کارەی عائیشە تەواو قەڵس و بێزاری دەکات، تەنانەت لەبەر خۆشەویستی زۆری بۆ پێغەمبەری خودا پەلاماری عائیشەی کچیشی دەدات بۆ ئەوەی لێی بدات، بەڵام پێغەمبەری خودا سەرەڕای ئەوەی لەو کاتەدا نێوانیشیان ئاڵۆز بوو، کەچی ڕێگەی نەدا باوکی دەستی بۆ درێژ بکات، پاش هێوربوونەوەی دۆخەکە بە شۆخییەوە بیری هێنایەوە چۆن بەرگری لێ کردووە و نەیهێشتووە باوکی دەستی پێ بگەیەنێت، دوای چەند ڕۆژێک هەموو شتەکان وەک خۆیان لێ هاتەوە، زەردەخەنە شوێنی فرمێسک و چپە و قسەی نەرمیش شوێنی هاتوهاواری گرتەوە!

گرفتی ئێمە لەوەدایە بیرمان چووەتەوە ئێمە مرۆڤین، پیاو دەیەوێت ژنەکەی فریشتە بێت، هەروەها ئافرەتیش دەیەوێت مێردەکەی فریشتە بێت، ئەمە هەرگیز ڕوونادات، مشتومڕی خێزانی هەرگیز لەنێوان ژنومێرددا بنبڕ نابێت، ئەگەر ماڵێک لێی پارێزراو بوایە، ئەوا دەبوو ماڵەکەی پێغەمبەر لێی پارێزراو بێت.

بەڵام تۆ وەرە تەماشا بکە پێغەمبەری خوا چۆن مامەڵەی لەگەڵ ئەو ناکۆکییەدا کرد، نەهات لە هاوسەرەکەی خۆی بدات، خوێناویی بکات، تەنانەت دڵی بەرایی نادات باوکیشی بە دیار چاوییەوە لێی بدات، هەرچەندە دەنگیشی بە سەردا بەرز کردبوویەوە، بە پێچەوانەوە پاراستی و نەیهێشت دەستی پێ بگەیەنێت، بگرە لە کاتی گەرمەی هەراکەشدا ئەیەوێت پێی بڵێ تۆ هێشتا لە دڵمایت و سەنگی خۆتت لە دەست نەداوە!

پێویستە وەک چۆن دەزانین تەبا و ڕێک بین، ئاوهاش بزانین چۆن مامەڵەیەکی تەندروست لەگەڵ ناکۆکییەکاندا دەکەین، کەسی مەرد و جوامێر لە کاتی ناکۆکی و مشتومڕدا بە دیار دەکەوێت، لە کاتی تەباییدا هەموومان پیاوی باشین. هەتا پێت دەکرێت خۆت لە ململانێ و ناکۆکی بپارێزە پێش ئەوەی ڕووبدات، خۆ ئەگەر ڕوویشی دا ئەوا بە شتێکی ئاسایی وەریبگرە، نە تۆ پێغەمبەری خوایت و نە هاوسەرەکەشت عائیشەیە، وەک بینیت ئەوەی لە نێوان هەر دوو هاوسەرێکدا ڕوودەدات، لەنێوان پێغەمبەر و عائیشەشدا ڕوویداوە!

زیادەڕەوی ناکەم ئەگەر بڵێم ناکۆکیی نێوان ژن و پیاو ئاسەواری باش لەسەر ژیانی ژنومێردایەتی بەجێ دێڵێت، بەڵام بەو مەرجەی لە چوارچێوەی ئادابی ناکۆکی نەچێتە دەرەوە و سووکایەتی و بێڕێزی بەرامبەر بە یەکدی نەکەن، ئاوی ڕاوەستاو بۆگەن دەبێت، ناکۆکی نێوان ژنومێرد وەک بەرهەڵدانی ئاوە ڕاوەستاوەکە وایە و لە مەنگی ڕزگاری دەکات، باشتر بڵێین وەک خوێی ناو چێشت وایە، ئەگەر کەم بێت، تاموچێژێک بە خواردنەکە ئەدات، ئەگەر زۆریش بوو، خراپی دەکات!

مشتومڕی خێزانی لە هەموو ماڵێکدا ڕوودەدات، بەڵام جیاوازییەکە لەوەدایە چۆن لێی دەڕوانرێت و بە چ شێوازێک مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت، بۆیە ئەگەر ماڵێکت دی ژیانی خێزانی تیایدا بەردەوام بوو، ئەوا وانەزانین هۆکارەکە بۆ نەبوونی ناکۆکی و ململانێ دەگەڕێتەوە؛ چونکە ئەمە پێچەوانەی واقیع و لۆژیکە و مرۆڤبوونیشمان دەخاتە ژێر پرسیارەوە، بەڵکوو هۆکارەکە ئەوەیە ئەم خانەوادەیە بڕیاریان داوە باز بەسەر گرفتەکاندا بدەن و چارەسەریان بکەن، دەبێ لەم گۆشەنیگاوە بۆ بابەتەکە بڕوانین.

جارێک ڕۆژنامەنووسێک بە سەرسووڕمانەوە پرسیاری لە ژنومێردێک کرد: چۆن توانیوتانە بۆ ماوەی شەستوپێنج ساڵ درێژە بە ژیانی هاوسەرگیریتان بدەن؟

ژنەکەش وتی: ئێمە نەوەیەک بووین شتێک ئەگەر تێک بچوایە چاکمان دەکردەوە، تووڕمان نەئەدا!

تۆش خانمی ئازیز ئەگەر ڕێک کەوت و ئەم قسەیەت خوێندەوە ئەوا پێویستە ئەم پیرەژنە بکەیتە سەرمەشقی خۆت و هەتا لە ژیاندا ماویت، پەیڕەوی لە وتە بە نرخەکەی بکەیت، وەرە شتە شکاوەکان چاک بکەرەوە نەک فڕێیان بدەیت، دەستبەرداری هاوسەرەکەت مەبە؛ چونکە هاوسەرگیری کاتێک سەرکەوتوو دەبێت کە هەردوو لاتان هاوکار بن، چەپڵە بە دەستێک لێنادرێ و مەلیش بە باڵێک نافڕیت، دەستی یەکتر بگرن و بڕۆن، بەردەوامی و پێکەوەژیان خواست و ویستی هەردوو لاتانی دەوێ!



## ئەو چی لە تۆ دەوێت؟

بە دڵنیاییەوە پێشتر ڕوویداوە ئامێرێکی کارەبایی نوێت کڕیبێت و هەر لەگەڵ هێنانەوەی بۆماڵەوە و پێش بەکارهێنانی بە شوێن کەتەلۆگەکەی ناویدا گەڕابیت، هەموومان وامان کردووە و ئەمەش هەنگاوە دروستەکەیە، بۆ ئەوەی سوود لە ئامێرەکە وەربگرین، پێویستە بزانین چۆن دەکەوێتە کار، ئەگەر نەزانین یەکێک لەم دوو ئەگەرە ڕوودەدات:

یان ئەوەیە ئامێرەکە بە تەواوی تواناکانیەوە کار ناکات، چونکە هەندێک توانا و تایبەتمەندی هەیە هێشتا پێمان نەزانیوە.

یان ئەوەیە ئامێرەکە بە یەکجاری لە کار دەکەوێت؛ چونکە هەندێک جار بە هەڵە بەکارهێنانی ئامێرەکان دەبێتە هۆی لەکارخستنی یەکجارەکی.

ڕەنگە بە لاتەوە سەیر بێت ئەگەر بڵێم ئێمەی مرۆڤیش کەتەلۆگمان لەگەڵدایە و ڕۆژانەش بەپێی ئەو کەتەلۆگە مامەڵە لەگەڵ یەکتریدا دەکەین، بەڵام بێئاگاین لێی و نازانین کەتەلۆگەکەی ئێمەش هاوشێوەی کەتەلۆگی ئامێرە کارەباییەکانە، بۆ نموونە:

هەموومان لە ڕێی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی وەک فەیسبووک و واتسئاپەوە پەیوەندی بە هاوڕێکانمانەوە دەکەین، نامە دەنێرین و نامەشمان پێ دەگات، ڕەنگە تێبینی ئەوەت کردبێت هەندێک

لـە هاوڕێکانـت زۆر هەسـتیارن بـەوەی درەنـگ وەڵامـی نامەکانیـان بدرێتـەوە، بـەڵام هەندێکی تریان ئەم بابەتە بە ئاسایی وەردەگرن، بێگومـان کاتێـک ئـەو هاوڕێیـەت گلەیـی درەنـگ وەڵامدانـەوەی نامەکانیت لێ دەکات، ئیتر تۆ لـە جارەکانی داهاتوودا ڕەچاوی ئـەو هەستیارییەی دەکەیـت و پێش هـەر کەسێکی تـر وەڵامـی نامەکانـی ئەدەیتـەوە.

دووبـارە هـەر لـە ڕێـی تـۆڕە کۆمەڵایەتییەکانـەوە هەندێک کـەس هـەن لـە ڕێـی نامـەوە بابەتـی جۆراوجـۆرت بـۆ دەنێـرن بـۆ ئـەوەی بیخوێنیتـەوە و چاوەڕوانی وەڵامیشت لێ ناکەن، هـەر لـە بنەڕەتـەوە پێویست بە وەڵامدانـەوە نـاکات، من خـۆم جاری وا هەیـە بابـەت بۆ هاوڕێکانـم دەنێـرم تەنهـا بـە مەبەسـتی بڵاوکردنـەوە و چاوەڕوانـی وەڵامیـش ناکـەم، بـەڵام هەندێـک خەڵـک هـەن ئەگـەر شـتێکیان بـۆ ناردیـت و وەڵامیـان نەدەیتـەوە و بۆیـان نەنووسـیت: سـوپاس دەستەکانت خـۆش بێت، بابەتێکی جوانە! زۆریان پێ ناخۆشـە، ڕەنگە ئەگـەر لـە ڕێگاوبانـدا بـە یـەک بگـەن گلەیـی خەسـتوخۆڵت لـێ بـکات لەسـەر ئـەوەی کۆمێنت لەسـەر بڵاوکراوەکانـی نانووسـیت، بێگومـان لـە جارەکانـی داهاتـوودا کـە بڵاوکراوەیەکـی دەبینیـت یەکسـەر بـۆی دەنووسـیت: دەسـت خـۆش بـۆ ئـەم بابەتـە جوانـە، ئەگەرچـی ڕەنگـە بەهـۆی سـەرقاڵیتەوە بڵاوکراوەکەیشیت هـەر نەخوێندبێتـەوە، تـۆ لـەم کاتـەدا بـە گوێـرەی کەتەلۆگەکـەی مامەڵـەی لەگەڵـدا دەکەیـت و بـە خۆشـت نازانیـت، بە پێـی ئـەو ئەزموونـەی تۆ لەگەڵیدا هەتە دەزانیـت ئەگـەر کۆمێنت بۆ بڵاوکراوەکانی نەنووسـیت زویر دەبێت، هـەر لـە ڕێـی مامەڵـە و هەڵسـوکەوتەوە خەڵکانێکـی تـرت بـۆت دەرکەوتـووە کـە بـە پێچەوانـەی هـاوڕێ یەکەمەکەتـەوەن و کارەسـات ڕوونـادات ئەگـەر کۆمێنت بـۆ بڵاوکراوەکانیـان نەنووسـیت!

با نموونەیەکی ترت بۆ بهێنمەوە سەبارەت بە کەتەلۆگی خەڵکی، یاخود ڕێبەریی مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکیدا، تۆ لەگەڵ هاوڕێیەکتدا لە کارگەیەک، قوتابخانەیەک، نووسینگەیەک پێکەوە کار دەکەن، پاشان لە یەکتر جیا دەبنەوە و تۆ دەچیت کارێکی تر دەدۆزیتەوە، پاش ساڵێک ئەم هاوڕێیەت دەگوێزێتەوە بۆ ئەو شوێنەی کە تۆ کاری لێ دەکەیت، بێگومان بەو پێیەی پێشتر یەکترتان ناسیوە، هەندێک زانیاری سەبارەت بە بەڕێوەبەر و سروشتی کارەکە و هاوڕێ کرێکارەکانی پێشکەش دەکەیت، ڕەنگە پێی بڵێیت: وریای فلانە کەس بە لێی نزیک نەبیتەوە، بەڵام فلانی تر پیاوی باشە و دەتوانیت پشتی پێ ببەستیت، تۆ بەم کارەت کەتەلۆگی ئەو خەڵکەی پێ دەدەیت، چونکە تۆ باش دەزانیت ناسینی سروشتی خەڵکی لە زۆر گیروگرفت و سەرئێشە لامان دەدات.

زۆربەی ئەو کێشانەی لەنێوان پیاوان و ئافرەتاندا ڕوودەدەن بەهۆی ئەوەوەیە ئاگایان لە کەتەلۆگی یەکتر نییە، پیاو وا بیر دەکاتەوە هەر شتێکی لە لا پەسەند بوو، دەبێت هاوژینەکەیشی لای پەسەند بێت، هەر شتێک بە لایەوە لاوەکی بوو، دەبێ ئەویش هەمان تێڕوانینی بۆی هەبێ، لە بەرامبەردا ئافرەتیش هەمان هەڵەی پیاو دووبارە دەکاتەوە، پێی وایە ئەم گرنگی بە هەر شتێک بدات، دەبێ مێردەکەیشی گرنگی بەو شتە بدات، ئەم بە چی شێوازێک هەست و نەستی خۆی دەردەبڕێت، دەبێت پیاوەکەشی هەمان ڕێگە بگرێتە بەر، لە کاتێکدا جیهانی ناوەوەی پیاو جیاوازە لە جیهانی ناوەوەی ئافرەت.

پیاوانی ئازیز! لەبەر ئەوەی مەبەستی سەرەکی لەم کتێبە ئێوەی بەڕێزن؛ بۆیە هەوڵ ئەدەم کەتەلۆگی خانمان، یاخود ڕێبەریی مامەڵەکردن لەگەڵ خانمانتان بۆ دابڕێژم!

١. بە هاوژینەکەت شەرمەزار مەبە:

ئافرەت پێی خۆشە هەست بەوە بکات کە مێردەکەی لێی پەشیمان نییە، هیچ پێویست ناکات ڕاستەوخۆ پێی بڵێیت تێکەوتم و نەزانیم کرد تۆم بە هاوسەری خۆم هەڵبژارد، هەندێک هەڵسوکەوتی ڕۆژانەی پیاو هەیە ئەو هەستە لە لای ئافرەت دروست دەکات کە مێردەکەی پێی ڕازی نییە و بگرە هەست بە شەرمەزاریش دەکات کە ئەم هاوسەریەتی، کاتێک تۆ لەگەڵ خۆت نایبەیت بۆ ماڵی هاوڕێکانت و بە هاوژینەکانیانی ناناسێنیت، کاتێک لە لای کەسوکار و ناسیاوەکانی بە ساردوسڕی مامەڵەی لەگەڵدا دەکەیت، دڵنیابە ئەگاتە ئەو بڕوایەی کە تۆی مێردی پێی شەرمەندەیت و وەک کارەساتێکی قورسی ژیانی خۆت لێی دەڕوانێت!

ڕاستە پەیوەندی ژنومێردایەتی پەیوەندییەکی تایبەتە، خۆ من نەموتووە بچۆ قەسیدەیەکی بۆ بهۆنەرەوە و بۆ خەڵکی بخوێنەرەوە، نەشم وتووە بچۆ بە دیار چاوی خەڵکەوە دەست لە ملی بکە، تۆ باش دەزانیت من مەبەستم چییە، مەبەستم پشتگوێنەخستنیەتی، چونکە هیچ شتێک بە ئەندازەی پشتگوێخستنی لەناو خەڵدا ئازاری نادات!

بەڵام هەندێک هەڵسوکەوتی بچووک و سادە هەن، ئەگەر لە بەردەم خەڵکدا و بە ئامادە بوونی خۆی پێی هەستیت ئەو کات وا هەست دەکات تۆ شانازی پێوە دەکەیت، ئەمەش هەستێکی یەکجار خۆشی لە لا دروست دەکات، بۆ نموونە:

بۆ خەڵکی باس بکە و بڵێ: هاوژینەکەم نان و خوانی زۆر بەتام و چێژە، بەڵام با خۆی گوێی لێ بێ.

بڵـێ: ئـەو خـۆی لەگـەڵ منداڵەکانـدا بـە وانەکانـی قوتابخانـەدا دەچێتـەوە، ئەمـەش هـەل بۆ مـن دەڕەخسـێنێت کاتێکی زیاتـر لەگەڵ هاوڕێکانمـدا بەسـەر بـەرم و حـەز و خولیاکانـی خـۆم پیـادە بکـەم.

بڵـێ هاوژینەکـەم فلانـە دیـاری بـۆ کڕیـوم، ئەمـە ئـەو هەسـتەی لـە لا دروسـت دەکات کە تۆ منەتباری ئەویت، ئەگەرچی دیارییەکە بـە پـارەی خۆشـت بـۆی کـڕی بیـت، ئەگـەر کراسـێکی بـۆ کڕیـت و لـە بۆنەیەکـی خێزانیـدا لەبـەرت کـرد، پرسـیار لـە خوشـکەکەت بکـە دەبـارەی ئـەو کراسـە، پاشـان ستایشـی پسـپۆڕیی هاوژینەکـەت بکـە لـە دەستنیشـانکردن و هەڵبژاردنـی جلوبەرگـی جـوان و هـەر پێداویسـتییەکی تـر.

بە ئامادەبوونـی خۆی و لەنـاو خەڵکدا ستایشـی کەسوکارەکەی بکـە، ئەمـە ئـەو هەسـتەی لـە لا دروسـت دەکات کـە تـۆ شـانازی دەکەیـت، نـەک تەنهـا بـە خۆیـەوە بەڵکـوو بـە کەسوکارەکەشـیەوە!

هەموومـان پێمـان خۆشـە بـە کارەکانمـان جێگـەی سەرسووڕمانی دەوروبەرەکەمـان بین.

بـا پێکەوە ئەم چیرۆکە جوانە بخوێنینەوە:

جارێـک منداڵێکـی تەمـەن دوازدە سـاڵان چـوو بـۆ لای میوەفرۆشـێک، داوای مۆبایلەکـەی لـێ کرد بۆ ئـەوەی پەیوەندییەکی گرنگ هەیە وەریگرێت، ئەویش مۆبایلەکەی دایە دەسـتی و منداڵەکە پەیوەندییەکـەی وەرگـرت و دەنگەکەشـی دایـە دەرەوە بـۆ ئـەوەی کابـرای میوەفرۆشـیش گوێبیسـتی گفتوگۆکە بێت، ئـەم دیمەنـە زۆر سـەرنجی کابـرای ڕاکێشـا و بـە تاسـەوە گوێـی گرتبـوو!

منداڵەکە وتـی: خانمەکـەم دەکرێ لـە ماڵەکەتدا کار بکـەم و ببمـە پاکەوانی باخچەکـەت؟ مـن کەسـێکی کارامـە و قاڵبووی ئـەو کارەم!

ژنەکە وتی: نەخێر کەسێکم لایە بەو کارە هەڵدەستێت، سوپاس!

- من بە نیوەی مووچەکەی ئەو دەیکەم!

- جارێکی تر سوپاس، من لە کارەکانی ڕازیم و نامەوێت بیگۆڕم بە کەسێکی تر.

- شۆستە و بەردەرگای ماڵەکەشت بۆ خاوێن دەکەمەوە، بە جوانترین شێوە، باخچەکەت بۆ دەڕازێنمەوە!

- نا نا، سوپاست دەکەم، ئەو کەسەی لە باخچەکەم کار دەکات لە کارەکانی زۆر ڕازیم!

منداڵەکە بە زەردەخەنە و دڵخۆشییەکی زۆرەوە مۆبایلەکەی داخست، میوەفرۆشەکە پێیوت: زۆر سەرسامم بە ورەی بەرز و حەز و خولیات بۆ دەستخستنی کار، ئەی بۆ نایەیت لای من کار بکەیت و میوە بگەیەنیتە ماڵی کڕیارەکانم، ئەو مووچەیەی خانمەکە بۆی ئەبڕیتەوە، منیش بۆت ئەبڕمەوە!

منداڵەکە وتی: سوپاس بۆ ئەو دەستپێشخەریەی جەنابت، ئەوە تەنها ویستم بزانم ئەو خانمە تا چەند لە کارەکانم ڕازییە، ئەوەی لە باخچەکەیدا کار دەکات هەر خۆمم.

تەماشای هەستی ئەو منداڵە بکە کاتێک گوێبیستی ڕەزامەندیی خاوەن کارەکەی دەبێت، ئەی هەستی چۆن دەبوو ئەگەر ئەو خانمە بیوتایە: زۆر باشە وەرە، دەمێکە من بە شوێن کەسێکی وەک تۆدا دەگەڕێم؛ چونکە ئەوەی کە ئێستا کارم بۆ دەکات هیچ لێی ڕازی نیم و وەک پێویست گرنگی بە باخچەکە نادات، ئافرەتیش هەر وایە، کاتێک هەست بەوە دەکات کە شانازی پێوە دەکەیت لە خۆشیاندا شاگەشکە دەبێت، کاتێکیش هەست بەوە دەکات کە پێی شەرمەزاریت، هێندە لەسەر دڵ و دەروونی قورسە ئاوات بە مەرگی خۆی دەخوازێت!

### ٢. لە بەردەم خەڵکیدا ڕەخنەی لێ مەگرە:

لە نێوان ئەم خاڵە و خاڵەکەی پێشوودا هەندێک لێکچوون هەیە، ئەڵبەت هەندێک جیاوازیش هەر هەیە، بۆیە پێم باش بوو لە یەکیان جیا بکەمەوە.

لە خاڵی یەکەمدا باسمان لەوە دەکرد پیاو لەناو خەڵکدا هەست بە شەرمەزاری بکات، کە ئەوە هاوسەریەتی، بەڵام خاڵی دووەم بە شێوەیەکی ترە، ڕەنگە ژیانی ژنومێردەکە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە ژیانێکی ساخلەم و تەندروست بێت، لەگەڵ خۆیدا بیگەڕێنێت و سەردانی ماڵی خزم و ماڵی هاوڕێ خێزانداره‌کانی پێ بکات، لێی لووتەلا نەبێت، وەک ئاستەنگ و لەمپەری ژیانی لێی نەڕوانێت، بەڵام یەکێک لە عەیبەکانی ئەوەیە لەناو خەڵکدا ڕەخنە و تێبینییەکانی ڕووبەڕوو دەکاتەوە، لە کاتێکدا دەکرێت ئەو ڕەخنە و تێبینیانە دوا بخات و لە ماڵەوە بە تەنها ڕووبەڕووی بکاتەوە.

پێشەوای مەزن شافیعی دەفەرموێ: ئامۆژگاریکردنی کەسێک لەناو خەڵکدا ئابڕووبردنیەتی، ئەی ئەبێت ڕەخنەلێگرتنی لەناو خەڵکدا چۆن بێت، ئێمە لە شوێنی پەنهان و دوور لە چاوی خەڵک ئامادەین هەم ڕەخنە وەرگرین هەم ئامۆژگاری، بە مەرجێک بە زمانی نەرم و شێوازی جوان بێت، بەڵام لەناو خەڵکدا ئەو ئامادەگییەمان تێدا نییە، ئەگەرچی بە شێوازێکی زۆر جوانیش بێت!

ئەوەی وادەکات ڕەخنە و ئامۆژگارییەکانمان وەرگیراو بن سەرباری شێوازی جوان و زمانی شیرین، دەبێت کاتی گونجاویش دەستنیشان بکەین بۆ پێشکەشکردنیان.

نابینیت هەموو شتێک لەم بوونەوەرەدا هەمووی بە گوێرەی کات کار دەکات، خۆر لە کاتی دیاریکراودا هەڵدێت و لە کاتی

دیاریکراویشدا ئاوا دەبێت، وەرزەکان پێش و دوا ناکەون، هەموو وەرزێک کاتی هاتنی خۆی هەیە، درەختەکان لە کاتی بەهاردا گوڵ و گەڵا دەکەن، لە هاویندا بەرەکانیان پێدەگەن، جوتیارەکان لە کاتێکی دیاریکراودا تۆوەکانیان دەوەشێنن، ئەگەر کاتی خۆی نەبێت بەرهەم ناچننەوە، دەوامی فەرمانگەکان لە کاتێکی دیاریکراودا دەست پێ دەکات و لە کاتێکی دیاریکراوی تردا کۆتایی دێت، وانەکانی قوتابخانەیش هەروەها، جیهان بە شێوەیەکی گشتی هەم ئەوەی خوا خۆی دروستی کردووە وەک جووڵەی ئەستێرەکان و خۆر و مانگ، وەرزەکانی ساڵ، هەم ئەوەی مرۆڤ سەرۆکاری ڕێکخستنی دەکات وەک کاتەکانی دەوام و وانەکانی قوتابخانە و هتد... هەمووی بە گوێرەی کاتی دیاریکراو دەچن بەڕێوە، پابەندنەبوون بە کاتەوە شپرزەیی و بێسەرەوبەرەیی دروست دەکات، ئەو کاتەی خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێ، ئەوە نیشانەی تێکچوونی دونیایە!

ڕەخنە و ئامۆژگاری ئەگەر لە کاتی گونجاوی خۆیدا نەبێت، ئەوە وەک هەڵهاتنی خۆر وایە لە خۆرئاواوە، وەک هاتنی وەرزێک وایە پێش کاتی خۆی، وەک چاندنی تۆوی گەنم وایە دوای بەسەرچوونی کاتی خۆی، وەک لێکردنەوەی میوە وایە پێش پێگەیشتنی، ئەو کات وێرانکارییەک دروست دەبێت!

با وای دابنێین تۆ بانگهێشتی کەسوکارەکەت دەکەیت بۆ ئێوارەخوانێک، یەکێک لەو خواردنانەی هاوژینەکەت ئامادەی کردووە تۆزێک سوێرە، تۆش لە کاردانەوەی ئەوەدا پێی دەڵێیت: تۆ گوێ بەوە نادەیت بە ئەندازە خوێ بکەیتە ناو چێشتەوە!

متمانەی تەواوت هەبێت ئەم ڕەخنەیەی تۆ ڕەخنەیەکی بریندارکەرە، بەڵکوو ڕەخنەیەکی ڕووخێنەرە و دەروونی ئازار

دەدات، برینێکی وا لە دڵیدا دروست دەکات بە ئاسانی سارێژ نەبێت، بابەتەکە بە لای ئافرەتەکەوە لە بابەتی خوێ و خواردن گەورەترە، ئەمە بابەتی شکۆ و بەهایە، ئێمە خۆ تەنها گۆشت و خوێن نین، ئێمە پارچەیەکین لە هەست و سۆز، دڵشکاندن ئەگەرچی وەک ئیسکشکاندن قرچەی نایەت، بەڵام ئازاری لەو کەمتر نییە!

با ئێمە ئێستا واز لە هەموو ئەمانە بێنین و لەگەڵ بابەتی خواردنە سوێرەکە بە شێوەیەکی تر مامەڵە بکەین:

لە کاتی نانخواردنەکەدا هەست دەکەیت یەکێک لە چێشتەکان زیاد لە پێویست سوێرە، بەڵام هەر دەیخۆیت وەک ئەوەی هەموو شتێک ئاسایی بێت، سفرە هەڵدەگیرێ و میوانەکانماڵئاوایی دەکەن، ئێستا ئێوە بە تەنهان، پێی بڵێ: سوپاس بۆ ئەو خوانە بەتام و چێژەی سازت کردبوو، بە ڕاستی کابانێکی بەتوانا و کارامەیت، سەری خۆت و منیشت بەرز کردەوە، بەڵام تێبینیی ئەوەم کرد فڵانە خواردنت تۆزێ سوێر بوو! بۆ جارێکی تر وریابە لە دەستت دەرنەچێت خوێ زۆر بکەیتە ناو چێشتەکەتەوە! چونکە پێمخۆش نییە کەسێک بێتە ماڵەکەمانەوە و تێبینی لەسەر ئەو خوانەی کە ئەرکێکی زۆرتی پێوە کێشاوە بۆ دروست ببێ، گرنگە بە لامەوە تۆ کەسێکی ناوازە و نموونەیی بیت لە چاوی ئەوانی تردا!

تۆ لێرەدا ڕەخنەی لێناگریت و ئامۆژگاریشی ناکەیت، بەڵکوو بەرزی دەکەیتەوە بۆ ئاسمان و هەموو ئەو ماندووبوونەی بیر دەچێتەوە کە لە پێناوی میوانەکانی تۆدا چەشتویەتی!

تۆ لێرەدا چیت کردووە؟

ڕەچاوی دوو شتت کردووە:

یەکەم: کاتی گونجاو، دووەم: شێوازی جوان!

کاتێکی گونجاوت هەڵبژاردووە؛ چونکە ئێوە ئێستا تەنهان، ئەمەش خۆی بۆ خۆی وای لێ دەکات هەر ڕەخنە و تێبینییەکی ڕووبەڕوو بکەیتەوە، بە سنگێکی فراوانەوە لێت وەربگرێت، چونکە ئەوەی دەگوزەرێ تەنها لەنێوان خۆت و ئەودایە.

هەروەها شێوازی جوان دەربڕینیشت بەکار هێناوە، هەندێک جار لەبەر ئەوەی قسەکانمان زۆر توند و زبرن، دەنگدانەوەیەکی وای نابێت و بەرامبەریش پێشوازییەکی گەرموگوڕی لێ ناکات ئەرگەرچی ڕاست و پێویستیش بێت، کەواتە شێوازی جوانی دەربڕین خۆی بۆ خۆی بەشێکی دانەبڕاوە لە قسە و گفتوگۆ، نەک شتێکی زیادە و تەواوکاری بێت!

بە وردی سەرنج لەم چیرۆکە بدە:

جارێک پادشایەک خەوێکی سەیری بینی، لە خەویدا هەموو ددانەکانی کەوتنە خوارەوە و واقی وڕمابوو بە دیاریانەوە، پادشا بەم خەوە خەم و پەژارەیەکی زۆر دڵ و دەروونی داگیر کرد، بۆیە ناردی بەدوای خەوپەرژێنکەرێکدا بۆ ئەوەی خەوەکەی بۆ لێک بداتەوە، کابرا هات و پادشا خەوەکەی بۆ گێڕایەوە، وتی قوربان: واتای خەوەکەت ئەوەیە کەسوکارەکەت هەموویان دەمرن و تۆش بە ماتومەلولییەوە تەماشایان دەکەیت! پادشا بەم لێکدانەوەیە زۆر تووڕە بوو، فەرمانی کرد بیخەنە بەندینخانەوە، دوای ئەم لێکدانەوەیە، ترس و بیمی پادشا زیادی کرد، بۆیە خۆی پێ ڕانەگیرا و ناردی بەدوای خەوپەرژێنکەرێکی تردا، ئەمیش هات و خەوەکەی بۆ گێڕایەوە، وتی قوربان: بە خوا خەوێکی زۆر خراپت دیوە، واتاکەی ئەوەیە کەسوکارت هەموویان دەمرن و تۆش تەماشایان دەکەیت.

دووبارە پاشا تووڕە بوویەوە و فەرمانی کرد ئەمیشیان لە بەندینخانە توند کردا!

زۆری نەبرد پادشا داوای خەوپەرژێنکەرێکی تری کرد، هێنایان و دوای ئەوەی پادشا خەوەکەی بۆ گێڕایەوە، کابرا زەردەخەنەیەکی کرد و وتی: جەنابی پادشا! خەوێکی زۆر باشت دیوە و ماناکەی ئەوەیە تۆ لە هەموو کەسوکارەکەت تەمەنت درێژتر دەبێت.

ئەم لێکدانەوەیە زۆر دڵخۆشی کرد و فەرمانی کرد خەڵاتێکی شایستەی بکەن!

ئەگەر سەرنج بدەین ناوەڕۆکی قسەی هەرسێکیان هەر یەک شت بوو، مادام پادشا لە هەموو خزم و خوێشەکەی تەمەنی درێژتر بێت، کەواتە ئەوان هەموویان پێش پادشا دەمرن، بەڵام جیاوازی نێوان لێکدەرەوەی سێیەم لە لایەک و لێکدەرەوەی یەکەم و دووەم لە لایەکی ترەوە، لە شێوازی دەربڕیندا بوو!

تەنانەت شتە ناباشەکانیش دەکرێ بە شێوازی جوان بیانڵێین، بە پێچەوانەشەوە!

### ٣. تەنها سەرلەقاندن بەس نییە:

پێشتر وتمان کاتێک ئافرەت سکاڵای گرفتێک لە لای مێردەکەی دەکات مەرج نییە داوای چارەسەر بکات، زۆربەی کات خۆشی باش دەزانێت کە تۆ ناتوانیت گرفتەکەی بۆ چارەسەر بکەیت، یان ڕەنگە هەر پێویستیشی بە چارەسەر نەبێت، کاتێک ئەو پێتدەڵێت: ئەم جارەی دوایی کە چووم بۆ بازاڕ جلوبەرگێکی یەکجار جوانم بەدی کرد، بەڵام ئەو ڕەنگەی کە من حەزم لێی بوو پڕ بە بەری من نەبوو، ئەو بەم قسانەی داوای ئەوە لە تۆ ناکات هەستیت جلێکی بۆ بدوریت بە هەمان ڕەنگ و هەمان مۆدێل، ئەو تەنها دەیەوێت پێت بڵێت حەزم لە شتی جوان و کەشخەیە!

گرفتی زۆرێک لە پیاوان لەوەدایە وادەزانن تەنها بێدەنگبوون گوێگرتن بۆ قسەکانی ئافرەت، ئیتر ئەوە هەموو شتێکە!

ڕەنگە پیاوێک بڵێت: ئەوە نییە هەرچی دەڵێت گوێی لێ دەگرم و بواری پێ ئەدەم چی لە ناخیدایە هەڵیڕێژێت ئیتر لەوە زیاتر چی دەوێت؟

نا ئازیزەکەم دوو جۆر گوێگرتن هەیە، گوێگرتنی ئەرێنی و گوێگرتنی نەرێنی!

کاتێک ئافرەت دەست بە قسەکردن دەکات و سکاڵا لە دەست شتێک دەکات کە پێی قەڵس و بێزار بووە، هەندێک لە پیاوان سەرەلەقەیان بۆ دەکەن، ئەم جووڵەیە لە لای پیاوان واتاکەی ئەوەیە: بەڵێ باش گوێم لێیە! بەڵام بە لای ئافرەتەوە ئەم جۆرە گوێگرتنە گوێگرتنێکی نەرێنیە و واتاکەی ئەوەیە: باشە، کەی ئەیبڕیتەوە!

خۆ ئەگەر زوو زووش وشەی بەڵێی بۆ دووبارە کردەوە، ئەمە ئەگەرچی لە لای پیاوان واتاکەی ئەوەیە: باشە، لێت تێدەگەم، بەڵام لای ئافرەت دووبارە گوێگرتنێکی نەرێنییە و واتاکەی ئەوەیە: ئەرێ ئەم بەیت و باڵۆرە کۆتایی نەهات!

ئافرەت پێویستی بەوەیە گوێی لێ بگیرێت، بەڵام ئەم جۆرە گوێگرتنە نەرێنییانە ئەو هەستەی لە لا دروست دەکات کە تۆ وەک پێویست گرنگی پێ نادەیت و لە قسەکانی بێزاریت و بەوپەڕی پەرۆشیەوە چاوەڕوانی ئەو ساتە دەکەیت کە کۆتایی پێ بێنێت!

ئافرەت پێویستی بە گوێلێگرتنی ئەرێنییە.

کاتێک هاوژینەکەت قسە دەربارەی شتێک دەکات کە پێی قەڵس و بێزار بووە، هەوڵ بدە تۆش کارلێکی لەگەڵدا بکەیت بەبێ ئەوەی قسەکەی پێ ببڕیت، ئەو دەیەوێت پاڵپشتی وەربگرێت، ئەو

وشانە بڵێت کە وەک بەردی گەورە لەسەر سنگی کۆ بووەتەوە، خۆ ڕەنگە ئەو بابەتەی کە ئەو سکاڵای لە دەست دەکات بە لای تۆ و بە لای هەر کەسێکی ترەوە، شتێکی ئاسایی و کەم بایەخ بێت، بەڵام بە لای ئەوەوە گەورە و گرنگە و هیچ شتێکیش لەو بۆچوونە پاشگەزی ناکاتەوە!

ناوبەناو پێی بڵێ: ڕاست دەکەیت حەق لای تۆیە (نیگەران مەبە هەموو شتێک بە دڵی تۆ دەبێت)، تۆ لە لای من زۆر بەنرخیت و ڕێگە نادەم ئەو شتە لەمە زیاتر دڵت ئازار بدات!

ئەم وشانە هەر وەک چۆن ئەسفەنج ئاو هەڵدەمژێت، ئاوا توورەیی هاوژینەکەت هەڵدەمژێت و هەست دەکات تۆ گرنگیی پێ دەدەیت و بێزار نیت لە گلەیی و گازەندەکانی!

تەنها بێدەنگبوون لە ئاستی قسەکانیدا بەس نییە؛ چونکە ئەوە گوێگرتنێکی نەرێنییە و وا هەست دەکات کە تۆ لە بەرەی ئەودا نیت و درز و کەلێن لە نێوانتاندا هەیە، گوێگرتنی ئەرێنی ئەوەیە بە ڕستەی کورت، ناوبڕ بخەیتە ناو قسەکانیەوە و ئەمەش وادەکات کۆتایی بە بابەتەکە بێنێت و پێویست بە چارەسەری کێشەکەش نەکات، چونکە هەر لە بنەڕەتەوە کێشە بوونی نەبووە و هەموو شتێک لە شوێنی سروشتی خۆیدا بووە، بەڵام ئەو شەکەت و ماندوو بووە، ئەوەندەی پێویستی بەوە بووە کەسێک بینرخێنێ و لێی تێبگات و گوێی بۆ بگرێت، ئەوەندە پێویستی بە چارەسەری کێشەکە نەبووە، بە تایبەتی ئەو کێشانەی کە پەیوەندی بە منداڵەکانیەوە هەیە!

تۆ بیر بکەرەوە یەکێک لە کێشە و گیروگرفتەکانی ئەوەیە منداڵەکانی گرنگی بە ژوورەکانی خۆیان نادەن و شتەکان ناگەڕێننەوە بۆ شوێنی تایبەتی خۆیان، لەمەدا تەنها منداڵەکانی

ئەو وا نین، بەڵکوو ۹۰٪ـی منداڵانی جیهان، بگرە زیاتریش هەر ئاوان، ئێمە خۆمان منداڵ بووین و ئاوا بووین، منداڵانی تری جیهانیش ژوورەکانیان لە شپرزەیی و بێسەروبەرەییدا وەک مەیدانی جەنگ وایە، ئەوەی بە تۆ دەکرێت ئەوەیە ئامۆژگاریان بکەیت، ئەمەشت لە پێشوودا چەندین جار کردووە، ڕەنگە ئەم هەمووە هاتوهاوارەی هاوژینەکەت بۆ دەربڕینی ئەو هەستە بێت کە تۆ لە ژیانیدایت و پشتیوانیی لێ دەکەیت!

٤. بۆنە تایبەتییەکانی لە یاد مەکە:

بە لای خانمانەوە بۆنە تایبەتییەکانیان وەک جەژنی سەربەخۆیی وڵاتان وایە، نابێت وەک ڕۆژانی ئاسایی تێبپەڕن، بەڵکوو پێویستە مەراسیم و ڕێوڕەسمی تایبەتی بۆ ڕێک بخرێت و زیندوو ڕابگیرێت، ئەمە لە کاتێکدایە بۆنە تایبەتیەکان لە لای پیاوان ئەو گرنگییە زۆرەی نییە، بە پێشوازێکی کەم مەبەستەکە بەدی دێت!

بۆ نموونە کارەساتێکی گەورە دەخولقێ ئەگەر ڕۆژی لەدایکبوونی هاوژینەکەت لە یاد بچێت و بۆ ئەو بۆنەیە هیچ دیارییەکی بۆ نەکڕیت، گرنگ نییە دیارییەکە نرخی چەندە، پشتگوێخستنی ئەم بابەتە شتێکی بێزارکەرە بە لای هاوژینەکەتەوە، شتەکە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە دیارییەکەوە نییە، بە لای ئافرەتەوە دیاری پەیامێکە و پێی دەڵێت ئەوەتا من تۆم لە بیر نەکردووە و گرنگیت پێ ئەدەم!

بە پێچەوانەشەوە لەبیرکردنی ئەم بۆنەیە، یان تێپەڕاندنی بەبێ ڕێوڕەسمێکی تایبەتی ئەگەرچی ئاسایی و کەمخەرجیش بێت، هیچ شتێکی لێ ناخوێنێتەوە ئەوە نەبێت: کە تۆم لە بیر نییە و گرنگیت پێ نادەم!

ئەم بابەتە لە لای پیاوان بەو ئەندازەیە جێی بایەخ و گرنگیپێدان نییە، ئەڵبەت پیاوان پێیان ناخۆش نییە ئەگەر هاوژینەکانیان لە ڕۆژی لەدایکبوونیاندا دیاریان پێشکەش بکەن، مەبەستەکەی من ئەوەیە پیاوان پێشوازینەکردن لە ڕۆژی لەدایکبوونیان وای ناخوێننەوە کە لە بیر کراون، یان گرنگیان پێ نەدراوە!

هەروەها ساڵڕۆژی هاوسەرگیریش لە لای خانمان ڕۆژێکی پیرۆزە، یادکردنەوە و گرنگیپێدانی بە واتای تازەکردنەوەی پەیمان و بەڵێن دێت لە لای ئەوان، هەر وەک چۆن پادشاکان لە ساڵڕۆژی چوونە سەر تەختی پادشایەتی لە لایەن هاوولاتیانی مەملەکەتەکەیانەوە بەڵێن و پەیمانیان بۆ دووپات دەکرێتەوە!

ئەوەی مەبەستی پیاوانە لە هاوسەرگیری خودی هاوسەرگیرییەکەیە و هیچی تر، ئەوە گرێبەستێک بوو لە سەری پێکهاتن و کۆتایی هات، زۆربەی پیاوان لەوە تێناگەن باشە بۆ دەبێت هەموو ساڵێک ئەم مێژووە زیندوو بکرێتەوە، وەک ئەوەی ئەو ڕۆژە ڕۆژی دەرپەڕاندنی سوپای داگیرکەر بێت لە وڵات!

کەواتە کاتێک پیاوان گرنگی بە ساڵڕۆژی هاوسەرگیریان نادەن، ئەمە مانای ئەوە نییە گرنگی بە خودی هاوسەرگیرییەکەش نادەن، بە پێچەوانەوە ئەمە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە ئەوەندەی خانمان گرنگی بە بۆنە مێژووییەکان دەدەن پیاوان ئەوەندە گرنگیان پێ نادەن!

بۆنە تایبەتییەکان جێگای گرنگی و بایەخی پیاوان نین، تەنانەت زۆربەی پیاوان بەروار و مێژووی هاوسەرگیرییەکەیان لەبەر نییە، هەندێک لە پیاوانیش کە لەبەریانە لەبەر ئەوەیە دەزانن هاوسەرەکانیان زۆر تووڕە و بێزار دەبن ئەگەر ئەو مێژووەیان لە بیر بچێتەوە!

ئافرەتان هەمیشە ڕۆژی هاوسەرگیری خۆیان لە بیرە، ئەمەش بۆ ئەوە ناگەڕێتەوە کە ئەمان زیاتر لە پیاوان خۆشەویستیان هەیە، بەڵکوو بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە ئافرەتان زیاتر گرنگی بە شوێنەواری شتەکان دەدەن و پیاوانیش بە خودی شتەکان!

کاتێک ئەم جیاوازییە سەرچاوەکەی بۆ جیاوازی سروشت و پێکهاتەی فیسیۆلۆجی بگەڕێتەوە ئیتر هەوڵی چارەسەرکردنی لە ڕێی قەناعەتپێکردنی بەرامبەرەوە هەوڵێکی بێهوودە و بێبەرهەم دەبێت، چونکە بابەتەکە ئەوەندەی پەیوەندی بە سروشتی مرۆڤەکانەوە هەیە، ئەوەندە پەیوەندی بە تێڕوانین و بیر و بۆچوونیانەوە نییە هەتا بتوانین لە ڕێی گفتوگۆوە بیگۆڕین!

بۆیە پیاوانی ئازیز! دەبێت لەم شتەدا ڕەچاوی سروشتی هاوژینەکانتان بکەن و هەوڵ بدەن مێژووی ئەو بۆنانەتان بیر نەچێت و گرنگی پێ بدەن؛ چونکە ئەمە شتێکە هەستی خۆشبەختی لە دەروونیاندا دروست دەکات، ئەرکی هەر کەسێکیشە هەر شتێکی پێ بکرێت بۆ دڵشادکردنی هاوژینەکەی دریخی نەکات، ئەگەرچی ئەو شتەش لە لای خۆی جێگای بایەخ و گرنگیپێدان نەبێت!

ئێوەش ئافرەتانی ئازیز! لە بەرامبەردا پێویستە ڕەچاوی سروشت و جۆری بیرکردنەوەی پیاوان بکەن، لەبیرکردنی ئەم بۆنانە لە لایەن پیاوانەوە لەبەر ئەوە نییە ئێوە بە گرنگ نازانن، بەڵکوو لەبەر ئەوەیە پەیوەندی و پەیوەستبوونی ئەوان بەم جۆرە مێژووانەوە کەمترە لە پەیوەستبوونی ئێوەوە پێیانەوە!

گرفتی ژنان لەوەدایە مێژووی ئەم بۆنانەیان هەمیشە لە یادە، بەڵام بە مێردەکانیان ناڵێن و ئەیشارنەوە بۆ ئەوەی مێردەکانیان خۆیان گرنگی پێ بدەن و لە یادی نەکەن، ئەڵبەت هیچ شتێک لەوە باشتر و جوانتر نییە مرۆڤ خۆی بۆ خۆی گرنگی بە شتەکان

بدات نەک لە ڕێی کەسانی ترەوە، بەڵام بۆ دەبێت ئافرەت داو بۆ هاوسەرەکەی بنێتەوە بۆ ئەوەی بزانێت پێوە ئەبێت، یان باز بە سەریدا دەدات؟ ئافرەتی ژیر هەرگیز ئەمە ناکات، بەڵکوو لەگەڵ نزیکبوونەوەی بۆنەکە ئاماژە بۆ ئەو شتە دەکات کە حەزی لێ دەکات و خۆزگە دەخوازێت لە ڕۆژی لەدایکبوونیدا یان لە ساڵڕۆژی هاوسەرگیرییەکەیاندا بە دیاری پێی بدرێت، ئەگەر ئاوای کرد ئیتر مێردەکەشی بەئاگا دێتەوە و بایەخی پێ دەدات، ئێمە دەبێت لە ژیانی ژنومێردایەتیدا پردی پەیوەندی دروست بکەین نەک دیواری بەربەست!

تۆش ئەی پیاوی ئازیز! شتەکە هێندەش قورس و گران وەرمەگرە، هەموومان خاوەنی مۆبایلی زیرەکین، دەتوانین زەنگی ئاگادارکردنەوە لەسەر ئەو بەروارە دابنێین و گرنگییەکی ئاسایی پێ بدەین، دیارییەک، چەپکە گوڵێک، لەئامێزگرتنێک مەبەستەکە دێنێتە دی، ئێمە لە ژیانی ڕۆژانەماندا زۆر شت دەکەین لە پێناوی ئەوانی تردا، لەسەر کارەکەمان هەندێک شت ئەکەین و باوەڕیشمان پێی نییە؛ هۆکارەکەش ئەوەیە سروشتی کارەکەمان وا دەخوازێت، یان بۆ ڕازیکردنی دڵی بەڕێوەبەرەکەمانە، ئێمە ڕەچاوی دڵناسکی هەندێک خزم و هاوڕێ و دەرودراوسێ دەکەین، نەوەک زویر بن، باشە چ گرفتێک دروست دەبێت ئەگەر ئێمە لەماڵیشەوە بە هەمان عەقڵییەت هەڵسوکەوت بکەین؟

٥. لە هاوڕێکانی دامەبیڕە:

هاوسەرگیری گرێبەستی هاوبەشییە، نەک گرێبەستی بەموڵککردن!

ئێمە کاتێک ئەچینە ناو ژیانی هاوسەرگیرییەوە دەبێت ئەوە بزانین پێویستە دەستبەرداری شێوازی ژیانی ڕەبەنی ببین، بۆ

نموونە پیاو دەبێت کاتەکانی خۆی ڕێک بخات لەنێوان ئەمانەدا: کارەکەی، ماڵەوە، هاوڕێکانی، حەز و خولیاکانی، کارێکی بەجێ ناکات ئەگەر بە هەمان شێواز و عەقڵیەتی ڕابردوو بژی، ئافرەتیش بە هەمان شێوە، هەر کە چووە ماڵی مێردەکەیەوە، ئیتر دەبێت لەوە تێبگا لە بەردەم بارودۆخێکی نوێدایە و دەبێت بە عەقڵیەتێکی نوێوە مامەڵە لەگەڵ ژیاندا بکات!

بۆ ژنومێرد باشتر وایە بە تەواوی ژیانی یەکتر قۆرخ نەکەن و بۆ هەر یەکەیان ڕووبەرێکی تایبەت بە خۆی بمێنێتەوە، کارێکی تەندروست نییە پیاو داوا لە هاوژینەکەی بکات هەموو ڕابردووی خۆی لە بیر بباتەوە بە هاوڕێ و ناسراوەکانیشیەوە، ژیانێکی تازە دەست پێ بکات وەک ئەوەی ئەو ڕۆژە لە دایک بووبێت، بە هەمان شێوە تەندروست نییە ئافرەتیش مێردەکەی بکاتە کۆیلەی خۆی و ڕێگەی هەموو جموجوڵێکی لێ بگرێت، بێگومان هەر یەکەیان بەسەر ئەوی ترەوە مافی هەیە، هەر لە مافی خۆشەویستییەوە بیگرە تا دەگات بە یارمەتیدان و گرنگیپێدان و تەرخانکردنی کات هتد... بەڵام هیچ یەکێک لەم مافانە ناکۆک نییە لەگەڵ ئەوەی مرۆڤ هاوڕێی هەبێت!

ئافرەتان زیاتر لە پیاوان بە لایانەوە ئاساییە کە هاوڕێ لە ژیانی هاوسەرەکانیاندا هەبێت، هەندێک جاریش کە دەبینیت ئافرەت بێزاریی خۆی لە هاوڕێیانی هاوسەرەکەی دەردەبڕێت لەبەر خودی هاوڕێکانی نییە، بەڵکوو لەبەر ئەوەیە مێردەکەی زۆربەی کاتەکانی لەگەڵ ئەواندا بەسەر دەبات و ئەمی فەرامۆش کردووە.

ژیانی ژنومێردایەتی وەک ئەوە وایە چۆلەکە پاسارییەک لە مشتتدا بێت، ئەگەر توند بیگریت، دەخنکێت و مردار دەبێتەوە،

ئەگەر شلیش بیگریت، لە دەستت هەڵدێت و لە شەقەی باڵ دەدات، بەڵام ئەگەر بە نەرمی گرتت، نە لە دەستت ڕادەکات و نە زیانیشی پێ دەگات!

ئێمەش دەبێت ئەم بابەتە بە نەرمی بگرین، بوونی هاوڕێ لە ژیانماندا شتێکی باش و تەندروستە و کاریگەریی ئەرێنی لەسەر باری دەروونیمان دروست دەکات، بۆیە پارێزگاریکردنی هەر لایەکمان لە هاوڕێکانمان دوای پرۆسەی هاوسەرگیری دەکرێت سوودێکی باشی بۆ سەرخستنی هاوسەرگیرییەکەمان هەبێت.

ئاساییە ئەگەر پیاو لە یەکێک لە هاوڕێکانی هاوژینەکەی بێزار بێت لەبەر هۆیەک لە هۆیەکان، بەڵام ئاسایی نییە تەنها لەبەر ئەوەی هاوڕێیەتی لێی بێزار بێت!

هاوژینەکەت بێبەش مەکە لە هاوڕێکانی، ئەم بیرۆکەیە هەرگیز لە یاد نەکەیت!

ڕێککەوتن لەسەر ڕێکخستنی کاتەکان و خەرجی و پێداویستییەکانی خێزان، ئەوە شتێکی ترە، بەڵام بێبەشکردنی هاوژینەکەت لە هاوڕێکانی کارێکی یەکجار خراپە و کاریگەری نەرێنی لەسەر جۆری پەیوەندی نێوانتان دروست دەکات، ئەگەر مەترسی لەسەر بەردەوامبوونیشی دروست نەکات، ئێمە نامانەوێت تەنها پەیوەندییەکە بەردەوام بێت و بەس، بەڵکوو دەمانەوێت پەیوەندی نێوانتان تۆکمە و لێوانلێو بێت لە خۆشەویستی و ڕەزامەندی و یەکتر قەبوڵکردن! نەخۆش لە ژووری چاودێری و لەژێر ئامێرە پزیشکییەکاندا ڕاستە دەتوانیت پێی بڵێیت زیندوو بەڵام چەندێک لە ژیانەوە نزیک بێت، ئەوەندەش لە مردنەوە نزیکە، ئێمە نامانەوێت تەنها پەیوەندی هەبێت دەمانەوێت تۆکمەش بێت!

**٦. ڕێگەی ماڵی کەسوکاری لێ مەگرە:**

ئێمە کاتێک هاوسەرگیری دەکەین، هاوسەرگیری لەگەڵ کەسێکدا دەکەین کە خاوەنی کەسوکارە، جوامێری لەوەدایە ڕێگەی سیلەی ڕەحم نەگرین، چاکەکردن لەگەڵ باوک و دایکدا و بەجێهێنانی سیلەی ڕەحم وەک نوێژ و ڕۆژوو بە پەرستش دادەنرێت، پێویستە لەسەر هەر یەک لە ژن و پیاو گرنگی بە دواڕۆژی یەکتری بدەن، وەک چۆن گرنگی بە دنیای یەکتری دەدەن، ئەمە لە ڕوانگە ئایینییەکەوە، لە ڕوانگە دنیاییەکەشەوە ئەوەی خێروبێری بۆ کەسوکاری خۆی نەبێت، خێری بۆ خەڵکانی تریش نابێت! هەرکەس وەفای بۆ چاکەی دایک و باوکی نەبێت، وەفای بۆ چاکەی کەسانی تریش نابێت، چونکە خەڵک هەرچەندە چاکەمان لەگەڵدا بکەن، ناگاتە دەیەکی چاکەی دایک و باوکمان!

پیاوی ژیر لە ژنێک ناترسێت کە باش بێت بۆ کەسوکارەکەی، بەڵکوو لە ژنێک دەترسێت کە ناهەموار و نالەبار بێت بۆیان، چونکە ئەوەی چاکەی کەسوکارەکەی لە پێش چاو نەگرێت، چۆن چاکەی تۆ لە پێش چاو دەگرێت؟

هەروەها ژنی ژیریش لە پیاوێک ناترسێت کە باش بێت بۆ کەسوکارەکەی، بەڵکوو لە پیاوێک دەترسێت کە نالەبار بێت بۆیان، چونکە ئەوەی چاکەی کەسوکارەکەی لە پێش چاو نەگرێت، چۆن چاکەی ئەو لە پێش چاو دەگرێت، ئەو پیاوەی قوربانییەکانی دایکی لە بیر بکات، چۆن قوربانییەکانی هاوژینەکەی لە بیر ناکات!

باشەکان جێگەی ترس نین، لاسارەکان ترسناکن!

نەنکم بۆی گێڕامەوە وتی: جارێک گەنجێک چووە خوازبێنی کچێک لە گوندێکی دراوسێیان، کەسوکاری هەموو ڕازی بوون

و هاوسەرگیرییەکە سەری گرت، لە بەیانی شەوی پەردەدا زاوا چوو بۆ بازار و دوو جۆر گۆشتی هێنا، جۆرێکی ناسک و جوان، جۆرێکی تر پیر و بێکەڵک!

کاتێک گەڕایەوە بۆماڵەوە، هاوژینەکەی لێی پرسی ئەری ئەم دوو جۆرە گۆشتە چییە یەکێکیان زۆر باش و ئەویتریان زۆر بێکەڵکە؟

ئەویش وتی: جۆرە باشەکەم هێناوە بۆ خۆمان پێکەوە ئەیخۆین، جۆرە خراپەکەشم هێناوە کە دایکم هات بۆ سەردانمان دەرخواردی ئەدەین!

ژنەکە هیچی نەوت هەتا ڕۆژێک دایک و باوکی هاتن بۆ سەردانی، داوای لێ کردن لە مێردەکەی جیا بکەنەوە و ڕووداوەکەی بۆ گێڕانەوە و وتی: نامەوێت منداڵێک بخەمەوە کە وەک ئەم سپڵە و بێئەمەک بێت بەرامبەر بە دایک و باوکی، ئێوە منتان وا پەروەردە کردووە و تێتانگەیاندوم هەرکەسێک خێروبێری بۆ کەسوکاری خۆی نەبوو، باشتر بۆ خەڵکانی تری نابێت!

زۆرم لە لا سەیرە هەندێک لە پیاوان ڕێگە لە هاوژینەکانیان دەگرن سەردانی ماڵی خزم و کەسوکاریان بکەن، من لەوە تێناگەم چ گرفتێک هەیە ئەگەر مرۆڤ کەسوکاری هەبێت، بە پێچەوانەوە گرفت لەوەدایە کابرا کەسوکاری هەبێت و هەر بە زیندوویی بیانمرێنێت، پیاوی مەرد و جوامێر ڕێگە خۆش دەکات بۆ هاوژینەکەی بۆ ئەوەی پەیوەندی خزمایەتی پتەوتر بکات، نەک بیپچڕێنێت!

ئێمە خەڵکی بەهەشتین، خەڵکی ئەم هەسارەیە نین، بۆ سەردان هاتووین بۆ ئێرە و ئەو سەردانەش هەر بە کۆتا دەگات، پێویستە لە ماوەی ئەم سەردانەدا بە شێوەیەک هەڵسوکەوت بکەین کە

یارمەتیدەر بێت بۆ گەڕانەوە بۆ ئەو شوێنەی کە ڕیشەمان لێی داکوتاوە، کەسێک خۆی نالەبار بێت، یان بیەوێت ئێمە نالەبار بکات، ئەبێ چۆن بتوانێت بگەڕێتەوە بۆ بەهەشت!

ڕێکخستنی پەیوەندی لەگەڵ کەسوکاردا سەبارەت بە سەردان و پێشوازیکردن لێیان هیچ شتێکی تێدا نییە، چونکە ژیان پێویستی بە ڕێکخستنە، بەڵام ڕێگریکردن کارێکی ناپەسەند و نائەخلاقییە، سەرەڕای ئەوەش تاوانێکی گەورەیە!

جارێک دایکی ئەسمای کچی ئەبوبەکر هات بۆ سەردانی کچەکەی، ئەو کات هێشتا مسوڵمان نەبووبوو، ئەسما وایدەزانی لەبەر ئەوەی دایکی بێباوەڕە و هاوەڵدانەرە ڕەنگە گوناهبار ببێ ئەگەر پێشوازی لێ بکات؛ بۆیە کەسێکی نارد بۆ لای پێغەمبەری خودا دروودی خوای لەسەر بێت بۆ ئەوەی پرسیاری لێ بکات ئایا دروستە پێشوازی لە دایکە هاوەڵدانەرەکەی بکات و سیلەی ڕەحمی لەگەڵدا بەجێ بهێنێ یاخود نا؟

پێغەمبەری خوا وەڵامەکەی بۆ ڕەوانە کردەوە و فەرمووی: بچۆ پێشوازی لێ بکە و سیلەی ڕەحمی لەگەڵدا بەجێ بهێنە!

بیر بکەرەوە: دایک بێباوەڕ و کچ ئیماندار، بەڵام پێغەمبەری خودا ڕێگە نادات ئازاری ئەو دایکە بێبڕوایە بدرێت و لە بینینی کچەکەی بێبەش بکرێت، ئەی باشە ئێمە چۆن دەمانەوێت ئەو کارە بکەین و فەرمانیشی پێ بکەین؟ ئەبێ ترس و بیمی تۆ لە ژنی نالەبار بێت، نەک لە ژنی سەرڕاست.

لە بەرامبەردا بە چ یاساو و لۆژیکێک تۆ دەتەوێت هاوژینەکەت ڕێزی کەسوکارت بگرێت و سەردانیان بکات، کەچی ڕێگەی ماڵی کەسوکاری خۆیی لێ دەگریت، هەموو کەسێک کەسوکاری خۆی لە لا خۆشەویستە!

پاشـان بـە ڕای تـۆ دەبێـت بـاری دەروونـی هاوژینەکـەت چـۆن بێـت کاتێـک بەبـێ هیـچ هۆکارێـک جگـە لـە ملهـوڕی خـۆت بێبەشـی دەکەیـت لـە بینینـی کەسـوکارەکەی، تەنانـەت ئەگـەر لەگـەڵ کەسـوکارەکەیدا ناکۆکییەکیشـت هەبێـت، کـە پەسـەند نییـە هەتبێـت؛ چونکـە کەسـوکاری ئەویـش وەک کەسـوکاری خـۆت وایـە، هەڵەیـە ڕێگـەی بینینـی کەسـوکارەکەی لـێ بگریـت، بوارێـک بـۆ ڕێککەوتـن بهێڵـەرەوە، دارسـتانێک مەسـوتێنە لەبـەر ئـەوەی مێروولەیەکـی نـاوی گازێکـی لـێ گرتـووی. خانوویـەک مەڕووخێنـە لەبـەر ئـەوەی مێشـێکی تێچـووە، پێویسـتە بـە ژیـری و ئـاوەزەوە هەڵسـوکەوت بکەیـن، ئـەو کەسـەی نەزانێـت چـۆن ناکۆکـی لەگـەڵ ئەوانـی تردا دەکات، ناشـزانێت چـۆن ڕیککەوتنیـان لەگەڵـدا بـکات!

**٧. لە بەردەم ئەودا ستایشی جوانیی ئافرەتانی تر مەکە:**

ستایشـکردنی خەڵکـی شـتێکی خـراپ نییـە، بـە پێچەوانـەوە مرۆڤـی مـەرد هەمیشـە نـرخ بـۆ ڕەوشـت و خـووە باشـەکانی ئەوانـی تـر دادەنێـت، لـە کاتـی پێویستیشـدا بـە ڕێـزەوە باسـی لێـوە دەکات، چەنـدم پێخۆشـە کاتێـک کەسـێک پەیوەندییەکـی تەلەفونـی بـۆ دێـت و دوای تەواوبوونـی پەیوەندییەکـە دەڵێـت: ئەمـە فـلان هاوڕێـی دێرینمـە، پیاوێکـی تـا بڵێـی جوامێـر و ڕەوشـتبەرزە!

شـاردنەوەی خراپەکانـی خەڵـک چەنـدە جـوان بێـت، باسـکردنی چاکەکانیـان جوانتـرە، بـە مەرجێـک خۆیـان لـەو شـوێنە ئامـادە نەبـن.

چەنـد جوانـە پیـاو باسـی ڕەوشـتبەرزی هاوڕێکـەی خـۆی بـکات کاتێـک خـۆی لـەوێ نییـە، چەنـد جوانـە ئافـرەت باسـی ڕەوشـتبەرزی هاوڕێکـەی خـۆی بـکات، کاتێـک خـۆی لـەوێ نییـە.

ئـەی کەواتـە گرفتەکە لە کوێدایە؟

گرفتەکە لەوەدایە ستایشی کەسێک بکەیت کە مافی ئەوەت نەبێت لە بەردەمی هاوژینەکەتدا ستایشی بکەیت، هەندێک ستایشی ڕەگەزی بەرامبەر هەیە شتێکی ئاساییە و هیچ گرفتێکی تێدا نییە، بۆ نموونە:

لە شوێنێکی گشتیدا و لەگەڵ هاوژینەکەتدا تووشی یەکێک لەو ژنانە دەبیت کە لە کارگەیەکدا پێکەوە کار دەکەن، دوای ئەوەی کە خواحافیزی دەکات بە هاوژینەکەت دەڵێیت: ئەم ئافرەتە ئافرەتێکی زۆر ڕێزدار و ڕەوشتبەرزە و هاوکاریی هەموو کەسێکیش دەکات، ماوەیەکی زۆر هاوسەرەکەی نەخۆش بوو، دانی بە خۆیدا گرت و خزمەتێکی باشی کرد، ئەم جۆرە ستایشانە هیچ شتێکی تێدا نییە و تۆ تەنها ئەتەوێت ئەوە بە هاوژینەکەت بڵێی: من نرخ بۆ ڕەوشت و هەستە مرۆڤدۆستانەکەی دادەنێم و خەڵکانی بەوەفام خۆش دەوێت و حەز بە بینینیان دەکەم!

بەڵام ستایشی جوانیی ژنانی هاوڕێت بریندارکەرە بۆ هاوژینەکەت، تۆ بیر بکەرەوە ئەگەر لە دوای خواحافیزی هاوڕێ ئافرەتەکەت، بە هاوژینەکەت بوتایە: دیت چەند جوان و ناسک و نازدار بوو؟

تۆ بەم قسەیە هاوژینەکەت تەنها بریندار ناکەیت، بەڵکوو بەبێ ئەوەی بە خۆت بزانیت پێی دەڵێیت: تۆ لە جوانیدا ناگەیت بەو، هەروەها پێی دەڵێت: تۆ لە ئاستی پێویستدا نیت و ناچارم چاو بە ئەملاوئەولادا بگێڕم، لە هەمووی خراپتر ئەوەیە هاوژینەکەت دڕدۆنگ و بەدگومان دەکەیت بەرامبەر بە خۆت!

با وای دابنێین ئافرەتێک هەیە و لە چاوی تۆدا زۆر جوانە، باشە چ هۆکارێک هەیە بۆ ئەوەی ئەمە بە هاوژینەکەت بڵێی، یاخود پێدانی ئەم زانیارییە چ سوودێکی هەیە؟ عەرەب لە کۆنەوە

وتوویانە: هەموو شتێک بۆ وتن نابێت! ئەرکی تۆیە پارێزگاری لە شکۆی هاوژینەکەت بکەیت، هەروەک چۆن ئەوەش ئەرکی ئەوە بەرامبەر بە تۆ!

تۆ ڕەنگە ڕێگە بە هاوژینەکەت بدەیت کە بڵێت: مێردی هاوڕێکەم زۆر ڕەوشتبەرزە، زۆر ڕێزی ژنەکەی دەگرێت، بە نەرمونیانی مامەڵەی لەگەڵدا دەکات و ڕێزی کەسوکارەکەشی دەگرێت، بەڵام هەرگیز ڕێگەی پێ نادەیت بڵێ جوان و لەبارە! باشە بۆ دەبێت ئەو ڕێگەی شتێک بە تۆ بدات کە تۆ ڕێگەی ئەو شتە بە ئەو نادەیت، بیر بکەرەوە ئەگەر هاوژینەکەت بیوتایە مێردی هاوڕێکەم زۆر قۆز و کەشخەیە، چ برینێکی قووڵی لە ناختدا دروست دەکرد، ئەویش هەمان برین لە ناخیدا دروست دەبێت، کاتێک تۆ ستایشی جوانیی ئافرەتانی تر دەکەیت.

ئەگەر جیهان پڕ بێت لە ئافرەتی جوان، بە هەمان شێوە پڕیەتی لە پیاوی جوانیش، وەک چۆن تۆ ئافرەتی جوان دەبینیت، ئەویش چاوی هەیە و پیاوی جوان دەبینێت. بینینی ئافرەتی جوان و پیاوی جوان ڕووداوێکی ئاسایی ڕۆژانەیە، بەڵام ئایا ئەم ڕووداوە ئاساییە هەر بە ئاسایی دەمێنێتەوە کاتێک ئەیدەین بە گوێی هاوژینەکانماندا!

ئەڵبەت ئەوە پیاوانن ستایشی جوانیی ئافرەتان دەکەن، لە ٩٩٪ـی ئافرەتان ئەو کارە ناکەن، بە داخەوە پیاوان ئاوا بیر دەکەنەوە: ئێمە پیاوین و پیاویش بەس گیرفانی خاڵی نەبێت، ئیتر هیچ شتێکی پێ شوورەیی نییە.

ئەوە کێ ئەم ڕیسا پووچەی داڕشتووە؟ هەر شتێک بۆ ئافرەت شوورەیی بێت، بە هەمان شێوە بۆ پیاویش شورەییە!

هەڵسەنگاندنی خەڵک تەنها لە ڕێی گیرفانیانەوە ڕێسای بازرگانە چاوچنۆکەکانە، نەک مرۆڤە مەرد و جوامێرەکان.

هەندێک لە پیاوان ستایشی جوانیی ئافرەتانی تر لە لای هاوژینەکانیاندا دەکەن، تەنها بۆ ئەوەی غیرەیان جۆش بدەن، ئەوان چێژ وەردەگرن کاتێک ئەبینن ئاگری غیرە دڵ و دەروونی هاوژینەکانیان دەخوات، بە ڕای من چێژوەرگرتن لە بینینی ئازاری ئەوانیتر جۆرێکە لە نەخۆشیی دەروونی، ئەرکی تۆی پیاو ئەوەیە کەموکورتی هاوژینەکەت چارەسەر بکەیت، نەک هێندەی تر وێرانی بکەیت، هەموومان لەگەڵ هەڵکشانی تەمەنماندا شتێک لە جوانی و گەشاوەییەکەمان لە دەست ئەدەین، ئافرەت زۆر لە پیاو هەستیارترە سەبارەت بە لەدەستدانی شتێک لە جوانییەکانی، ئەو پێویستی بەوەیە تۆوی متمانەبەخۆبوونی تێدا بچێنیت، نەک تێکی بشکێنی، هیچ شتێک هێندەی ئەوە ئازاربەخش نییە بە هاوژینەکەت بڵێی: تۆ چیتر بەس نیت و ناتوانیت کەلێنەکانی ژیانی من پڕ بکەیتەوە، کاتێک تۆ ستایشی جوانیی ئافرەتانی تر ئەدەیت بە گوێیدا ناڕاستەوخۆ پێی دەڵێی تۆ چیتر بەس نیت و حەز و ئارەزووەکانی من بە تۆ تێر نابێت!

٨. ڕێز لە ڕا و بۆچوونەکانی بگرە:

ئافرەت هەمیشە پێی خۆشە پێی بڵێن: جوان و شۆخوشەنگی، ئەمەش مانای ئەوە نییە ئافرەت تەنها جەستەیە و هیچی تر، بەڵکوو ئەویش ڕێک وەک تۆ دارای شکۆ و هەست و ویژدانی خۆیەتی، پێی خۆشە بنرخێنرێ، ڕێزی لێ بگیرێ، هەست بە ئارامی و دڵنیایی بکات!

کاتێک تۆ لە شتێکدا ڕاوێژ بە هاوژینەکەت دەکەیت ئەمە واتای ئەوە نییە تۆ دەستت لە پیاوێتی خۆت هەڵگرتووە، بەڵکوو پیاوێتی خۆت پیادە دەکەیت! ئەو هاوبەشی ژیانتە خۆ دوژمنت نییە، هاوڕێتە خۆ نەیارت نییە، هەردووکتان لە دەریای ژیاندا لەناو یەک کەشتیدان، یان پێکەوە ڕزگار دەبن، یان پێکەوە نقوم دەبن، هەردووکتان یەک چارەنووس چاوەڕێتان دەکات، ئیتر بۆ ئەتەوێت چارەنووسی خۆی بە سەریدا بسەپێنیت، هەر لایەکتان بڕیارێک بدەن کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر ژیانی ئەوی ترتان دەبێت، زۆر ئازاربەخشە مرۆڤ هەست بەوە بکات پاشکۆیە، نەک هاوبەش، کاتێک تۆ بە تەنها بڕیار ئەدەیت، بە تەنها نەخشە ئەکێشیت، بەبێ ئەوەی بە خۆت بزانیت پێی دەڵێیت: تۆ پاشکۆی منیت، نەک هابەش!

کە دەڵێم: ڕێز لە ڕا و بۆچوونەکانی بگرە! مەبەستم ئەوە نییە هەرچی وت بە قسەی بکەیت، چونکە ئەمەش دووبارە دەچێتەوە خانەی پاشکۆیەتیبوونەوە، من نامەوێت تۆ پاشکۆی ئەو بیت، ئەمەوێت هاوبەشی بیت، گفتوگۆی لەگەڵدا بکە سەبارەت بە بڕیارەکانی، لە هەر کوێیەک هەڵەی هەبوو هۆشداری پێ بدە، لەسەر بڕیارە دروستەکانی دەستخۆشیی لێ بکە، هەروەها ئەبێ تۆش ڕێگە بۆ ئەو خۆش بکەیت شەنوکەوی بڕیار و ڕاسپاردەکانی تۆ بکات، دوای هێنانوبردن و ڕاگۆڕینەوە تەنانەت ئەگەر ڕاکەیشیت پەسەند نەکرد، ئەو هەست بە پاشکۆیەتی ناکات، دواجار دەبێت بڕیارەکە هەر بدرێت، جاری وا هەیە بڕیاری دروست لای تۆیە، جاری واش هەیە بە پێچەوانەوە، دەکرێ ئەو شتێک بزانێت و تۆ نەزانیت، چ نەنگییەکی تیایە ئەگەر ڕاکەی ئەو پەسەند بکەیت؟

نازانم کێ ئەم بیرۆکە پووچەی لە هزری پیاواندا چاندووە کە: پیاو ئەو پیاوەیە پێچەوانەی هاوژینەکەی بجووڵێتەوە!

تەنانەت هەندێک کەس دەم پان دەکەنەوە و دەڵێن: پرسیان پێ بکەن و بە قسەیان مەکەن!

هێندە بە متمانەوە ئەم قسە نابەجێیە دەکەن وەک ئەوەی ئایەتێک بێت لە قورئان، یان فەرموودەیەک بێت لە صەحیحی بوخاریدا، لە ڕاستیدا ئەمە قسەیەکە تەنها نێرسالاری نەخۆش بەرهەمی هێناوە!

پێشەنگ و سەرمەشقی ئێمە پێغەمبەرە درودی خوای لەسەر بێت کە هاوکات گەورەی هەموو پیاوانی جیهانە، ئەو لە لای نەنگی نەبووە گوێ لە ڕێنمایی هاوژینەکەی بگرێت و بە قسەشی بکات، نەک تەنها لە بابەتە کەسییەکانی تایبەت بەماڵی خۆی، بەڵکوو لە بابەتە چارەنووسسازە گشتییەکانی پەیوەست بە تەواوی مسوڵمانانەوە!

دایکمان ئوم سەلەمە ڕەزای خوای لێ بێ لە گەشتێکدا بۆ مەککە لە خزمەت پێغەمبەردا بوو، بە دیاریکراوی ئەو شوێنەی ڕێککەوتنی حودەیبییەی تێدا مۆر کرا، ئەمەوێت چیرۆکی ڕێککەوتنەکە بە کورتی بگێڕمەوە؛ چونکە ئەوەی مەبەستمانە هەڵوێستی ئوم سەلەمە و مامەڵەی پێغەمبەرە درودی خوای لەسەر بێت، لەگەڵیدا.

پێغەمبەری خوا درودی خوای لەسەر بێت لەگەڵ کۆمەڵێک لە هاوەڵەکانیدا و بە جلوبەرگی ئیحرامەوە و بە مەبەستی عومرەکردن ڕوو لە مەککەی پیرۆز دەکەن، تا نزیک بوونەوە لە مەککە و گەشتنە شوێنێک پێیان دەوت حودەیبییە، بە مەبەستی پشوودان لەو شوێنەدا بارگەیان خست، بەڵام کە قورەیشییەکان بەمەیان زانی، بڕیاریان دا ڕێگریی چوونە ناو مەککەیان لێ

بکەن، هەرچەندە ئەمان بۆ عومرە و بە جلوبەرگی ئیحرامەوە و بەبێ چەک و پێداویستیی جەنگی هاتبوون، لەنێوان هەردوو لادا گفتوگۆی دووردرێژ ڕوویدا، دواجار لەسەر ئەوە ڕێک کەوتن کە مسوڵمانان دەبێ ئەمساڵ بگەڕێنەوە و ساڵی ئایندە بێنەوە، چەندین مەرجی تریش کە ئێرە شوێنی باسکردنیان نییە!

گرنگ ئەوەیە پێغەمبەری خوا دروودی خوای لەسەر بێت، بە هاوەڵەکانی فەرموو عومرەکەتان کۆتایی هاتووە و ئەوەی بۆی هاتوون خوا لێی وەرگرتن ئەگەرچی ئەنجامیشتان نەدابێ، چونکە هەموو کردەوەیەک بە پێی نیەتی خاوەنەکەیەتی! بەڵام مسوڵمانان لەبەر خۆشەویستییان بۆ خوا و پێغەمبەر و جۆشوخرۆشیان بۆ ئیسلام بە هەواڵەکە دڵخۆش نەبوون؛ چونکە ئەوان پێیان وابوو گەڕانەوە بەبێ عومرە سەرکەوتنێکە بۆ قوڕەیش و شکستێکیشە بۆ ئەمان!

پێغەمبەری خوا فەرمانی پێ کردن سەریان بتاشن و ئەو ئاژەڵانەی کە وەک دیاری هێناویانن سەریان ببڕن؛ چونکە عومرەکەیان تەواو بووە، بەڵام زۆربەی هاوەڵان فەرمانەکەیان جێبەجێ نەکرد، لەمەشدا مەبەستیان سەرپێچیکردن نەبوو، بەڵکوو جۆش و خرۆشیان بۆ بینینی ئیسلام بە بەرزی و شکۆمەندییەوە پاڵی پێوە نان بۆ وەرگرتنی ئەو هەڵوێستە.

پێغەمبەری خودا چوو بۆ لای ئوم سەلەمە و بابەتەکەی لە لا درکاند و فەرمووی: هاوەڵان ئامادە نین بڕیارەکەم جێبەجێ بکەن، زۆر ئەترسم ئەمە ببێتە هۆی لەناوچوونیان، چونکە سەرپێچیکردنی پێغەمبەران سزای زۆر توندی بە دواوەیە! لێرەدا ژیریی ئوم سەلەمە بە دیار کەوت، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا حەز ئەکەیت فەرمانەکەت جێبەجێ بکرێت؟ بچۆ قسە لەگەڵ هیچ کەسێکدا مەکە

تا سەری خۆت دەتاشی و ئاژەڵەکانیشت سەردەبڕێت، چونکە ئەوان کە خۆتیان بینی کارەکە ئەنجامی ئەدەیت، ئیتر بەبێ پێوتن چاوت لێ دەکەن!

پێغەمبەری خودا ڕێنمایی هاوژینەکەی جێبەجێ کرد، قسەی لەگەڵ کەسدا نەکرد هەتا بانگی سەرتاشێکی کرد سەری بۆ تاشی و بە دەستی خۆیشی ئاژەڵەکانی خۆی سەربڕی! کە هاوەڵان ئەمەیان دی، هیچ چارەیەکیان نەما و ئەوانیش دەستیان پێ کرد!

ئایا پیاوێتی پێغەمبەری خودا کەمی کرد کە بە قسەی هاوژینەکەی کرد؟ دوور بێ لە ئەو، ڕۆح و گیانم بە قوربانی بێت! ئەو پێشەنگ و پێشەوای ئێمەیە، چاو لە ئاکارە شیرینەکانی ئەو بکە و واز لە قسەی نێرسالارە نەخۆشەکان بێنە.

### ٩. کەسێکی هێدی و نەرمونیانبە:

لەنێوان پیاوی دەوڵەمەند و پیاوی لێوبەخەندەدا لە ٩٠٪ـی ئافرەتان پیاوی لێوبەخەندە هەڵدەبژێرن! ئەو لە ١٠٪یەی تریش لە ناچاریدا پیاوی دەوڵەمەند هەڵدەبژێرن، تەنانەت ئەگەر ئافرەتان سەرپشک بکرێت لەنێوان پیاوێکی ئاسایی ڕووخۆش و پیاوێکی زۆر جوانی مرومۆچدا ئەوا زیاتر لە٥٠٪ـی ئافرەتان پیاوە ئاساییە ڕووخۆشەکە پەسەند دەکەن!

ئەڵبەت مەبەستی من لە پیاوی ڕووخۆش و لێوبەخەندە ئەو پیاوە قۆشمەچییە سووکانە نییە کە پارێزگاری لە کەسایەتیی خۆیان ناکەن، ئەم جۆرە پیاوانە ئافرەتان لێیان ڕادەکەن وەک چۆن جاران عەرەبە کۆنەکان لەو شوێنانە ڕایاندەکرد کە چاوەقووڵەی تیا بڵاو دەبووەیەوە، بەڵام پیاوی ڕووخۆش سێبەری خۆشە، نەرمونیانە، زەردەخەنە لە ڕووخساری ژنەکەیدا دەنەخشێنێ،

ئاشتی بە هەڕەشەوگوڕەشە ڕاناگرێ، هەرچەند ڕووخۆش و نوکتەبازە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کارەکانی زۆر بە هەند وەرئەگرێ و جددییە!

ڕەنگە پرسیارێکی لۆژیکیم لێ بکەیت و بڵێیت: ئەوە چییە وا لە ئافرەتان دەکات پیاوی ڕووخۆشیان لە لا باشتر بێت لە پیاوی دەوڵەمەند؟

وەلامەکە لە خودی ئافرەتان خۆیانەوە ببیستە، بەڵام پێش ئەوە پێویستە بزانیت ڕووخۆشی و دەوڵەمەندی دوو شتی دژ بە یەک نین، دەکرێ ئەو دووانە پێکەوە کۆ ببنەوە، وەک چۆن هەژاری و ڕووگرژی پێکەوە کۆ دەبنەوە.

لە ڕاپرسییەکدا سەبارەت بە سەرسامی ئافرەتان بە پیاوانی ڕووخۆش و لێوبەخەندە، ئافرەتان چەندین هۆکاریان خستووەتە ڕوو، ئەمەش دیارترین قسەکانی ئەوانە:

پیاوی ڕووخۆش دەتوانێت هاوژینەکەی خۆشبەخت بکات، ئەو سەرەڕای ئەوەی کۆمەڵێک ئەرکی قورسی ژیانی لەسەر شانە، بەڵام هەردەم تێدەکۆشێت بۆ ئەوەی زەردەخەنەیەک لەسەر لێوی هاوژینەکەی بنەخشێنێ!

ئەو مرۆڤێک نییە لە خەو و خەیاڵدا بژی و واقیعی فەرامۆش کردبێت، زۆر بە پێچەوانەوە ئەرک و بەرپرسیارێتی هەیە، بەڵام لە بازنەی خۆی دەردەچێت و دەچێتە ناو بازنەی هاوژینەکەیەوە، چێژ دەبینێت، هەست بە بەختەوەری دەکات کاتێک زەردەخەنە لەسەر لێوەکانی بەدی دەکات، لە خۆشیاندا شاگەشکە دەبێت کاتێک گوێی لە قاقای پێکەنینەکانی دەبێت!

بۆ ئەوەی کەسێکی ڕووخۆش بیت، هەندێک شتی سادە

و ساکار بەسە و مەبەستەکە دێنێتە دی، نوکتەیەکی خۆش، چەپکەگوڵێک بەبێ بوونی هیچ بۆنەیەک، دیارییەک بەبێ ئەوەی پێشتر بەڵێنت پێ دابێ، ئێوارەخوانێک لە چێشتخانەیەکدا کاتێک ئەبینی بەهۆی سەرقاڵییەکەوە ناتوانێت خوانی ئێوارە لە کاتی خۆیدا ساز بکات، هاوکاریکردنی لە کاتی ئەنجامدانی کارێکدا، ئەمانە و چەندین شتی تریش دەکرێ تۆ وەک کەسێکی ڕووخۆش بناسێنێت. بەڵام وریابە بۆ ئەوەی کەسێکی ڕووخۆش بیت، مانای وانییە دەبێت قۆشمەچی و گاڵتەجاڕ بیت!

### پیاوی ڕووخۆش گەشبینە:

گەشبینی تایبەتمەندیی پیاوی ڕووخۆش و لێوبەخەندەیە، جیاوازییەکی گەورە هەیە لەنێوان ئەو کەسەی ژیان بە گرفتێکی گەورە تەماشا دەکات و لەنێوان ئەو کەسەی ژیان بە شتێکی جوان دەبینێت سەرەڕای لەمپەڕ و تەگەرەکانی ناوی، هیچ شتێک هێندەی ئەوە قورس نییە لەگەڵ کەسێکی ڕەشبینی سەختگیردا بژیت، کە تەنها لایەنە نالەبار و ڕووە ناشیرینەکەی ژیان دەبینێت، پێش ئەوەی بۆن و ڕەنگی جوانی گوڵ ببینێ درک و چقڵەکەی دەبینێت، پێش برینی بلیتی گەشتکردن بیر لە ماندووبوونی بەدەستهێنانی مۆڵەت دەکاتەوە، پێش ئەوەی بچێت بۆ چێشتخانە بیر لە قەرەباڵخی و جەنجاڵی ناو چێشتخانەکە دەکاتەوە، مرۆڤی گەشبین بە پێچەوانەوەیە، چقڵی گوڵەکان بە شتێکی ئاسایی دەبینێت، سەرەڕای چقڵەکان ڕەنگێکی دڵڕفێن و بۆن و بەرامەی خۆشیش هەیە، هیچ گرفتێک نابینێت ئەگەر چێشتخانەکە قەرەباڵخیش بێت، برینی بلیتی گەشت ئەوە دەهێنێ بۆی ماندوو بیت؛ چونکە گەشتەکە دڵخۆش و کامەرانت دەکات.

پیاوی ڕووخۆش و لێوبەخەندە هەمیشە کەسێکی هاندەر و یارمەتیدەرە، هاوبەش دەبێت لە بیرکردنەوەی هاوژینەکەیدا، هانی ئەدات بۆ ئەوەی هەمیشە دەستپێشخەر بێت، دەرگای ئاسمانی بۆ والا دەکات هەر کاتێک حەزی لە فڕین بوو، دەلاقەکانی ژیانی بۆ دەکاتەوە و حەزەکانی بە زیندوویی ناخاتە ژێر گڵەوە!

پیاوی ڕووخۆش یارمەتیی هاوژینەکەی ئەدات بۆ ئەوەی پارێزگاری لە جوانییەکانی بکات!

ڕەنگە کەسێک بڵێت باشە ئەمە کەی پەیوەندی بە جوانییەوە هەیە؟

لە ڕاستیدا پەیوەندییەکی تۆکمە و توندوتۆڵ لەنێوان ئەم دوو شتەدا هەیە، ئەوەی لە ناخماندایە کاردانەوەی لەسەر ڕووخسارمان دەبێت، بۆ نموونە ئێمە هەموومان هاوڕێمان لە قوتابخانەدا هەبووە و پاشان لە یەک دابڕاوین و هەر یەکێکمان ڕێچکەی تایبەت بە خۆی گرتووە، بێگومان هەموومان هەندێک لە هاوڕێیانی منداڵیمان هەر دەناسینەوە، بە ڕای تۆ هەموویان وەک هاوتەمەنی یەکتر دەردەکەون؟

بە دڵنیاییەوە نەخێر، هەندێکیان شێواز و ڕووخساریان هاوئاهەنگە لەگەڵ تەمەنیان، هەندێکیان گەنجتر لە تەمەنی ڕاستەقینەی خۆیان دەردەکەون و هەندێکی تریان پیرترا!

کاری سەخت، بەرپرسیاریتی قورس، دەروونی ماندوو، نەبوونی پاڵپشت، بارودۆخی تاقەتپڕووکێن، هەموو ئەمانە وەک کەشوهەوای سەختی زۆر گەرم و زۆر سارد وایە کە بەرد شەقار شەقار دەکات و بە تێپەڕبوونی کات شێوەی شاخەکان دەگۆڕێت، بارودۆخی سەخت ئەگەر بەرد شەق و پەق بکات، ئیتر چۆن مرۆڤ بە چۆکدا ناهێنێت!

دواجار ئافرەتیش مرۆڤە، ئافرەت هەیە وەک مانگی تابان ئەدرەوشێتەوە، هەشە ڕۆشنایی تیا بەدی ناکەیت، من باسی ئارایشت و کەرەستەکانی جوانکاری ناکەم، بەڵکوو باسی ئاسوودەیی ڕۆح دەکەم کە ئەگەر هەبوو، گەنجتر و گەشاوەتر دەردەکەوین، هەروەها باسی ئازاری ڕۆح دەکەم کە هەرچی کەرەستەی جوانکاری دنیا هەیە ناتوانێت شوێنەوارەکانی بسڕێتەوە، ئەو زەردەخەنەیەی کە لە دڵەوە سەرچاوە دەگرێت، هەزارن سورا و ناتوانێت لەسەر لێوەکان بینەخشێنێ، ئەو بەختەوەرییەی کە لە چاوەکانەوە چەخماخە ئەدات، هەرچی میل و کلی دنیا هەیە بەدی ناهێنێت، ئێمە لە ناوەوە ئەدرەوشێینەوە، هەر وەک چۆن لە ناوەوەش خامۆش دەبین!

– پیاوی ڕووخۆش و لێوبەخەندە درێژە بە ناکۆکی و ململانێکان نادا!

پێشتر وتمان کێشە و گیروگرفت هەمیشە ڕوودەدات، ڕوودانیشی بەو ئەندازەیە خراپ نییە کە خەڵک لێی دەڕوانێ، بەڵکوو زۆربەی کات کاریگەری باش لەسەر پەیوەندی ژنومێردایەتی دروست دەکات، بەڵام ئەمە بەوەوە بەستراوەتەوە چۆن مامەڵەی لەگەڵدا دەکەین و چۆنیش لە هاوژینەکانمان دەڕوانین!

هەندێک پیاو هەیە لە کێشە خێزانییەکاندا وەک دوژمنێک کە زەویوزاری داگیر کردبێت مامەڵە لەگەڵ هاوژینەکەیدا دەکات، لەسەر ئەم بنەمایە مامەڵەی لەگەڵدا دەکات، یان دەبێت بیکوژێت، یان ئەو ئەم بکوژێت، بوارێک بۆ پێکهاتن ناهێڵێتەوە، لە کەلی شەیتان نایەتەخوارەوە، بە خۆیدا ناچێتەوە، بەڵکوو لەسەر کەللەڕەقیی خۆی بەردەوامە تا ئەو کاتەی هاوژینەکەی دەستپێشخەری بۆ ئاشتەوایی دەکات!

هەندێک پیاوی تر لە کێشە خێزانییەکاندا وەک هاوڕێیەکی خۆشەویست کە جیاوازی بیرکردنەوەیان هەبێت مامەڵە لەگەڵ هاوژینەکەیدا دەکات، خۆشەویستیی ڕۆژانی تەبایی لەبەرچاو دەگرێت، عەرەب دەڵێن: ڕەسەن ئەو کەسەیە ڕەچاوی خۆشەویستی، نەک تەمەنێک بەڵکوو ساتێک بکات، بوار بۆ ئاشتەوایی بهێڵێتەوە، کاردانەوەکانی لە کاری هاوژینەکەی توندتر نەبێت، ئەی باشە یاساکەی نیوتن پێمان ناڵێت: هەموو کارێک پەرچەکرداری هاوشێوەی خۆی هەیە، لە کاتێکدا ئەگەر شتە بێگیان و داڕنراوەکان لە هەست و سۆز لەسەر ئەم بنەمایە کار بکەن و کاردانەوەیان لە کار توندتر نەبێت، ئەی بۆ ئێمە لانی کەم مامەڵە لەگەڵ خۆشەویستەکانماندا بەو شێوەیە، یان باشتر لەو شێوەیە نەکەین و پەرچەکردارەکانمان هاوسەنگی و ژیری و دانایی لەخۆ بگرێت، ژیری و دانایی لەوەدایە ئەگەر دارستانێک گڕی گرت، ئاوی پێدا بکەیت، نەک بەنزین، پیاوی ڕووخۆش و لێوبەخەندە بە عەقڵیەتی خامۆشکردنی ئاگر بیر دەکاتەوە نەک جۆشدانی، ئەو هەستە لە لای هاوژینەکەی دروست دەکات کە سەرەڕای ناکۆکیش هێشتا خۆشەویستیی خۆی لە دڵی مێردەکەیدا لە دەست نەداوە، شکۆی دەپارێزێت ئەگەرچی ناتەباش بن، هەستی بریندار ناکات ئەگەرچی دەنگیشی لێ وەرگرتبێت، ناکۆکی درزی گەورە لەنێوان ژنومێرددا دروست دەکات و لە یەکیان دوور دەخاتەوە، بۆیە پێویستە یەکێکیان هەنگاو بەرەو ئەوی تریان بنێت، ئەگەر هەنگاوی یەکەم پیاوەکە نای، ئەوا لە پێشچاوی هاوژینەکەی لە شکۆی نایەتە خوارەوە، وەک چۆن نێرسالارەکان وا بیر دەکەنەوە، بەڵکوو پێی بەرز دەبێتەوە! لە بەرامبەریشدا ئەگەر ژنەکە هەنگاوی سەرەتای

نا، ئەوە دەبێت ئەو هەنگاوە بەرز بنرخێت و وا لێکبدرێتەوە کە ئەمە بەڵگەی خۆشەویستیەتی بۆ مێردەکەی و پێی خۆش نییە بە خەم و پەژارەوە بیبینێت و مەبەستێتی ڕازی بکات.

هیچ کەسێک هێندەی ئەو کەسە خراپ نییە کە دەستپێشخەری بۆ ئاشتبوونەوە ناکات، مەگەر ئەو کەسەی دەستپێشخەری بەرامبەرەکەی بۆ ئاشتبوونەوە ڕەت بکاتەوە!

لەگەڵ پیاوی ڕووخۆش و لێوبەخەندە بوار بۆ بێزاری و وەڕسبوون نامێنێتەوە:

ئاوی ڕووبارێک کە لەبەری بڕوات، ئاوی دەریایەک کە شەپۆل بدات، هەمیشە پاکژ و ڕوونە؛ چونکە لە شوێنی خۆیدا ناوەستێت و بەردەوام لە جووڵە و گۆڕاندایە، ئاوی ڕاوەستاویش لە شوێنی خۆیدا لیخن و بۆگەن دەبێت، ژیانی ژنومێردایەتیش هەر ئاوایە، پیاوی ڕووخۆش وەک ئاوی ڕووبارێک وایە کە لە بەری بڕوات، وەک دەریایەک وایە بەردەوام شەپۆل بدات، هەمیشە کەشوهەوای نوێ دەخوڵقێنێ و پڕۆژەی خۆشبەختکردنی هاوژینەکەی پێیە!

بە پێچەوانەوە هەندێک پیاو هەن ژیانیان تەنها لەسەر یەک بەزمە و لێی لانادەن، ژیانی ئەوان بریتییە لە تەنها ڕۆژێک و دووبارە دەبێتەوە، پسپۆڕانی بواری بەڕێوەبردن دەڵێن: ناکرێت پەنجا ساڵ لەناو پیشەیەکدا بیت و بە هەمان میکانیزم و عەقڵیەتی ساڵی یەکەمەوە کار بکەیت و بە هەمان ئەنجام ڕازی بیت و پاشان بڵێی: ئەزموونی پەنجا ساڵ کارکردنم هەیە، نەخێر ئەزیزم، ئەزموونی تەنها یەک ساڵت هەیە و پەنجا جار دووبارە بووەتەوە!

ژیانکردن لەسەر یەک شێواز مرۆڤ وێران دەکات، لەمەدا ژنان و پیاوان چونیەکن، هەندێک پێکەنین و قسەی خۆش هەندێک

گۆرانـكاری و بارەوباربـوون، نـەک تەنهـا هاوژینەكـەت، بەڵكـوو خۆشـت دەپارێزێت، وەک ئاوی دەریـا پـەل بهاوێژە و شـەپۆل بدە و خـۆت نـوێ بكـەرەوە، ئاوی ڕاوەسـتاو مەبە؛ چونكـە ئـاوی ڕاوەسـتاو بۆگـەن دەبێت!

١٠. كەسێكی دەستپێشخەریە!

ئافـرەت پێـی خـۆش نییـە هەمیشـە هـەر داوا بـكات، بەڵكـوو پێـی خۆشـە جاروبـار پیاویش دەسـت پێشـخەری بكات، لـە ڕاسـتیدا ئەمـە بـە تەنهـا خـوی ئافرەتـان نییـە، بەڵكـوو مرۆڤـەكان هەموویـان بـە شـێوەیەكی گشـتی تیایـدا هاوبـەش، ئێمـەی مـرۆڤ پێمـان خۆشـە هەسـت بـەوە بكەیـن، لـە لایـەن دەوروبەرمانـەوە گرنگیمـان پـێ ئەدرێـت نـەک داواكاریمـان لێیـان ببێـت!

هیـچ نەخۆشێک نییە هـاوار بكات و بڵێت: خەڵكینە لە نەخۆشـخانە كەوتووم بێن بۆ سـەردانم، هەرچەنـدە زۆر دڵخـۆش دەبێت بـەوەی خەڵـک بچنـە سـەردانی و هەواڵـی بپرسـن، كاتێـک هـەر یەكێـک لـە ئێمـە لەسـەر قەرەوێڵـەی نەخۆشـخانە ڕادەكشـێین و كەسـێک دێـت بـۆ سـەردانمان هێنـدە خۆشـحاڵ دەبێـن هەرچـی ئێـش و ئـازار هەیـە هەموویمـان بیردەچێتـەوە، چونكـە گرنگیپێـدان بەبـێ ئـەوەی داوای بكەیـت ئـەو هەسـتەت لـەلا دروسـت دەكات كـە نرخ و سـەنگی خۆتـت لـەلای ئەوانـی تـر هەیـە!

هیـچ كاتێـک دایـک بـە منداڵەكانـی ناڵێـت چەنـد ڕۆژێكـی تـر چەژنـی دایكـە و دەبێـت دیاریـم بـۆ ئامـادە بكـەن، بـەڵام شاگەشـكە دەبێـت لـە خۆشـیاندا كاتێـک منداڵەكانـی ئـەو دەسـتپێشـخەرییە دەكـەن!

جیاوازییەكـی زۆر هەیـە لەنێـوان ئـەوەی سـەردانی خۆشـكەكەت بكەیـت دوای گلەیـی و گازندەیەكـی زۆر و لەنێـوان ئـەوەی هـەر لـە

خۆتەوە و بەبێ گلەیی خۆت بکەیت بە ماڵیاندا، یەکەم داخوازییە و دووەمیان دەستپێخەری!

وابزانم ئەمە خاڵێکی بەڵگەنەویستە و هەموومان دەست و پەنجەمان لەگەڵیدا نەرم کردووە و لامان شاراوە نییە، نموونە هێنانەوەش لەسەری هیچ شتێک سەرباری بابەتە ناکات، روونکردنەوەی شتە روونەکان جاری واهەیە سەردەکێشێت بۆ ئاڵۆزکردنی، ئەوەی ئێمە لە ژیاندا بە شێوەیەکی گشتی دەیبینین و دەیزانین هەر ئەوە لە ژیانی هاوسەرگیریشدا دووبارە دەبێتەوە، کەواتە تۆش کەسێکی دەستپێشخەربە:

ئەرکی هاوژینەکەت نییە داوات لێ بکات بیبەیتە دەرەوە و لە چێشتخانەیەکدا پێکەوە نانێک بخۆن، تۆ ئەو دەستپێشخەرییە بکە و پێی بڵێ: پێت چۆنە سبەینێ نانی ئێوارە لە دەرەوە و لە فلان چێشتخانەدا بخۆین، ئەم کارە زۆر خۆشحاڵی دەکات، چونکە ئەم گرنگیپێدانە بەبێ داخوازییە و ئەو هەستەی لەلا دروست دەکات کە تۆ حەز دەکەیت هەندێک لە کاتەکانتی لەگەڵدا بەسەربەریت بەبێ ئەوەی داوای لێ کردبێت!

پێی بڵێ: خۆت سازوئامادە بکە، ئێوارە سەردانی ماڵی باوکت دەکەین، هەموو ئافرەتێک پێی خۆشە لە دوای هاوسەرگیری هاورێ لەگەڵ مێردەکەیدا سەردانی ماڵی خزم و کەسوکاری خۆی بکات، بەڵام پێیان خۆش نییە بەزۆر پەلکێشی مێردەکانیان بکەن بۆ ئەو کارە، کاتێک تۆ ئەو دەستپێشخەرییە دەکەیت دڵشادی ئەکەیت و بە زمانی حاڵ پێی ئەڵێیت: هەر کەسێک دوورونزیک پەیوەندی بە تۆوە بێت خۆشم ئەوێت!

هەر شتێکی داوا نەکرد مانای وانییە کە ئەو شتەی ناوێت، تەنانەت لەناو ژیانی هاوسەرگیریشدا شکۆمەندی هەیە، ئێمەی

مـرۆڤ قورسـه لەسـەر دەروونمـان هەمیشـه داوا بکەیـن ئەگەرچـی لـە هاوبەشـی ژیانیشـمان بێـت؛ بۆیـه پێویسـته کەسـێکی وریـا و چاوکـراوە بیـت و بزانیـت بـه چ شـتێک شـاد و بەختـەوەر دەبێـت دەسـتوبرد بکەیـت لـه ئەنجامدانیـدا، خۆشەویسـتی مرۆڤـەکان وەک کۆیلـه لـێ دەکات، هـەر کەسـێکت زیاتـر خۆشویسـت زیاتـر دەبیتـه موڵکـی، خۆشەویسـتیش وەک دینـداری لـه هەڵسـوکەوت و مامەڵەکردنـدا دەردەکەوێـت.



## ئەشکەوتەکەی عەلی بابا

بێگومانم لەوەی چیرۆکی عەلی بابا و چل دزەکە باش دەزانیت! ئەم چیرۆکە جوان و ئەفسووناوییە کراوە بە فیلمکارتۆن و بە منداڵی سەرنجی هەمووومانی ڕاکێشاوە و کاتێکی خۆشمان لەگەڵیدا بردووەتە سەر، ئەمە چیرۆکێکی میللییە، نەک تەنها عەرەب، بەڵکوو تەواوی گەلانی جیهان گێڕاویانەتەوە، هەر گەلێک شتێکی لێ زیاد و کەم کردووە، بەڵام ڕووداوە سەرەکییەکە لە هەموو گێڕانەوەکاندا وەک خۆی ماوەتەوە، لە گێڕانەوە ڕۆژئاواییەکەدا زیادەیەک هەیە، ئێمە بۆ ئەم پێشەکییە پێویستمان پێیەتی!

ڕەنگە ئێستا لە خۆت بپرسیت: چیرۆکی عەلی بابا چ پەیوەندییەکی بەم کتێبێکەوە هەیە، کە بڕیارە تایبەت بێت بە پیاوان؟

پرسیارەکە بەجێیە، بەڵام جارێ پەلە مەکە!

چیرۆکەکە دەڵێت: عەلی بابا دارفرۆشێکی هەژار بوو، هەموو ڕۆژێک بە خۆی و تەورەکەیەوە ڕووی لە دارستان ئەکرد و ئەوەندەی گوێدرێژەکەی هەڵیبگرتایە داری ئەبڕی و ئەیهێنایەوە بۆ بازاڕ و ئەیفرۆشت و بە پارەکەی پێداویستییەکانی ژیانی پێ دابین دەکرد، ڕۆژانە ئەمە کاری بوو، هەتا ڕۆژێک ڕووداوێکی سەیروسەمەرە ڕوویدا و ژیانی بە یەکجاری گۆڕی!

بەهۆی کەمبوونەوەی دار لە شوێنە نزیکەکاندا ڕۆژێک عەلی بابا ڕووی لە شوێنێکی دوورەدەست کرد کە پێشتر بۆی نەچووبوو، دوای گەیشتنی بە شوێنەکە دەستی کرد بە داربڕین، کە لێبوویەوە گوێدرێژەکەی بار کرد و ڕەشۆکەی گرت بە دەستیەوە بۆ ئەوەی بەرەو بازاڕ بگەڕێتەوە و بارە دارەکە بفرۆشێت، لەناکاو کۆمەڵێک ئەسپسواری لە دوورەوە بەدی کرد کە زۆر بە خێرایی ئەهاتن و تەپوتۆزێکی زۆریان هەستاندبوو، ئەمیش خۆی لە پەنایەکدا حەشار دا و تەماشای کرد بزانێ ئەم ئەسپسوارانە ڕوو لە کوێ دەکەن، بینیی لە بەردەم ئەشکەوتێکدا وەستان، گەورەکەیان لە ئەسپەکەی دابەزی و ڕووی لە دەرگای ئەشکەوتەکە کرد و وتی: ئەی کونجی! دەرگای ئەشکەوتەکە بکەرەوە، عەلی بابا تووشی شۆک بوو کاتێک بینیی دەرگای ئەشکەوتەکە کرایەوە و هەموویان چوونە ژوورەوە و بەدوایاندا دەرگاکە داخرایەوە، ئیتر عەلی بابا زانیی ئەمانە ئەو دزانەن کە ناوبانگیان لە ناو شاردا بڵاو بووەتەوە و ژمارەیان چل کەسە، ئەمجارە باشتر خۆی حەشار دا نەوەک پێی بزانن و تووشی بەڵایەکی بکەن، زۆری نەبرد گەورەی دزەکان لە ناوەوەی ئەشکەوتەکەوە هاواری کرد: ئەی کونجی دەرگاکە بکەرەوە، دەرگاکە کرایەوە و هەموویان ڕۆیشتن، عەلی بابا کاتێک دڵنیا بوو هەموویان لە چاو ون بوون، بەرەو لای دەرگای ئەشکەوتەکە کەوتە ڕێی، کە گەیشتە بەردەمی هاواری کرد و وتی: ئەی کونجی دەرگاکە بکەرەوە! دەرگاکە کرایەوە و خۆی کرد بە ژووردا و دەرگاکە دەمی دایەوە بە یەکدا، کاتێکی زانی خۆی لەناو پارە و ئاڵتوونێکی زۆردا بینییەوە! توورەکەیەکی گەورەی پڕ کرد لە لیرە و پاشان گەڕایەوە بۆ لای دەرگاکە و وتی: ئەی کونجی دەرگاکە بکەرەوە، یەکسەر دەرگاکە کرایەوە!

عەلی بابا گەڕایەوە بۆ ماڵەوە و ڕووداوەکەی بۆ ژنەکەی گێڕایەوە، ئەویش بە بیستنی ئەم هەواڵە گەلێک خۆشحاڵ بوو، چونکە ئەم ڕێژە زۆرەی ئاڵتوون نەک هەر بەڕاستی، بەڵکوو بە خەویش نەیدیبوو، ژنەکەی عەلی بابا داوای کرد با ئەم ئاڵتوونە بکێشین و بزانین کێشەکەی چەندە، عەلی بابا وتی: گرنگ نییە کێشەکەی چەندە، گرنگ ئەوەیە دەوڵەمەند بووین و ژیانمان جارێکی تر ناگەڕێتەوە بۆ دۆخی جاران، بەڵام ژنەکە هەر مکوڕ بوو لەسەر ئەوەی بزانێت کێشی ئەم ئاڵتوونە چەندە، بۆیە چوو بۆ ماڵی براکەی عەلی بابا بۆ ئەوەی تەرازووەکەی ئەوان بهێنێت، بەڵام براکەی عەلی بابا و ژنەکەی لەم داوایە کەوتنە گومانەوە، چونکە دەیانزانی عەلی بابا هەرگیز هێندە شت لە ماڵەکەیدا کۆ نابێتەوە هەتا پێویستی بە تەرازوو و کێشانە بێت، ئەوەی پەیدای دەکات هەر بەشی خەرجیی ڕۆژانەکەی دەکات و هیچی بۆ پاشەکەوت ناکرێت، بۆیە بڕیاریان دا هەندێک کەتیرە بکەنە بنی تەرازووەکەوە بۆ ئەوەی شتێکی پێوە بنووسێت و ئەم نهێنییەیان بۆ ئاشکرا ببێت! ژنەکەی عەلی بابا تەرازووەکەی برد و ئاڵتوونەکەی پێ کێشا و پاشان گەڕاندیەوە بەبێ ئەوەی بزانێت تای تەرازووەکە لە ژێرەوە لیرەیەکی پێوە نووساوە! براکەی عەلی بابا و ژنەکەی وتیان ئەبێ عەلی بابا چەندەی پارە هەبێت وا لەجیاتی ئەوەی بیژمێرێ ئەیکێشێ! ژنەکەی وتی من دڵنیام زۆری هەیە، بەڵام چۆنی پەیدا کرد؟ خۆ هەموو کەس ئەزانێت هەژار و کەمدەستە، ئەم ماستە بێ موو نییە و ئەوەی لە ژێر بەڕەدایە پێویستە بیهێنینە سەر بەڕە!

براکەی عەلی بابا تەرازووەکەی هەڵگرت و چوو بۆ ماڵیان بەبێ ئەوەی ئەو لیرەیەی کە نووسابوو بە بنی تەرازووەکەوە لێبکاتەوە، سەرەتا عەلی بابا ویستی حاشای لێ بکات، بە تایبەتی کە ئەیزانی

براکەی زۆر چڵێس و چاوچنۆکە، بەڵام هەڕەشەی لێ کرد ئەگەر قسەی بۆ نەکات، ئەوا هەواڵەکە دەگەیەنێتە دەسەلاتداران، بۆیە عەلی باباش هیچ چارەیەکی نەما و چیرۆکەکەی بۆ گێڕایەوە،

براکەی عەلی بابا بەپەلە خۆی گەیاندە لای ئەشکەوتەکە و هاواری کرد ئەی کونجی دەرگاکە بکەرەوە، کرایەوە و چووە ژوورەوە و دواتر دەرگاکە وەک نەریتی خۆی داخرایەوە، لە ژوورەوە چەند توورەکەیەکی پڕ کرد لە ئاڵتوون و دای بە کۆڵیدا و بەرەو لای دەرگاکە گەڕایەوە، وشە نهێنییەکەی لە بیر چوویەوە، ئەیزانی ناوی خواردنێکە لە خواردنەکان، بەڵام نەئەچوویەوە سەری، هاواری کرد ئەی نیسک دەرگاکە بکەرەوە، ئەی نۆک دەرگاکە بکەرەوە، ئەی گەنم دەرگاکە بکەرەوە، بەڵام دەرگا هەر نەکرایەوە!

دزەکان وەک نەریتی خۆیان هاتنەوە، تەماشا ئەکەن کابرایەک لە ژوورەوەیە، گرتیان و هێندەیان لێدا هەتا بێهۆشیان خست و بە زنجیر لەناو ئەشکەوتەکەدا بەستیانەوە و ڕۆیشتن!

براژنەکەی عەلی بابا هات بۆ ماڵی عەلی بابا و پێی وت وا تاریک داهات و براکەت هەر نەگەڕایەوە ئەترسم تووشی بەڵایەک هاتبێت!

عەلی بابا چوو بۆ ئەشکەوتەکە تەماشا ئەکات براکەی زنجیر کراوەتە دەست و قاچیەوە و هێندەیان لێداوە خەریکە گیان لە دەست بدات.

هەڵیگرت و چەند توورەکە ئاڵتوونێکیشی لەگەڵ خۆیدا هێنایەوە و دواتر بەشیان کرد لەنێوان خۆیاندا و بڕیاریان دا جارێکی تر نەگەڕێنەوە بۆ ئەو ئەشکەوتە!

ئەوەی مەبەستی ئێمەیە لەم چیرۆکە (ئەی کونجی دەرگاکە بکەرەوە)، ئەم وشەیەی کە عەلی بابا لە یادی نەکرد ژیانێکی

شاهانەی بۆ دەستەبەر کرد، لە کاتێکدا براکەی لە بیری کرد و خەریک بوو سەری تیابچێت، وشە هەڵەکانی وەک نۆک، نیسک، گەنم دادی نەدا!

هەندێک وشە هەن دەرگای دڵی ئافرەتان دەکەنەوە، وەک چۆن (ئەی کونجی بیکەرەوە)، دەرگای ئەشکەوتەکەی دەکردەوە، هەندێ وشەی تریش هەبوون وەک (ئەی نیسک بیکەرەوە) هیچ سوودێکی نەبوو، بگرە زیانیشی زۆرتر بوو!

ئەمەوێت ئەم بنەمایە بکەم بە دوو بەشەوە:

١. بیکەرەوە ئەی کونجی! بۆ ئەو قسانەی کە پێویستە پیاو بیانڵێن بۆ ئەوەی دڵی هاوژینەکانیان بکەنەوە.

٢. بیکەرەوە ئەی نیسک! بۆ ئەو قسانەی کە ژیانی هاوسەرگیری ناجێگیر دەکەن و سەردەکێشن بۆ تێکدانی پەیوەندیی نێوانیان.

## یەکەم: بیکەرەوە ئەی کونجی!

### ١. خۆشم ئەوێی:

ئەم وشە تەنها نۆ پیت نییە، بەڵکوو پەڕوباڵ لە ئافرەت ئەخات و بەرەو ئاسمان ئەیفڕێنێت، ئەم وشە دوو باڵی هەیە و ئافرەت لە ئامێز دەگرێت، بەڵێ دەکرێت وشەیەک هەبێت دوو باڵ و ئامێزێکی گەرموگوڕیشی هەبێت، وشەی خۆشم ئەوێی یەکێکە لەو وشانە!

سەیرەکە لەوەدایە ئافرەت زۆر تامەزرۆی بیستنی ئەم وشەیەیە، لە بەرامبەردا پیاو ڕەزیلی دەکات لە بەکارهێنانیدا!

زۆرێک لە پیاوان بە هاوژینەکانیان ناڵێن: خۆشم ئەوێیت؛ چونکە بەکارهێنانی ئەم وشە بە جۆرێک لە لاوازی کەسایەتی و مونەرمی دائەنێن، ئەمە بەبێ سێ و دوو تێگەیشتنێکی هەڵەیە بۆ چەمکی

پیاوێتـی! دەبـێ هاوژینەکـەت هەسـت بـە میهرەبانیـت بـکات، نـەک دڵڕەقیت، هەست بە خەمخۆریت بکات، نـەک بێباکیت، ڕاستە کارێکی باش نییـە لـە بـەردەم خەڵکیدا هەسـت و سـۆزی خۆتی بۆ دەرببڕیت، بـەڵام ئـەوەش کارێکی بـاش نییـە و هیـچ پاسـاوێک هەڵناگرێت کاتێک پێکـەوەن و تەنهـان سـۆزی خۆشەویسـتی خۆتـی بـۆ دەرنەبڕیـت، ئەوانەشـی پێیـان وایـە وشـەی (خۆشـم دەوێی)، لـە پیاوێتی پیـاو دێنێتە خـوارەوە، بەڵگەیەکـی دەمکوتکـەری بـۆ دێنینـەوە و پیشـانی ئەدەیـن ئەمـە پێچەوانەکەی ڕاستە، پێغەمبەری خودا درودی خـودای لەسـەر بێت لەنـاو کۆمەڵێک لـە هاوەڵانیـدا بـوو، عەمـری کـوڕی عـاص هـات بـۆ خزمەتـی و لێـی پرسـی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! خۆشەویسـترین کـەس بـە لای تـۆوە کێیـە؟

فەرمووی: عائیشەیە!

گـەورەی هەمـوو پیاوانـی دنیـا هیـچ بـە لایـەوە نەنگی نییـە لەنـاو خەڵکدا بڵێت هاوژینەکـەم خـۆش دەوێت، ئەگـەر لەنـاو خەڵکدا بڵێت: خۆشـم دەوێـت، ئـەی ئەگـەر دووبـەدوو بـن چـۆن پێـی ناڵێت!

هەندێـک لـە پیـاوان زیاتـر دڵخـوازی ئـەوەن بـە کـردەوە بـۆ هاوژینەکانیـان بسـەلمێنن کـە خۆشـیان دەوێـن، نـەک بـە وشـەی زاریـان بۆیـان دەربـبڕن، پیـاوان چیـن و توێژێکـی کردەیـین هـەر وەک چـۆن سروشـتیان ئاوایـە، زیاتـر گرنگـی بـە ئەنجام دەدەن نـە دروشـم، حەزیـان بـە ئەنجامدانـی کارە، نـەک قسـەکردن لـە سـەری، ئـەم توێژەی پیـاوان ئەگەرچـی لـە ئەوانـەی پێشـوو زۆر باشـترن و دەربڕینـی خۆشەویسـتی بـە هەڵوێسـت و کـردەوەش کارێکـی زۆر گەورەیـە، بەڵام کـێ وتوویەتـی پێویسـتە لەسـەر پیـاو تەنهـا یەکێـک لـەم دوو بژاردەیـە هەڵبژێرێت: یـان ئەوەیـە بـە ژنەکـەی بڵێت خۆشـم ئەوێت، یـان ئەوەیـە

بە کردەوە خۆشەویستیی خۆی بۆ بسەلمێنێت، کۆکردنەوەی ئەم دوو شتە کەی ئەوەندە کارێکی قورسە و نەتوانێت پێی هەستێت، بە پێچەوانەوە زۆر ئاسانە و دەکرێت هەم بە کردەوە و هەم بە قسە خۆشەویستیی خۆتی بۆ دەرببڕیت، بە تایبەتی ئافرەتان وشەی (خۆشم ئەوێی)یان زۆر پێ خۆشە!

هەندێک لە پیاوان وتنەوەی وشەی خۆشم ئەوێی بە شتێکی ڕۆمانسی پڕوپووچ و بێ ناوەڕۆک دەدەن لە قەڵەم و پێیان وایە مرۆڤ دەبێت واقیعی بێت و خۆی بۆ خەم و پێداویستییەکانی ژیان یەکلایی بکاتەوە، پەیوەندی ژنومێردایەتی لەسەر زەمینەیەکی تۆکمە و توندوتۆڵ بنیات بنێت، نەک زەمینەیەکی فشۆڵ کە زادەی خەون و خەیاڵدان بێت.

هەندێکی تر لە پیاوان کە بە هاوژینەکانیان ناڵێن (خۆشم ئەوێی)، لەبەر ئەوەیە هەر لە بنەڕەتەوە لە سروشتی ئافرەت تێناگەن، وا حاڵی بوون ئەرکی ئافرەت تەنها بریتییە لە بەڕێوەبردنی ماڵ و وەچەخستنەوە و خاڵ سەری دێڕ. هەموو ئەوەی پێویستێتی ئەوەیە بخوات و بخواتەوە بۆ ئەوەی بەردەوام بێت لە ژیان، ڕێک وەک چۆن پاتری مۆبایلەکانمان پڕ دەکەینەوە بۆ ئەوەی بتوانین زیاتر بەکاریان بێنین! بەڕێزەکەم: ئافرەت مۆبایل نییە! خۆ گوێرەکەش نییە لە پەچەیەکدا بێت و هەموو خۆشییەکانی دنیا لە چاوی ئەودا خۆی لە چەپکە گیایەکی تەڕ و سەوزدا ببینێتەوە، ئافرەت بوونەوەرێکی هەستیارە و چەندە لەناو جیهانی دەرەوەدا بژی، ئەوەندەش لەناو هەست و سۆزەکانیدا دەژی، بەلای لێدا ئەو کەسەی ویرانە لە دڵی ئافرەتدا دروست دەکات و هەستە جوانەکانی تێدا زیندەبەچاڵ دەکات!

هەندێکی تر لە پیاوان وادەزانن یەکجار وشـەی (خۆشـم ئەوێی) بۆ هاوژینەکانیان بەکار هێنا ئیتر هەتا مردن بەسـە، هـەروەک چۆن یەکجار واژۆ لەسـەر بەڵگەنامـەی موڵکایەتی خانوو دەکرێت و ئیتـر ئەبڕێتـەوە و جارێکی تر پێویست ناکات لەسەر ناوەکەی واژۆ بکاتەوە، ئەمیش یەکجار وتویەتی و ئەمەش بەسە بۆ ئەوەی لەوماڵەدا پێکەوە بە کامەرانی بژین، ئێمەی پیاوان وا بیر دەکەینەوە مادام کەوتینە ناو ژیانی هاوسەرگیرییەوە، ئیتر هەمـوو شـتێک کۆتایی هاتـووە، واشـدەزانین ئافرەتانیش لەمـەدا وەک ئێمـە وان، لـە کاتێکدا ئافرەت ئەمـە وەک گرێبەسـتی بەموڵککردنی خانـوو لێـی ناڕوانـێ، تەنها واژۆیـەک بـەس بێت و جارێکی تـر نەگەڕێتەوە سـەری، بەڵکوو وەک سـروودی نیشـتیمانی لێـی دەڕوانێت، کە قوتابیان دەبێت هەمـوو بەیانییـەک لـە گۆڕەپانـی قوتابخانـەدا بیڵێنـەوە جـا دەسـت بـە خوێندنـی وانەکانیـان بکـەن، ناوەنـاوە دووپاتکردنـەوەی خۆشـەویستی بـە لای ئافرەتـەوە بەڵگـەی پابەندبوونـە بـە خۆشـەویستیەکەوە، هـەر وەک مامۆستایانی قوتابخانە باش ئەزانن قوتابییەکانیان سروودی نیشتیمانیان لەبـەرە، بـەڵام هەمـوو بەیانییـەک پێیـان دەڵێنـەوە.

جارێـک پێغەمبـەری خـودا درودی خـوای لـێ بێـت بـە عائیشـەی هاوژینـی فەرمـوو خۆشـەویسـتیت وەک گرێـی گوریـس وایـە.

عائیشـەش ناوبەنـاو پرسـیاری لـە پێغەمبـەر دەکـرد، ئـەرێ حاڵـی گرێکـە چۆنـە؟

ئەویش دەیفەرموو: هەر وەک خۆیەتی!

سروشـتی ئافـرەت وایـە حـەز دەکات وشـەی (خۆشـم دەوێـی)، لـە زاری مێردەکەیـەوە ببیسـتێت؛ بـۆ ئـەوەی لـەوە دڵنیـا بێـت هێشـتا پێگـەی خـۆی لەنـاو دڵـی مێردەکەیـدا لەدەسـت نـەداوە، ئـەم بابەتـە لـە لای ئافرەت وەک تازەکردنـەوەی پەیمان وایە بۆ پادشـا لـە سـاڵڕۆژی چوونـە سـەر تەختـی پادشـایەتیدا.

پاشای ناو دڵت ئەیەوێت ناوبەناو پەیمانی بۆ تازە بکەیتەوە، تۆش بۆی تازە بکەرەوە!

### ٢. ئەمڕۆت چۆن بوو؟ یان ئەمڕۆت چۆن گوزەراند؟

میشیل دی مونتین دەڵێ: ئەگەر شتێک هەبێت ناوی هاوسەرگیریی سەرکەوتوو بێت، ئەوە بزانە هۆکارەکەی ئەوەندەی بۆ دڵسۆزی و ڕاستگۆیی دەگەڕێتەوە، ئەوەندە بۆ خۆشەویستی ناگەڕێتەوە!

ئەڵبەت مەبەست لەم وتەیە بە کەم تەماشاکردنی بواری خۆشەویستی نییە لە ژیانی ژنومێردایەتیدا، بەڵکوو بەرزڕاگرتنی بواری ڕاستگۆیی و دڵسۆزییە.

ئافرەت پێی خۆشە لە ژیانی هاوسەرگیریدا هەست بە دڵسۆزیی مێردەکەی بکات، ئەمە شتێکە نەک تەنها ئافرەتان، بەڵکوو پیاوانیش پێیان خۆشە!

ژنانی ئێستا وەک ژنانی سەردەمی نەفامی پێش ئیسلام نین، تەنها لە شیعر و شانامەکاندا ناویان هەبێ و لە شانۆی ژیاندا ڕۆڵیان ون بێت، ژیان هەمووی بە شیعر و پەخشان ناچێتە سەر، بەڵکوو بە خۆشەویستیی ڕاستەقینە دەچێتە سەر. ڕاستە شیعر و پیاهەڵدانیش بەشێکن لە خۆشەویستی، بەڵام هەموو خۆشەویستیش نییە، گرنگیپێدان، گوێگرتن، ڕێزگرتن، لێکتێگەیشتن، هەموو ئەمانە خۆشەویستین و ژیانی ژنومێرد دەکەن بە بەهەشت!

سروشتی ئافرەتان وایە زیاتر لە پیاوان حەزیان لە قسە و گفتوگۆیە، ڕەنگە زۆربەی پیاوان پێیان خۆش نەبێت کاتێک دەگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە پرسیاری ئەو ڕۆژەیان لێ بکرێت چۆنیان گوزەراندووە، بەڵام ئافرەتان پێیان خۆشە لێیان بپرسیت: ئەمڕۆت چۆن بوو؟

ئەو پێی خۆشە هەرچی لە غیابی تۆدا کردوویەتی بۆتی بگێڕێتەوە و باسی بکات، ئێمەی پیاوانیش هەموو ئەم وردەکارییە بچووکانەی ژیان بە شتێکی ڕۆتین و کەمبایەخ لێی دەڕوانین و حەزمان لە بیستنی نییە، بەڵام ئافرەت پێی خۆشە بیگێڕێتەوە! کەواتە تۆش ئەم بابەتە پشتگوێ مەخە و پرسیاری لێ بکە ئەمڕۆت چۆن گوزەراند، نەک تەنها پرسیار، بەڵکوو دانیشە و بە وردی گوێی بۆ بگرە، ئەگەرچی قسەکانی جێی بایەخ و گرنگیپێدانی تۆش نەبن.

کاتێک داوای پارەت لێ دەکات بۆ کڕینی جلوبەرگێکی نوێ بۆ ئەوەی لە ئاهەنگی گواستنەوەی هاوڕێیەکیدا بیپۆشێت، ئەوەی لای تۆ مەبەست و گرنگە پارە و کڕینی جلەکەیە، بەڵام ئەو تەنها بەمە داناکەوێت و ئەیەوێ پێتبڵێت چۆن پێنج جۆر جلوبەرگی تری تاقی کردووەتەوە، دواجار دڵی لەسەر ئەم جۆرەیان دامەزراوە، جۆرێکی تریش هەبوو ئەویش زۆر جوان بوو بەڵام ڕەنگی تری نەبوو، پەلە مەکە هێشتا قسەکە ماویەتی، خۆ جلوبەرگ بە تەنها لەبەر ناکرێت پێویستی بە جانتا و پێڵاویش هەیە، تۆ هەوڵ بدە بە دەمیەوە پێبکەنیت و ستایشی شارەزایی و لێزانیی بکە لە دەستنیشانکردنی جۆر و ڕەنگی جلوبەرگەکانی، پێی بڵێ ئەم ڕەنگەی کە هەڵبژاردووە زۆر جوانترە لەو ڕەنگەی کە خەریک بوو بیکڕێت و دوایی لێی پەشیمان بوویتەوە!

بە لای تۆوە درنگ کوڵانی فاسۆلیاکە لەسەر ئاگرەکە زۆر گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە دواجار کوڵا و سفرە و خوان ساز و ئامادە بوو، بەڵام بە لای ئەوەوە درەنگ کوڵانی فاسۆلیاکە ڕووداوێکە پێویستە قسەی لەسەر بکرێت، کەوتنە داوی ئەم جۆرە نوێیەی فاسۆلیا کە کاتێکی زۆری پێویستە بۆ کوڵان سەرکێشییەک بوو نەدەبوو

بکرێت، تۆش دەبێت هاندەر و پاڵپشتی بیت وەک ئەوەی مەدالیایی ئاڵتوونی لە پێشبڕکێی ڕاکردنی سەد مەتریدا بەدەست هێنابێت، حەزدەکەم بزانیت منیش هێندە کەسێکی تایبەت و نموونەیی نیم وەک لە قسەکانمەوە وا دەردەکەوێت، منیش وەک تۆ گرنگ نییە بە لامەوە فاسۆلیاکە چەندە کاتی پێویستە بۆ ئەوە بکوڵێت! بەڵام هەر گوێی بۆ دەگرم، چونکە دەزانم بەم گوێگرتنە خۆشحاڵ و ئاسودە دەبێت، ڕاستگۆیی و دڵسۆزی ئەوەیە کارێک بکەیت هاوژینەکەت ئاسوودە بکات، ئەگەرچی ڕاستەوخۆ خۆشت ئاسوودە نەکات!

کاتێک تۆ لەسەر کارەکەتەوە دەگەڕێیتەوە بۆ ماڵەوە و یەکسەر هاوژینەکەت دەست دەکات بەسکاڵاکردن لە دەست منداڵەکان و دەڵێت: ڕۆژی ڕووناکیان لێ کردووم بە شەوی تار، ڕاستە ئەمە شتێکە دەبێت لە دوای هەموو شتەکانی ترەوە بخرێتە بەر باس و گفتوگۆ، هەمووومان کاتێک بە شەکەتی لەسەر کار دەگەڕێینەوە پێمان خۆشە بچینەوە ناو باخچەیەکی ڕازاوە، نەک مەیدانی جەنگ، بەڵام هاوڕێ بڵێین چی ئیتر ئەمانە ئافرەتن، نەکەی ئەم نقە و بۆڵەیەی هاوژینەکەت وات لێ بکات پرسیاری لێ نەکەت ئەمڕۆت چۆن بوو!

ڕاستە ئافرەت دەبێت لەوە تێبگات پیاو پێویستی بە پێشوازێکی هێمن و ئارام هەیە، کاتێکیش لێی دەپرسێت ئەمڕۆت چۆن گوزەراندن؟ ئەمە بەڵگەی ئەوەیە گرنگی و بایەخی پێ ئەدەیت، هەرگیز ئەوە ناگەیەنێ ئادەی وەرە با دادگایەک دابمەزرێنین و یەکتری دادگایی بکەین و بزانین تۆ ئەمڕۆ چیت کردووە و منیش چیم کردووە، بەڵام جاری وا هەیە تۆ تاکە کەسێکیت پەنات بۆ بهێنێت، بۆیە تۆش پەنای ئەو کەسە بدە کە هانات بۆ دێنێت و لە بیابانی وشک و برینگی ژیاندا فریادڕەسێکی باشبە!

هاوڕێ! ئافرەت پیاوێکی ئەوێت گرنگی بە وردەکارییەکانی ژیانی بدات، لای ئەو هیچ کام لەو وردەکاریانە شتی بچووک و کەمبایەخ نین، بەڵکوو هەموویان گەورە و بایەخدارن، هەگیز وا بیر نەکەیتەوە گرنگیدان بە وردەکارییە لابەلاکانی ژیانی هاوژینەکەت بەفیڕۆ دەچێت، بەم کارەت دڵ و دەروونی داگیر دەکەیت و دەیکەت بە موڵکی خۆت، ئەو لە ڕێگەی ئەم شتە بچووک و لابەلانەی ژیانەوە ئەیەوێت پێتبڵێت وەرە بمکە بە موڵکی خۆت و چێژ لە ژیان ببینە، گرنگیدانی تۆ بە شتە بچووک و سادەکانی ژیانی ئەو وادەکات ئەویش گرنگی نەک تەنها بە شتە بچووکەکانی تۆ، بەڵکوو گرنگی بە شتە گەورەکانی ژیانی تۆش بدات، بەهێزترین سوپایەک پیاو خاوەنی بێت، هاوژینێکە کە خۆشی بوێت.

۳. تۆ زیرەک و بیرتیژیت:

پێشتر زۆر قسەمان لەسەر ئەوە کرد کە ئافرەت بە گوێچکەکانی عاشق دەبێت و پیاویش بە چاوەکانی، وتیشمان ئەم یاسایە ئەگەرچی یاسایەکی ڕاستە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێت کە چاوەکانی کار ناکات، بەڵکوو مانای ئەوەیە زمانی شیرین و قسەی نەرم ئاسانترین ڕێگایە بۆ کردنەوەی دەرگای دڵی ئافرەت، جێی خۆیەتی لێرەدا ئاماژەیەکیش بۆ ئەوە بکەین کاتێک زۆربەی هەرە زۆری پیاوان بە جوانییەکانی ئافرەتدا هەڵدەدەن و لایەنە دەروونی و توانا عەقڵییەکانیان فەرامۆش دەکەن، بەم کارەیان هەڵەیەکی گەورە و بێپاساو ئەنجام دەدەن!

گومان لەوەدا نییە ئافرەت پێی خۆشە لە زاری مێردەکەیەوە ببیستێت کە سەرنجڕاکێش و خانومانە، ڕەنگی چاوە مەستەکانی دیل و کۆتی کردووە، بۆن و بەرامەی زووڵفی خاوی شێت و

شەیدای کردووە، دەستی نەرم و پەنجەی شمشاڵی، دەنگی نەرم و بەسۆزی، ئەمانە هەموویان ئافرەت گەلێک خۆشحاڵ دەکەن، بەڵام ئەوەش باش بزانە ئافرەت تەنها جەستەیەکی داڕنراو لە هەست و سۆز نییە، نە ئەو ئاوا لە خۆی دەڕوانێت و نە تۆش دەبێت ئاوا لێی بڕوانیت!

ئافرەت پێی خۆشە پیاو وەک مرۆڤێکی کامڵ لێی بڕوانێت، نەک تەنها لایەنێک لە لایەنەکانی کەسایەتی ببینێت، ئەگەر تۆ بە درێژایی تەمەنت دابنیشیت و هەر باسی جوانییەکانی ئەو بکەیت، ئەوا تۆ بەم کارەت پێ بزانیت یاخود نا، ئەوە پیشان ئەدەیت کە تۆ تەنها ڕووکەشی دەرەوەی دەبینیت کە ئێمە پێی دەڵێین جوانی! ئەگەر بە درێژایی تەمەنت دانیشیت و باسی زیرەکی و بیرتیژی بکەیت، ئەوا پێ بزانیت یاخود نا، لایەنی جوانی و مێیایەتیت فەرامۆش کردووە!

ئێمە لەنێوان دوو بژاردەی باشدا نابێت تەنها یەکێکیان دەستنیشان بکەین، بەڵکوو پێویستە هەتا پێمان بکرێت هەردووکیان پێکەوە کۆبکەینەوە، ئەو پێی خۆشە ستایشی ژیریکەشی بکەیت، نەک تەنها جوانییەکەی!

لەم زەمینە پانوبەرینەدا ژیانی ژنومێردایەتی نییە بەبێ گفتوگۆ بگوزەرێ، تەنانەت ئەو ژنومێردانەش کە خۆشەویستی لە نێوانیادا نییە گفتوگۆ لە نێوانیادا هەر ڕوودەدات، ئەمە هیچ پەیوەند بە زۆری و کەمی خۆشەویستی نێوان ژنومێردەوە نییە، بەڵکوو ئەمە شتێکە واقیعی ژیان ئەیسەپێنێت، چارەنووسی هاوبەش، ژیانی هاوبەش، ڕێکخستنی کاروباری ناو ماڵ، پەیوەندی ژن و پیاو بە ئەوانی ترەوە هەموو ئەمانە گفتوگۆ لەنێوان ژن و پیاودا دەسەپێنن.

هیچ ژیانێکی ژنومێردایەتی نییە خاڵی بێت لە گیروگرفت، یان ڕاستتر بڵێین خاڵی بێت لە ئاستەنگ و گۆڕانکارییە نوێیەکان، هەر

کاتێک ئاستەنگێک یان گۆڕانکارییەک هاتنە پێش، ئەوا پێویستە ژنومێرد پێکەوە دانیشن و هەریەکەیان ڕای خۆیان لەسەر ئاریشەکە بخەنە ڕوو، ئافرەتانیش وەک ئێمە هەندێک جار دەیپێکن و هەندێ جاریش نا، هەندێک جار چارەسەری زیرەکانەیان لایە و هەندێک جاریش نا، هەندێک جار پێشنیاری زۆر لۆژیکانە دەخەنە ڕوو، هەندێ جاریش پێشنیارەکانیان دروست نین و سەرچاوە لە هەست و سۆزەوە دەگرن، ڕۆڵی تۆ ئەوەیە ئەو ساتانە بقۆزیتەوە کە دەیپێکێت و چارەسەری ژیرانە و لۆژیکی پێشکەش دەکات بۆ ئەوەی بەرزی بکەیتەوە و پێی بڵێیت تۆ کەسێکی زیرەک و بیر تیژیت!

زۆر جار ئافرەتان چەندین پاساو بۆ بڕیارەکانی خۆیان دێننەوە، بۆ نموونە پێشنیاری گواستنەوەی منداڵەکان لە قوتابخانەیەکەوە بۆ قوتابخانەیەکی تر، بۆ ئەم پێشنیارە تەنها یەک هۆکار نابیننەوە بۆ نموونە ناکۆکی لەگەڵ ئیدارەی قوتابخانەکە سەبارەت بە شتێک، بەڵکوو ئەوان کۆمەڵێک پاساو بۆ ئەو پێشنیارە دەهێننەوە وەک ئەوەی ئەم قوتابخانەیەی تر تێچووی خوێندنی کەمترە، ماوەکەی نزیکترە، منداڵانی ئەم قوتابخانەیەی تر زیرەکتر و سەرکەوتووترن، ئەوان زیاتر لە ئێمەی پیاوان گرنگی بە وردەکاری دەدەن، ئەمەش خۆی بۆ خۆی شتێکی ئەرێنییە، کاتێک ئێمە تەنها گرنگی بە چارەسەرکردنی کێشەکان ئەدەین، ئەوان بیر لە چارەسەرکردن و بەدەستهێنانی دەستکەوتیش دەکەنەوە، ئەمەش هەلێکی گونجاوە بۆ ئەوەی ستایشی زیرەکی هاوژینەکەت بکەیت و پێی بڵێیت تۆ زۆر وریا و زیرەکیت و بچۆ خۆت چارەسەری کێشەکە بکە ئەگەر پێت خۆشە، تۆ لێردا چەند دەستکەوتێک بەدەست دێنیت، گرنگترینیان

ئەوەیە ستایشی زیرەکییەکەیت کردووە و ئەو هەستەت لە لا دروست کردووە کە ئەو مرۆڤێکی کاملە و تەنها بە جوانییەکەی سەرسام نیت، بە ژیری و دنیابینییەکەیشی سەرسامیت، سەرباری ئەوەش هەر ڕێگاچارەیەک کە مرۆڤ خۆی دەستنیشانی بکات، باشتر جێبەجێی دەکات وەک لەوەی بیسەپێنن بە سەریدا، ئیتر لەو سەرئێشەیەش ڕزگارت دەبێت هەموو جارێک هاوژینەکەت پێت بڵێت ئەم بڕیارە بڕیاری تۆ بوو، تۆ سەپاندت تەنانەت ئەگەر بڕیارەکە بڕیارێکی ڕاست و دروستیش بێ.

ئافرەتان ئیدارین زیاتر لە ئێمەی پیاوان، ئەمەش بۆ تەبیعەت و سروشتیان دەگەڕێتەوە، بڕوای تەواوت بەم قسەیە هەبێت، مووچەکەت هەرچەندە کەمە، بەڵام بەشتان دەکات و شەرەفمەندانە پێی دەژین بەبێ ئەوەی لە دەرگای هیچ کەسێک بدەن، بەبێ ئەوەی هیچ پسپۆڕێکی ئابووری نەخشەیەکی بۆ دانابن بۆ ئەوەی بتانگەیەنێتە سەری مانگ، ئەمە تەنها نەخشەی هاوژینەکەتە ئەڵبەت بە پشتگیری تۆوە، لێرە ئەیگرێتەوە بۆ ئەوەی لە شوێنێکی تردا خەرجی بکات، ئافرەت سروشتی وایە هەر کاتێک هەستی کرد پارەکە بەش دەکات خزمەتگوزاری زیاتر پێشکەش دەکات، هەر کاتێکیش زانی بەهۆی زۆری خەرجییەکانەوە پارەکە کەمبووەتەوە ئەوە، ئەو کاتە سیاسەتی سکهەڵگوشین (تقشف) دەگرێتەبەر، ئەمەش هەمان ئەو سیاسەتەیە کە دەوڵەتەکان ئەیگرنە بەر کاتێک دووچاری قەیرانی ئابووری دەبنەوە! ئەم قەیرانی ئابوورییەش شتێکە هەموو ماڵێک ڕووبەڕووی دەبێتەوە و زۆر جار ئافرەتان باشتر مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن، ئەمەش هەلێکی ترە بۆ ئەوەی سایشی ژیری و زیرەکێکەی بکەیت، زۆر گرنگە هاوژینەکەت نرخاندنی بۆچوون و جوان ڕاپەڕاندنی کارەکانی لە زاری تۆوە ببیستێت!

### ٤. بیرم ئەکردیت:

ئەم ڕستە ئەفسووناوییە ئافرەتان گەلێک حەز بە بیستنی دەکەن، ئەوان زۆریان پێخۆشە بزانن ئەگەر بە جەستەش لە مێردەکانیان دووربن، ئەوا یادیان لە هزر و بیری ئەواندا هەر بە زیندوویی دەمێنێتەوە، کارێکی یەکجار شادیهێنەرە بۆ ئافرەت کاتێک تۆ لەسەر کارەکەتەوە پەیوەندی پێوە دەکەیت و بۆ ماوەی دوو خولەک قسەی لەگەڵدا دەکەیت و پێی دەڵێیت بیرم ئەکردیت و حەزم کرد هەواڵت بزانم، خۆشبەختانە ژیان ڕۆژانە دەیان هەلمان بۆ دەڕەخسێنێت بۆ ئەوەی بە هاوژینەکانمان بڵێین: بیرت ئەکەم!

ژیان لە تەنها خاڵێکدا ڕاناوەستێت، ژیان گۆماوێکی مەنگ نییە بە ئەندازەی ئەوەی لە دەریایەک دەچێت کە هەرگیز لە شەپۆلدان ناکەوێت، تۆش هەوڵ بدە ئەم شەپۆلانە بۆ بەرژەوەندی خۆت بقۆزیتەوە!

بە دڵنیاییەوە ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕوویداوە پێش ئەوەی بچیت بۆ سەر کارەکەت هاوژینەکەت بە دەست سەرئێشەوە ناڵاندبێتی، ئەگەر شتێکی ئاوا دووبارە بوویەوە، بچۆ بۆ سەر کارەکەت و دوای دوو کاتژمێر مۆبایلەکەت هەڵگرە و پەیوەندییەکی پێوە بکە و پێی بڵێ ئێستا چۆنی؟ ئەمە تەنها هەواڵپرسین نییە، بەڵکوو شیفا و چارەسەریشە ئەگەرچی ڕەنگە خۆشت هەست بە گرنگییەکەی نەکەیت، بەم پەیوەندییە پێی ڕادەگەیەنیت کە بیری دەکەیت، بایەخی پێ دەدەیت، کار و سەرقاڵییەکانی ژیان ئەوت لە بیر ناباتەوە، زۆر گرنگە ئەو هەستەی لە لا دروست بێت کە ئەو گرنگیی خۆی هەیە، ڕۆڵی تۆش ئەوەیە ئەو هەستەی تێدا دروست بکەیت، ئەو تەنها

چێشتلێنەر و ڕێکخەری کاروباری ناو ماڵ نییە، گرنگیپێدانی تۆش بە ئەو نابێت تەنها لەسەر جێگای نوستن بێت، بەڵکوو دەبێت هەمیشە لە هزر و بیرکردنەوەتدا بێت، ئەگەرچی بە جەستەش لێت دوور بێت.

هەمیشە ئافرەتان دڵخوازی ئەو کەناڵانەن کە تایبەتن بە بواری چێشتلێنانەوە، هەروەها حەزیان لە دەستخستن و خوێندنەوەی ئەو کتێبانەشە کە لەو بوارەدا نووسراون، بە دڵنیاییەوە جارێک بووە پێت بڵێت ئەمڕۆ ئەمەوێت چێشتێکی نوێ تاقی بکەمەوە، باشە بۆ ئەبێت تۆ چاوەڕوانی بکەیت هەتا خوانەکە ساز دەبێت، ئەی بۆ دوو خولەک لە کاتی خۆت ناگریت و بچیتە پەنایەوە بۆ ئەوەی بزانیت کاروبارەکان چۆن دەچن بەڕێوە، ئەمە بۆ تۆ هیچی تێناچێت، بەڵام ئەو زۆر خۆشحاڵ دەکات و وای دەخوێنێتەوە کە تۆ هەمیشە لە بیری ئەو دایت و گرنگی پێ دەدەیت!

ئافرەتان باش دەزانن ناتوانن مێردەکانیان لە ماڵەوە بەند بکەن، چونکە ئەوانیش پێویستیان بەوەیە هاوڕێیان هەبێت و جاروبار بۆ بەسەربردنی کات لەگەڵیاندا بچێتە دەرەوە، بەڵام ئەوان ئەوەیان پێناخۆشە مێردەکانیان پشت لە ئەمان و ڕوو لە هاوڕێکانیان بکەن، ئافرەت زۆر شادمان دەبێت بەوەی کاتێک تۆ لە دەرەوەیت و بە پەیوەندییەکی تەلەفونیی تەنها دوو خولەکی، بەسەری بکەیتەوە و هەواڵی بپرسیت، پێی بڵێی: ئەرێ بەبێ من کاروباری ناوماڵ چۆن دەچێ بەڕێوە؟ لێی بپرسە ئەو کارانەی بڕیار بوو لە ماڵەوە ئەنجامیان بدەیت، ئایا ئەنجامت دان؟ ئەو پێی خۆشە دڵنیا بێت لەوەی هیچ کەسێک ناتوانێت تۆی لێ بکات و هەمیشە ئەو لە هزر و بیرکردنەوەی تۆدایە!

تەنانەت کاتێکیش هاوژینەکە لەگەڵ هاوڕێکانیدا دەرچوونێک دەکات، یان بە تەنها سەردانی ماڵە باوانی دەکات زۆر دڵنیابە لەوەی بێنیاز نییە لە هەواڵپرسینی تۆ، بە تەلەفۆن پەیوەندی پێوە بکە، لێی بپرسە لەگەڵ کێ دانیشتووی، کام هاوڕێت لەگەڵدایە، کاروبارەکانت چۆن بەڕێوە دەچن، هەواڵی کەسوکارەکەی بپرسە، ئەمانە شتگەلێکی بچووکن، بەڵام لە لای ئەو گەورە و پڕ بایەخن.

(بیرم ئەکردیت)، ئەم ڕستە ئەفسووناوییە ئەتوانیت بەبێ دەربڕینی وشەش بیڵێیت، ڕەنگە بە لاتەوە سەیر بێت وتن بەبێ دەربڕینی وشە؟ بەڵێ لە ڕێگەی کردارەوە دەتوانیت زۆر شت بڵێیت، ئەو کاتێک باس لە شتێکی جوان دەکات کە لە بازاڕدا دیویەتی و پێی سەرسام بووە، ئەوا تۆ خۆت بۆی بکڕە و بیکە بە سوپرایز بۆی، ئەو کات تۆ تەنها شتێکت بۆ نەکڕیوە کە حەزی لێی بووە، بەڵکوو پێشی دەڵێیت من هەردەم لە بیری تۆدام.

کاتێک دەڵێت: حەز دەکەم سەردانی ماڵی باوکم بکەم، بۆ ڕۆژی دواتر کاتێک تەرخان بکە و بڵێ سەردانی ماڵی باوکت دەکەین، ئەو دەزانێت ئەم داوایەی تۆ لەسەر بنەمای حەزەکەی دوێنێی ئەو بووە، تۆ تەنها لەو ڕووەوە شادومانت نەکردووە کە هاوڕێیەتی دەکەیت بۆ ئەوەی پێکەوە سەردانی ماڵی کەسوکاری بکەیت، بەڵکوو لەو ڕووەشەوە شادومانت کردووە کە ناڕاستەخۆ پێی دەڵێیت هەردەم لە بیرمدایت و حەزەکانت هەمیشە لە مێشکمدایە و کار بۆ جێبەجێکردنیان دەکەم.

نرخی گوڵێک چەندە؟ بەپێی پێوەرە مادییەکە شتێکی وا نییە شایەنی باسکردن بێت، شتێکی هەرزان و کەم تێچووە، بەڵام ئەو تەنها گوڵە کاتێک بە دەستیەوە دەگریت و لەگەڵ خۆتدا دەیبەیتەوە

بۆ ماڵەوە و پێشکەشی هاوژینەکەتی دەکەیت و لەگەڵیشیدا ناوچاوانی ماچ دەکەیت، یەکسانە بە هەرچی کێڵگەی گوڵ هەیە لە جیهاندا. بابەتەکە زۆر پەیوەندی بە گوڵەکەوە نییە، بەڵکوو پەیوەندی بە ئەو هەستەوە هەیە کە لە پشت گوڵەکەوەیە، لەگەڵ بینینی گوڵفرۆشی سەر شەقامەکە یەکسەر ئەوت بیر کەوتەوە، ئەو هەرچەند لە پەناتەوە نەبوو، بەڵام لەناو هزر و بیرکردنەوەتدا بوو، ئەمە ئەو شتەیە کە هاوژینەکەت خۆشبەخت و شادمان دەکات!

٥. پێویستت بە هیچ نییە هاوکاریت بکەم؟

پێشکەشکردنی هاوکاری نەک تەنها لە لای ئافرەتان و لەنێوان ژنومێرددا، بەڵکوو لە لای هەموو مرۆڤێک شتێکی پەسەند و پێشوازیلێکراوە، بیهێنەرە پێش چاوی خۆت شتێکی قورس لەناو ئۆتۆمبیلەکەتدایە و ئەتەوێت دایبگریت، لەو کاتەدا یەکێک لە دراوسێکانت بەوێدا تێدەپەڕیت و پێت دەڵێت پێویستت بە هاوکاری نییە، بێگومان تۆ بەم دەستپێشخەرییەی ئەو گەلێک خۆشحاڵ دەبیت، نەک تەنها لەبەر ئەوەی یارمەتی داویت بۆ داگرتنی شتە قورسەکە، بەڵکوو لەبەر ئەوەش کە دەبینیت کەسێک هەیە لە پەناتەوەیە و گرنگیت پێ ئەدات، پشتیوانیت لێ دەکات، بەبێ ئەوەی ناچاری بکەیت دەستی یارمەتیت بۆ درێژ دەکات!

ئادەی پێم بڵێ بزانم پێگەی دراوسێکەت ئێستا لەناو دڵتدا لە چ ئاستێکدایە، ئایا بەم کارەی جێگەی خۆی لە دڵی تۆدا نەکردەوە؟ وەک دراوسێیەکی باش لێی ناڕوانیت؟ چاوەڕوانی هەلێک ناکەیت بۆ ئەوەی وەڵامی ئەو هاوکارییەی بدەیتەوە؟ ئەگەرچی هاوکارییەکەیشی شتێکی سادە و ساکار بووە و هیچ تێچوویەکی ماددیشی نەبووە!

هەندێک شت هەیە تایبەتمەندی ئافرەتانە و پیاوان لێی بێبەشن، هەندێکی تر هەیە تایبەتمەندی پیاوانە و ئافرەتان لێی بێ بەشن، رەنگە زۆربەی لاپەرەکانی ئەم کتێبە تەرخان کرابن بۆ تاوتوێکردنی تایبەتمەندییەکانی پیاوان لە لایەک و تایبەتمەندییەکانی ئافرەتان لە لایەکی ترەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئێمە هەموومان لە یەک نەفس دروست بووین، کە ئەویش باوکە ئادەمە، کۆمەڵێک هەست و نەستی ئینسانی هەیە هەموومان تیایدا هاوبەشین بە ژن و پیاوەوە، بە گەورە و بچووکەوە، بە کاربەدەست و کاسبەوە، بە پزیشک و نەخۆشەوە!

پێویستی هەر یەکێکمان بە نرخاندن، رێزگرتن، گرنگیپێدان، لێکتێگەیشتن، نەرمونیانی، خۆشەویستی پێویستییەکە لە هەستی مرۆڤبوونمانەوە سەرچاوە دەگرێت، قسەی دراوسێکەت کە وتی: پێویستت بە هاوکاری نییە؟ هەستی خۆشحاڵی و منەتباری لە دڵ و دەروونی تۆدا دروست کرد، هەمان هەستی خۆشحاڵی و منەتباری لە دڵی هاوژینەکەشتدا دروست دەبێت، کاتێک سەرگەرمی کارێکە و پێی دەڵێت هیچت پێویست نییە بۆ ئەوەی هاوکاریت بکەم!

هیچ کەسێک نییە بەردەوام لە کاردا بێت، هەمووشمان ئەوەندەمان کات لە بەردەستدا هەیە بتوانین هاوکارییەک پێشەکەشی ئەوانی تر بکەین، بەشێک لە خۆشەویستی و مرۆڤدۆستی و گرنگیپێدان ئەوەیە کاتێک هاوژینەکەت دەبینیت سەرقاڵی ئامادەکردنی خوانی ئێوارەیە بچیت بۆ ژووری چێشتلێنان و پێی بڵێیت: پێویستت بە هاوکاری نییە! تۆ بەم کارەت دڵی رادەگریت و هەستی خۆشەویستی و جوامێری و منەتباری لە دڵ و دەروونیدا بەجێ دێڵیت، ئەمەش شتێکە لە میانی هەڵسوکەوت و مامەڵەی داهاتووی لەگەڵتدا بەرهەمەکەی

دەچنێتەوە، ئەمە کارێکی ئینسانی و ئەخلاقییە، نەک بێیت کۆنترۆڵی تەلەفزیۆنەکە بگریت بە دەستەوە و لەم کەناڵ بیگۆڕیت بۆ ئەو کەناڵ و ئەویش لە ژووری چێشتخانەکەدا و لە نزیکی تۆوە بە تەنها ماندوو ببێت و ئەرک بکێشێت بۆ ئەوەی نان و خوانێکی شایستە بۆ تۆ ساز بکات!

ئەم پرسیارە (پێویستت بە یارمەتی نییە؟) مەردانەیە:

ڕستەیەکی مەردانەتر هەیە، ئەویش ئەوەیە پرسیارەکە بگۆڕیت بۆ ئەم شێوەیە (ئادەی خۆت لادە با یارمەتیت بدەم)، پاشان لەگەڵیدا دەست بخەرە ناو ئیشەکەیەوە!

دەگەڕێمەوە بۆ نموونەی یەکەم: دراوسێکەت دراوسێیەکی جوامێر و بەئەمەک بوو کاتێک تۆی بینی ئەتەوێت شتێکی قورس لەناو ئۆتۆمبیلەکەت داگریت پێی وتیت: پێویستیت بە هاوکاری نییە؟ بەڵام ڕەنگە تۆ کەسێکی شەرمن بیت و بە لاتەوە قورس بێت پێی بڵێیت: بەڵی پێویستم بە هاوکارییە، بەڵام خۆ ئەگەر بیوتایە ڕاوەستە تا دێمە هاوکاریت و لەگەڵتدا دەستی بدایەتە کارەکە، ئیتر بوارێک بۆ شەرم و شکۆی تۆ نەدەمایەوە، چونکە هەندێک جار شەرم و شکۆ ڕێگەی وتنی بەڵێ دەگرێت، ئەگەر هەڵوێستی یەکەمی دراوسێکەت مەردانە بێت، ئەوا هەڵوێستی دووەمی مەردانەترە، گومان لەوەدا نییە تۆ ئەم دوو هەڵوێستە لە یەکتری جیا دەکەیتەوە و دەزانیت جیاوازییەکی ڕون و ئاشکرا لە نێوانیاندا هەیە.

ئەمەی دەرەوە بۆ ماڵەوەش ڕاستە، جوامێری خۆت دەسەلمێنیت کاتێک دەستپێشخەری دەکەیت و دەڵێیت ئادەی خۆت لادە با هاوکاریت بکەم و لەگەڵیدا دەست پێ بکەیت، شتەکە زۆر ئاسان و سادە و ساکارە پێویستی بە ڕۆتینی داوارکاری و ڕەزامەندی نییە،

ئەمە هاوژینەکەتە خۆ دەزگایەکی فەرمی نییە بەبێ پێشکەشکردنی داوا و نووسینی ڕەزامەندی لە سەری لە لایەن بەڕێوەبەرەوە هیچت بۆ نەکرێت.

زۆر بەداخەوە بەهۆی هەندێک کولتووری بۆماوەیی هەڵە و هەندێ دابونەریتی ڕیزیوی کۆمەڵایەتی بەشێک لە پیاوان پێیان وایە هاوکاریکردنی هاوژینەکانیان لە کاروباری ناوماڵدا لە نرخ و بەهای پیاوەتیان دێنێتە خوارەوە، لە ڕاستیدا ئەمە بۆچوونێکی پووچە و جگە لە لووتبەرزی و تێگەیشتنێکی هەڵە لە چەمکی پیاوەتی شتێکی تر نییە. پیاوەتی لە دڵڕەقیدا نییە، بەڵکوو لە سۆز و میهرەبانیدایە، پیاوەتی لە پشتتێکردندا نییە، بەڵکوو لە پێشکەشکردنی هاوکاری و هەڵگرتنی بەرپرسیاریتی و بەشداریکردندایە، پیاوەتی لە دەمارگیری و توندئاژۆییدا نییە، بەڵکوو لە ڕێزگرتن و خوێندنەوەی هەست و نەستی هاوژینەکەتدایە!

پێغەمبەری خودا درودی خوای لەسەر بێت گەورەی هەموو پیاوانی دنیا بووە، بە لایەوە شوورەیی نەبووە بە دەستی موبارەکی جلەکانی خۆی بدووریتەوە و نەعلەکانیشی پینە بکات، هەموو جارێکیش دەیفەرموو: نەرمونیان بن لەگەڵ ئافرەتاندا، چونکە وەک شووشە وان، زۆر ناسکن و دڵیان زوو دەشکێت، باشترین جۆری نەرمونیانیش لەگەڵ هاوژینەکەتدا ئەوەیە هاوکار و یارمەتیدەری بیت لە کاروباری ناوماڵدا، دووبارە خۆشەویست دەفەرموێت: باشترینتان ئەوانەن کە بۆ ژن و منداڵەکانتان باشترینن، من خۆم لە هەمووتان باشترم بۆ ژن و منداڵەکانم!

کەواتە چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ خانمی ماڵەوەدا لە هەموو بوارەکانی ژیاندا پێوەرە بۆ چاکێتی، یان خراپێتی پیاو. گومانیش لەوەدا نییە هاوکاریکردن یەکێکە لە کارە بەرز و پیرۆزەکان، گوێ بە دابونەریتە ڕزیوەکانی کۆمەڵگا و تێڕوانینی هەڵەی خەڵک مەدە؛

چونکە ئەوان مامۆستا و سەرمەشقی تۆ نین، بەڵکوو سەرمەشقی تۆ کەسێکە خودا خۆی ناردوویەتی بە ڕەحمەت بۆ هەموو جیهان!

بەڕاستی من لەوە تێناگەم ئەبێ هاوکاریکردنی ژن بۆ کاروباری ناوماڵ چ پەیوەندییەکی بە بابەتی شکۆی مرۆڤەوە هەبێت، هەر کارێک پێی هەستاین و مرۆڤبوونی خۆمان تێدا بەرجەستە کرد، هەرگیز پەڵە و لەکە لەسەر شکۆ و کەسایەتیمان دروست ناکات، بە ڕای تۆ کامیان مرۆڤدۆستترن؟ ئەوەی هاوکاری پێشکەش دەکات؟ یان ئەوەی تەنها بۆ خۆی دەژی؟ ئەوەی هەست بە ئەوانی تر دەکات؟ یان ئەوەی خۆپەرستە و تەنها بیر لە خۆی دەکاتەوە؟ هاوکاریکردنی دەوروبەر و گرنگیپێدانیان پێش هەر کەسێک خۆمان بەرهەمەکەی دەچنینەوە، نابینی کاتێک هاوکارییەک پێشکەش دەکەین لە ڕووی دەروونییەوە چەند هەست بە ئارامی و ئاسوودەیی دەکەین، ئەوەتا کاتێک خێرێک دەخەینە مشتی هەژارێکەوە ئێمە لەو خۆشحاڵتر دەبین.

### ٦. تۆ لە سەروەت و سامان گرنگتری:

ئافرەت هەستێکی یەکجار تاڵی بۆ دروست دەبێت کاتێک بۆی دەردەکەوێت مێردەکەی پارە و سامانی لە لا گرنگترە لەم.

هاوڕێ من هێندەش نموونەیی و تایبەت نیم پێت بڵێم پارە و سامان گرنگ نییە، زۆر بە پێچەوانەوە گرنگە و زۆریش گرنگە، پارە تەکانێکی باش بە ژیانی مرۆڤ ئەدات؛ چونکە زۆرێک لە خۆشگوزەرانییەکانی ژیان بە پارە دەکڕدرێن، زۆرێک لە گرفتەکات بە پارە چارەسەر دەکرێن، تەنانەت هەندێک جار سیحری پارە هێند کاریگەرە ماندوێتی و شەکەتیش دەڕەوێنێتەوە، بەڵام ئاگاداری ئەوە بە من وتم: پارە شتێکی گرنگە لە ژیاندا، نەموت هەموو ژیانە.

هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی پارە و سامانی زۆر هیچ شتێکی تێدا نییە، بەڵام جاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان ئەوەی پارە موڵکی تۆ بێت، یان تۆ موڵکی پارە بیت. هەندێک کەس لە ژیاندا وا هەڵپە دەکەن وەک ئەوەی کەرەستەی ماشینەوەی پارە بن، ئەو جۆرە کەسانە خراپترین جۆری مرۆڤن و مامەڵەکردن لەگەڵیشیاندا گەلێک ئەستەمە.

مەبەستی من لە ڕستەی (تۆ لە سەروەت و سامان گرنگتری)، ئەوە نییە پەتی بۆ شل بکەیت و هەرچی داوا کرد دەستبەجێ بچێتە ژێر باری ئەگەرچی لەسەر حیسابی ئۆقرەی خێزان و ڕەوتی ژیانیشتان بێت.

بە پێچەوانەوە ژیانی ژنومێردایەتی پێویستی بە نەخشەی ئابووری و دروستکردنی لیستی پێداویستییە هەنووکەیی و لەپێشینەکان هەیە؛ چونکە کڕینی هەموو ئەو شتانەی پێویستمانن جاری وا هەیە دەمانخاتە ناو گرفتی گەورەی داراییەوە کە زۆر جار سەر دەکێشێت بۆ داڕووخانی هاوسەرگیرییەکە بە یەکجاری، لە کاتێکدا ئێمە ئەمانەوێت پارێزگاریی لێ بکەین، نەک وێرانی بکەین.

هیچ کاتێک ئەوە بە ڕەزیلی و چرووکی دانانرێت کاتێک ژنەکە پێشنیاری کڕینی شتێک دەکات و مێردەکەشی بە هێمنی و لەسەرخۆیی لەگەڵیدا گفتوگۆ دەکات و بە ڕاشکاویش پێی دەڵێت توانا داراییەکانی ئێستامان بواری کڕینی ئەو شتەمان پێ نادات، پیاوەکە دژی کڕینی ئەو شتە نییە باش ئاگاداری ئەوەبە، ئەو تەنها تێبینی لەسەر کاتەکەی هەیە، بە دڵنیاییەوە هەر کاتێک باری داراییان ڕووی لە باشی کرد بەبێ پێوتن خۆی دەیکڕێت و دەیکات بە سوپرایز بۆ هاوژینەکەی. جاری وا هەیە بە پێچەوانەوە پیاو

نیازی ئەنجامدانی پرۆژەیەک دەکات و هاوژینەکەی پێی دەڵێت ئێستا کاتی نییە و شتی گرنگتر و لە پێشتر هەیە پێی هەستێت، ئەم ئافرەتە لێرەدا مەبەستی ئەوە نییە پیاوەکەی بێبەش بکات لە بەکارهێنانی سامانەکەی بە ئەندازەی ئەوەی مەبەستێتی مێردەکەی و خێزانەکەشی بپارێزێت لە هەڵگرتنی هەنگاوێک کە دواجار لێکەوتەی نەخوازراوی لەسەر ئۆقرەیی ژیانی خێزانیی لێ بکەوێتەوە!

مەبەستی من لە ڕستەی (تۆ لە سەروەت و سامان گرنگتری) ئەو کاتانەیە کە پارە و پوولی زۆرتان لە بەردەستایە و کڕینی ئەو شتەش کە هاوژینەکەت داوای دەکات کورتهێنانی ئابووری دروست ناکات و کاردانەوەی نەرێنیشی لەسەر ڕەوشی ژیانتان نابێت، بەڵام ئەو ماوەیەکی زۆرە لە چاوەڕوانیدا ماوەتەوە، تۆش بە لێشاو پارە خەرج دەکەیت، ئەی باشە ئەگەر تۆ هەر بەتەمایت ئەو شتەی بۆ بکڕیت، بۆ هەتا پارەت لە دەستدایە بۆی ناکڕیت؟

مەبەستی من بە (تۆ لە سەروەت و سامان گرنگتری)، سەبارەت بەو شتانەیە کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە ژیانی هاوژینەکەتەوە هەیە، ڕەنگە هەندێک جار هاوژینەکەت پێویستی بە سەردانی پزیشکێک بێت، کە بلیتی بینینەکەی گەلێک گران بێت، ئەو سەرەڕای ئازاری بەسۆی دان بە خۆیدا دەگرێت و بڕیار دەدات سەردانی پزیشکەکە هەڵوەشێنێتەوە؛ چونکە ئەو وای دەبینێت ئەو پارەیە لە پێداویستییەکی ناوماڵدا خەرج بکرێت باشترە، نەک چارەسەرییەکەی ئەو، ئای ئافرەتی ماڵەوە چەندە قوربانی بە خۆیان دەدەن، تەنانەت بە ڕۆحی خۆشیان. لێرەدا پێویستە پیاوەکە ئەم هەلە بقۆزێتەوە و پێی بڵێت: هیچ شتێک هێندەی تۆ گرنگ نییە، تەندروستی تۆ لە پێش هەموو شتێکەوەیە، کاروبارەکانی خۆت ڕێک بخە و متمانەت

بە خۆت هەبێت، دڵنیابە لەوەی خودا چاکەی چاکەکاران ون ناکات، پاداشتی چاکەش هەر بە چاکە ئەداتەوە، ئەگەرچی بەرامبەر بە هاوژینەکەی خۆشت بیکەیت. بڵێ ئەی خوایە خۆت فەرمانت پێ کردوین بە باشی لەگەڵ هاوژینەکانماندا بجووڵێینەوە، خۆ تۆ باش دەزانیت هەژار و دەستکورتم، بەڵام من پشت بە تۆ ئەبەستم هەتا یارمەتیم بدەیت بۆ ئەوەی بە باشی هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکەم! ئایا گومان دەبەیت خودا ئەم لاڵە و کڕووزانەوەی تۆ پشتگوێ بخات؟

بڵێ: خوایە پێغەمبەرەکەت فەرموویەتی باشترینتان ئەوانەن کە بۆ خێزان و ماڵ و منداڵیان باشترینن، من پێم خۆشە لەو باشترینانە بم، هاوژینەکەم ئێستا زۆر پێویستی بە منە، یارمەتیم بدە بۆ ئەوەی پێویستییەکەی دەربکەم، ئایا گومان دەبەیت لە دوای ئەم هەمووە پاڕانەوەیە تەنیات بخات و نەیەت بە دەمتەوە، هەرگیز هەرگیز ڕوونادات کەسێک بەرەو لای ئەو بچێت و بە دەستی خاڵی بیگێڕێتەوە و لە ئاستی گومانی باشی بەندەکەیدا نەبێت! سوێند بە خودا هەر کەسێک لە ئێمە ڕوو لە کابرایەکی دەوڵەمەند بنێین و پێی بڵێین: لێمان قەوماوە و جگە لە تۆ هیچ کەسێ شک نابەم! ئەوا دەست نانێت بە ڕوومماندا و بە دەستی بەتاڵەوە بەڕێمان ناکات، تۆ بڵێی ئەو دەوڵەمەندە لە خودا بەخشندەتر بێت؟ نا نا نا وا نییە، پاکی و گەورەیی بۆ خودا؟

بەم ئەندازەیە کۆتایی بە ڕستەکانی (ئەی کونجی بیکەرەوە) دێنم، چونکە ئەوەی وتوومە نامەوێت لێرەدا دووبارەی بکەمەوە و ئەوەشی بەتەمام بیڵێم لە شوێنی خۆیدا قسەی لەسەر دەکەم نەک لێرە، بەڵام دەکرێت لەوانەی ڕابردوو و ئەوانەی داهاتووش چەندین ڕستەی ئەفسووناوی وەربگریت و تەنانەت داهێنانیشیان تێدا بکەیت.

دووەم: بیکەرەوە ئەی نیسک!

ئەم بەشەیان تایبەتە بەو وشە هەڵانەی کە نابێت پیاوان بە ئافرەتانی بڵێن، چونکە ئازاربەخشن و ئەنجامەکەشی دڵخۆشکەر نابێت، وەک ئەوەی لە براکەی عەلی بابا ڕوویدا لەناو ئەشکەوتەکەدا!

١- کێشت زیادی کردووە!

یەکێک لەو ڕستانەی ئافرەت بریندار دەکات، ئەوەیە پێی بڵێن قەڵەو بوویت و کێشت زۆر زیادی کردووە!

کاتێک ئەم قسە دەخوێنیتەوە، ڕەنگە بڵێیت ئەی باشە چار چییە؟ دەتەوێت بێدەنگ بم؟ ناتوانم! چونکە من حەزم لە ئافرەتی قەڵەو نییە.

جارێ با لەسەر بنەمایەکی زۆر گرنگ ڕێک بکەوین ئەویش ئەوەیە: دەکرێت شتە باشەکان بە شێوازی خراپ و شتە خراپەکانیش بە شێوازی باش دەرببڕین.

دووەم: پێوەرەکانی جوانی لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر دەگۆڕێن، تۆ بیر بکەرەوە سەد ساڵ پێش ئێستا قەڵەوی یەکێک بووە لە پێوەرە گرنگەکانی جوانی، ڕیکلامێکی خەندەئامێزم خوێندەوە کە مێژووەکەی بۆ ساڵانی سییەکانی سەدەی ڕابردوو دەگەڕایەوە، تیادا بانگەشەی بۆ یانەیەک دەکرد کە یارمەتی ئافرەتان دەدات بۆ بەدەستهێنانی کێشێکی زیاتر، تیایدا هاتبوو: ئیتر لەمەولا ڕێگە مەدە تەنها ئێسک و پێست بیت! وەرە لەگەڵ ئێمەدا دەست پێ بکە.

تەنانەت عەرەبی جارانیش قەڵەوی ئافرەتیان بە بەشێکی گرنگ لە جوانی دادەنا، تەنانەت شیعری (خرساء الأساور)یشیان بۆ هۆنیوەتەوە کە واتاکەی ئەوەیە بازنەکانی دەستی خڕەی نایەت، چونکە باسکەکانی ئەستوور و پڕگۆشتن.

هەر سەردەمێک کولتووری تایبەت بە خۆی هەیە و ڕاگەیاندنیش دەوری لە دروستکردنیدا هەیە و حەزی گشتی لەسەر دروست دەکات و خەڵکی لەسەر ڕادێنێت، تا ئەو ئاستەی باوەڕ بە پیاوان دێنێت کە ئافرەتی لەڕ و لاواز جوانترە، تا ئەو ئاستەی ئافرەتی قەڵەو بە چاوی پڕحەسرەتەوە تەماشای خۆی بکات.

من نامەوێت تۆ حەزەکانی خۆت بگۆڕیت و لە دەرەوەی سەردەمەکەی خۆتدا بژیت. ناشڵێم: هاوژینەکەت هەرچۆنێک بوو، دەبێت خۆشت بوێت و هیچ تێبینییەکیشی پێ نەدەیت بۆ دابەزاندنی کێشی، تەنها یەک شتت پێ دەڵێم: ئەو کەسەی عاشقی ڕۆحی هاوژینەکەی بێت، زیرەکانە ڕەفتار دەکات بۆ گۆڕینی جەستەی.

نابێت هێندەش ڕەق و تیژڕەو بیت یەکسەر پێی بڵێیت: قەڵەو بوویت و کێشت زیادی کردووە! هەر وەک چۆن ژینگەی کۆمەڵگا و کاریگەری ڕاگەیاندن حەز و خولیای تۆی بەرەو لای باریکەلەیی و کەم گۆشتی بردووە، بە هەمانشێوە ئەو حەزەش لەودا دروست بووە، بەڵام نابێت ئەم بابەتە بە شێوەیەکی زەق و ڕاستەوخۆ بدەیتەوە بە ناوچاویدا.

کۆمەڵێک ڕێگای زیرەکانە هەن بۆ ئەوەی سەرنجی ڕابکێشیت و هانی بدەیت بە زوویی کێشی خۆی بێنێتە خوارەوە، بەمەش تۆ ئامانجەکەی خۆت دەپێکیت و هەستی ئەویش بریندار ناکەیت!

باشە تۆ بۆ لە خۆتەوە دەست پێ ناکەیت، تۆش شێوەت گۆڕاوە و کێشت زیادی کردووە بە بەراورد بەو کاتەی هاوسەرگیریتان کردووە، پێی بڵێ: من هەست دەکەم کێشم زیادی کردووە بۆ نایەیت پێکەوە کێشمان دابەزێنین، پێویستم بە هاوکاری تۆ هەیە بۆ ئەوەی بتوانم ئەو کارە بکەم، بە تەنها ناتوانم بەردەوام بم.

متمانەی تەوات هەبێت دەستبەجێ وەڵامەکەی ئەرێنی دەبێت، کێشی زیاد خەو لەو حەرام دەکات هەتا تۆ، ئەو زیاتر پێی هەراسان و بێزار دەبێت هەتا تۆ، ئەم ڕێگەیە تاقی بکەرەوە؛ چونکە ڕێگەیەکی تەندروست و زیرەکانەیە بۆ وتنی ئەو شتانەی کە ناکرێت ڕاستەخۆ بوترێن.

ڕێگەیەکی تریش هەیە ئەگەر حەزت نەکرد خۆت بخزێنیتە ناو بابەتی کێش دابەزاندنەکەوە، بێگومان تۆ دەزانیت هەندێک جلوبەرگی هەیە بەهۆی قەڵەوبوونیەوە ئێستا لەبەریان ناکات، پێی بڵێ: فلان جلوبەرگت زۆر جوانە بۆ ناتبینم بیپۆشیت؟

بێگومان یەکسەر مێشکی زەنگی ئاگادارکردنەوە لێدەدات و بۆی دەردەکەوێت کە تۆ دڵخوازی جەستەی جارانێتی نەک ئێستای! ئەمەش ڕێگەیەکی ترە دەتوانین لێیەوە ئامانجی خۆت بپێکیت بەبێ ئەوەی بریندارى بکەیت، پێی بڵێ: من ئەمەوێ وەک نەمام بیت، نامەوێ گۆشتنبی.

دووبارە دەتوانیت جلوبەرگێکی جوانی قەبارە تەسکی بۆ بکڕیت و بیخەیتە ناو کارتۆنێکی قەشەنگی دیارییەوە و پێشکەشی بکەیت، دڵنیابە زۆر خۆشحاڵ دەبێت و هەوڵ ئەدات لەبەری بکات بۆ ئەوەی بەو دیارییەوە بیبینیت، بەڵام ناتوانێت و پێشت ناڵێت بۆم بگۆڕە بە

جلوبەرگێکی قەبارە گەورەتر، بەڵکوو بە هەموو توانایەوە هەوڵ ئەدات کێشی خۆی بهێنێتە خوارەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ قەبارەی دیارییەکەی تۆدا بیگونجێنێت!

شتێکی گرنگ ماوەتەوە بیزانیت، ئەویش ئەوەیە زیادبوونی کێشی جەستەی ئافرەتان هەموو جارێک پەیوەندی بە زۆرخۆرییەوە نییە، بەڵکوو هەندێک جار بەهۆی منداڵبوون و ئەو گۆڕانکاریانەوەیە کە بەهۆی نەشتەرگەری منداڵبوونەوە دروست دەبێت، لە ٩٠٪ی ئافرەتان لە دوای منداڵبوون کێشیان زیاد دەکات، زۆربەشیان سەرکەوتوو نابن لە گێڕانەوەی کێشیان بۆ دۆخی جارانیان.

هەموو شتێک باجی خۆی هەیە، یەکێک لە باجەکانی منداڵبوونیش دروستبوونی گۆڕانکارییە لە جەستەی دایکەکەدا، بۆیە پێویستە تۆش کەسێکی لۆژیکی بیت و بزانیت هاوژینەکەت کابانی ماڵە، نەک ئەکتەری نمایشکردنی جلوبەرگ کە هیچ کارێکی نەبێت جگە لە گرنگیدان بە لەشولاری، دەزانی ئەو ئافرەتانەی ڕیکلامی جلوبەرگ دەکەن چۆن ئەژین، ئەزانی ناتوانن وەک ئێمە بە ئارەزووی خۆیان نان بخۆن، بۆ ئەوەی لەشولاریان بە ڕێکی و سووکەڵەیی بمێنێتەوە لە زۆر شت خۆیان بێبەش دەکەن، ئەگەر جارێکیش لە دەستیان دەربچێت خواردنێک بخۆن و ترسیان هەبێت کێشیان پێی زیاد ببێت، ئەوا پەنجە دەکەن بە قوڕگیاندا و خۆیان دەرشێننەوە لە ترسی قەڵەوبوون، ئێمە ژیانێکی ڕازاوە و خۆشمان دەوێت، نەک ژیانێکی دۆزەخئاسا، با واقیعی بین خۆمان لە گێلی نەدەین.

### ٢- خۆت چۆنت حەز لێیە وا بکە!

ئەم ڕستەیە کە هەندێک جار پیاو بۆ هاوژینەکەی بەکار دێنێت ڕەنگە لە سەرەتاوە کە گوێبیستی دەبیت بە هەڵوێستێکی جوان بێتە پێش چاو، بۆ نا؟ ئەی مەگەر هاوژینەکەی سەرپشک نەکردووە لەنێوان کردن یان نەکردنی کارێکدا؟ بەڵام لە ڕاستیدا ئافرەتان زۆر ڕقیان لە بیستنی ئەم ڕستەیەیە!

کاتێک هاوژینەکەت ڕاوێژت پێ دەکات سەبارەت بە کارێک، تۆش لە وەڵامدا پێی دەڵێی: خۆت چۆنت پێ باشە وابکە، ئەو زۆری پێناخۆشە ڕۆڵی تۆ لە ژیانی ئەودا نەرێنی بێت، ڕۆڵی تەماشاکەری فیلمێک ببینیت کە بە هیچ شێوەیەکە ناتوانیت ڕووداوەکانی ناو فیلمەکە بگۆڕیت، لانی کەم تێڕوانینی خۆتی پێ بڵێ، ئەو هاوبەشی ژیانتە بتەوێت یان نا، ئەو بەشێکە لە ژیانی تۆ و تۆش بەشێکیت لە ژیانی ئەو؛ بۆیە هەر شتێک لە ژیانی تۆدا ڕوویدات، بە شێوەیەک لە شێوەکان کاردانەوەی لەسەر ژیانی ئەویش دەبێت، هەروەها بە پێچەوانەشەوە، تەنانە ئەو شتانەش کە هەریەکە لە ژن و پیاو بە تەنیا لەگەڵیدا دەژین. نابینیت فشاری کارەکەت چۆن هەڵسوکەوتت دەگۆڕێت بەرامبەری، لە بەرامبەریشدا ئافرەت لە ماوەی سکپڕیدا شڵەژانی دەروونی بۆ دروست دەبێت و جەستەی لاواز دەبێت، ئەمەش دواجار وادەکات تۆ خۆتی لێ بگریتەوە و وەک جاران لێی نزیک نەبیتەوە.

هاوژینەکەت کاتێک ڕاوێژێت پێ دەکات سەبارەت بە کارێک، دیارە ئەو کارە هزر و بیری تەواو سەرقاڵ کردووە، خۆ ڕەنگە لای تۆ شتێکی سادە بێت و هیچ پەیوەندییەکیشی بە تۆوە نەبێت، بۆ نموونە ڕاوێژت پێ دەکات ئەری پێتباشە سەردانی

فلانە هاورێم بکەم؟ ئەو چاوەڕوانی هەڵوێستی تۆیە، دەیەوێت بزانێت تا چەند بایەخ و گرنگی پێ دەدەیت، خۆ ئەو کەنیزەکی بەردەستی تۆ نییە چاوەڕوانی فەرمانی تۆ بێت و تۆش لە وەلامدا بڵێیت: خۆت چۆنت حەز لێیە وابکە! ئەو لێرەدا دەیەوێت پێت بڵێت: بەشداربە لەم بڕیارەدا! بەلام تۆ دێیت بژاردەکانی وەک خۆی بۆ دەگەڕێنیتەوە. دیارە ئەمە خۆشحاڵی ناکات، ئێمەی پیاوان زۆر سەرنج ناخەینە سەر شتە وردەکان؛ چونکە ناخ و دەروونی ئێمە لە هی ئافرەتان جیاوازترە، ئەو هەستە ناخۆشەی بۆ ئافرەت دروست دەبێت کاتێک پێی دەڵێیت: بە حەزی خۆت بکە، بۆ ئێمەی پیاو دروست نابێت، بگرە ڕەنگە پێشمان خۆش بێت بە هەڵکردنی گڵۆپی سەوزیشی بزانین، ئێمەی پیاوان وەک ئەوان حەزمان لە بەشدارییپێکردنی ئەوانی تر نییە لە بڕیارەکانماندا، ئەوان حەز بە بەشدارییپێکردن و گرنگیپێدان ئەکەن.

بۆچی بڕیارەکە بۆ خۆی دەگەڕێنیتەوە؟ خۆ ئەو نەهاتووە گرفتێکی زۆر گەورە بهێنێتە بەردەستی تۆ بۆ ئەوەی چارەسەری بکەیت! کارێکی سادە و کەم بایەخە، کردن و نەکردنی وەک یەک وایە، هەر بژاردەیەکیان دەستنیشان بکەیت، مەبەستەکە دێتە دی، ئەمە زیاتر لە لیستی ناوی خواردنەکانی چێشتخانە دەچێت کە ئیشی تۆ تەنها ئەوەیە جورێکیان دەستنیشان بکەیت.

ئەو ڕاوێژت لە نموونەی ئەم شتانەدا پێ دەکات:

- تۆ ڕات چییە، قژم کورت بکەمەوە باشە، یان ڕەنگی بکەم؟
- پێت باشە شوێنی قەنەفەکان بگۆڕین؟
- گوڵەکان بگوێزمەوە بۆ ژووری میوان، یان هەر لە باڵکۆنەکەدا بێت؟
- تەلەفیزیۆنەکە ئەم شوێنەی ئێستای گونجاوترە، تۆ ئەڵێی چی؟

- ئەم جلەی لەبەرمدایە ڕەنگی سوور و سەوزیشی هەیە، کامیان جوانترە؟

- بۆ خوانی سبەینێ ماسی ساز بکەم یان مریشک؟

خۆ دیتت ئەم بژاردانە هیچیان کاتی زۆریان ناوێت بۆ بیرکردنەوە، هەموویان پەیوەندیان بە شوێن و شێوە و ڕەنگی شتەکانەوە بوو، هیچیان شتی تازە نەبوون، دە تۆش بەشداریکەرێکی باشبە و تێڕوانینی خۆت بخەرە ڕوو. کارەکە کەی هێندە قورسە؟

### ٣- من هەڵە بووم!

داننان بە هەڵەدا، گەورەییە. ئەوانەی هەڵە دەکەن و بەرگری لە هەڵەکانیشیان دەکەن، ئەوانە خەڵکانی لووتبەرز و خۆسەپێنن و دواجار تەنها ئەکەون و کەس لێیان نزیک نابێتەوە!

تەماشای ئیبلیس و ئادەم بکە، هەردووکیان هەڵەیان کرد، هەڵەی ئیبلیس ئەوە بوو سوجدەی بۆ ئادەم نەبرد و فەرمانی خودای شکاند! هەڵەی ئادەمیش ئەوە بوو لە بەری دارە قەدەغەکراوەکەی خوارد و ئەمیش فەرمانی خودای شکاند! تائێرە هەردووکیان هاوبەشن، بەڵام لێرە بەدواوە هەر یەکەیان ڕێچکەی خۆی دەگرێت، ئیبلیس مکوڕ بوو لەسەر تاوانەکەی و لووتبەرزیی نواند و دەستی کرد بە مشتومڕکردن لەگەڵ خودای گەورەدا و وتی: من لە ئادەم باشترم بۆ سوجدەی بۆ ببەم؟ بەڵام ئادەم هەر زوو دانی بە تاوانەکەیدا نا و تەوبەی کرد و داوای لێخۆش بوونی کرد، ئێمەی مرۆڤیش لە بەرامبەر هەڵەکانماندا هاوشێوەی یەکێک لەم دوو نموونەیە هەڵسوکەوت ئەکەین، هەمانە شتێک لە خووی ئیبلیسی تێدایە، مکوڕە لەسەر تاوانەکەی و لووتبەرزی ئەنوێنێت، هەشمانە خووەکەی ئادەم زاڵە بە سەریدا و زوو پەشیمان دەبێتەوە و بە خۆیدا دەچێتەوە و دەگەڕێتەوە بۆ ڕاستی.

پۆزشـهێنانەوەی پیـاو بـۆ ژنەکـەی کاتێـک هەڵەیەکـی دەرحـەق دەکات هەنگاوێکـی پیـرۆز و جوامێرانەیـە، ئـەو مرۆڤـەی پـۆزش دێنێتـەوە پێـی گـەورە دەبێـت، تەنانـە لـە چـاوی ئـەو کەسەشـدا کـە هەڵەکەی بەرامبـەری کـردووە، بـە پێچەوانـەی ئـەو کەللـەپووچانەی کە مکوڕن لەسـەر هەڵەکانیان، ئـەوان ڕێز و کەسـایەتی خۆیـان لـە چـاوی ئەوانـی تـردا لـە دەسـت دەدەن.

بـەڵام وشـەی (مـن هەڵـە بـووم)، کـە ئافـرەت پێـی خـۆش نییـە مێردەکـەی بـەکاری بهێنێـت ناچێتـە چوارچێـوەی ئـەو هەڵوێسـتە جوامێرانـەی کـە تۆزێـک پێـش ئێسـتا باسـمان کـرد، بەڵکـوو ئەچێتـە چوارچێـوەی هەڵوێسـتێکی تـەواو جیاوازتـرەوە، پێشـتر وتمـان ناکۆکـی و ڕاجیایـی شـتێکی سروشـتییە لـە ژیانـی هـەر ژنومێردێکـدا، مـادام ژیـان بـەردەوام بێـت ناکۆکیـش هـەر بـەردەوام دەبێـت، وەک دەزانیـن ناکۆکیـش پێویسـتی بەوەیـە بـە قسـە ڕووبـەڕووی یەکتـر ببنـەوە، ئالێرەدا هەندێـک لـە پیـاوان لـە ڕێـی ڕسـتەی (مـن هەڵـە بـووم) دەرگای مشـتومڕ دادەخـەن و لـە گرفتەکـە ڕادەکـەن.

لـە ڕاسـتیدا ئەمـە پێلێنـان و داننـان بـە هەڵـەدا نییـە، بەڵکـوو ئەمـە ڕاکردنـە لـە وتووێـژ، دواخسـتنی کێشـە و هێشـتنەوەیەتی بـە هەڵواسـراوی، دەکرێـت ڕۆژ لـە دوای ڕۆژ کێشـەی تریشـی بێتـە سـەر، بریـن نادورێتـەوە هەتـا شـوێنەکەی خاوێـن نەکەیتـەوە، ڕاکردنـی تـۆ لـە گرفتەکـە و پێشـت وابێـت بـەم سـەرنانەوە ئیتـر کێشـەکەت بـۆ چارەسـەر دەبێـت ئـەوە وەک ئـەوە وایـە برینەکـە پاکنەکەیتـەوە و بیدوریتـەوە، زۆر نابـات برینەکـە دەسـت دەکات بـە هەوکردن و ئـازار برسـتت لـی دەبرێـت.

ناکۆکییەکانی ئێوە لەم سێ خاڵە بەدەر نییە:

- یان تۆ هەڵەیت.
- یان ژنەکە هەڵەیە.
- یان هەڵە لە هەردووکتانەوەیە.

ئەگـەر هەڵەکـە لـە لایەنـی تـۆوە بـووە، ئـەوا چارەسـەری هەڵـە بـەو شـێوەیە ناکرێـت، تەنهـا پۆزشـهێنانەوە چارەسـەری هەڵـە نـاکات، پۆزشـهێنانەوەش شـێوازی خـۆی هەیـە، پێشـینان وتوویانـە: ئـاگاتِ لـەو وشـانە بێت کـە پۆزشـیان پـێ ئەهێنیتـەوە؛ چونکـە دەرهێنانـی تیـر لەنـاو گۆشـتدا ئازارەکـەی بەسـۆترە لـە پیاچوونـی تیرەکـە! ئێمـە نامانەوێـت گرفـت بـە گرفـت چارەسـەر بکەیـن، بەڵکـوو ئەمانەوێـت ئاگرەکـە بـە یەکجـاری بکوژێنینـەوە، نـەک تەنهـا کڵپـەی ئاگرەکـە خامـۆش بکەیـن و پشـکۆی ژێـر خۆڵەمێشـەکان بهێڵینـەوە بـۆ ئـەوەی جارێکـی تـر ئاگرەکـە سـەر هـەڵ بداتـەوە.

ئەگـەر هەڵەکـەش لـە لایەنـی ژنەکەتەوەیـە، ئیتـر بۆچـی لێـی ڕائەکەیـت؟ بـۆ سـووچی ئـەو دەخەیتـە ئەسـتۆی خـۆت؟ ڕای خـۆت دەربـبڕە و پێـی بڵـێ: تـۆ هەڵـەی! بـەڵام بـە شـێوازێکی وا کـە سـووکایەتیی پـێ نەکەیـت و ڕێـز و شـکۆی نەشـکێنی، بـەڵام ئـەو هەوڵـەی تـۆش بـۆ ئـەوەی هەڵـەی ئەویـش بخەیتـە ئەسـتۆی خـۆت، تەنهـا لـە پێنـاوی ئـەوەی لـە گرفتەکـە ڕابکەیـت ئەمـە نـەک هـەر کێشـەکەت بـۆ چارەسـەر نـاکات، بەڵکـوو کێشـەی تریشـت بـۆ سـەربار دەکات؛ چونکـە وەک پێویسـت خاڵـت لەسـەر پیـت دانەنـاوە.

ئەگەر هەڵەکەش دوو لایەنە بوو، کە ئەمە شتێکە بە زۆری ڕوو ئەدات، کێشە خێزانییەکانیش وەک ڕووداوەکانی هاتوچۆ وان بە دەگمەن ڕێک دەکەوێت ١٠٠٪ی هەڵەکە بکەوێتە ئەستۆی لایەک و لاکەی تریش بێ هەڵە و پەڵە بێت، بەڵکوو بە زۆری وایە لایەکیان لە ٧٠٪، لاکەی تریش لە ٣٠٪ تاوانەکە ئەکەوێتە ئەستۆی، زۆربەی کێشە خێزانییەکان ڕێژەکەیان بەم شێوەیە، هەندێک جار ئێمە لە کاردانەوەی هەڵەی هاوژینەکانماندا هەڵەی هاوشێوە ئەنجام ئەدەین، چارەسەر لێرەدا ئەوەیە ڕاشکاو بیت و بە ژنەکەت بڵێیت: من دان بە هەڵەی خۆمدا ئەنێم لە فڵان و فڵان و فڵاندا، سەرەتا لە خۆتەوە دەست پێ بکە، هەڵەکانی خۆتی بۆ بژمێرە مادام لە خۆتەوە دەستت پێ کرد، ئیتر هەر ڕەخنەیەکی لێ بگریت ئامادەیە لێتی وەربگرێت، پاشان دەست بکە بە ژماردنی هەڵەکانی ئەو، ئێستا هێناتە ڕیزی خۆتەوە، عەرەبیش وتوویانە: هەرکەسێکت هێنایە ڕیزی خۆتەوە، زوڵمت لێ نەکردووە! پاشان پێی بڵێ تۆش لە فڵان و فڵان و فڵاندا هەڵە بوویت! نەدەبوو من ئاوا بڵێم، دەبوو ئاوام بوتایە، نەدەبوو ئاوام بکردایە، دەبوو ئاوام بکردایە. بە هەمان شێوە تۆش نەدەبوو ئاوا بە من بڵێیت، دەبوو ئاوات بوتایە، نەدەبوو ئاوات بکردایە، دەبوو ئاوا بکەیت.

بەڵام هەر لە سەرەتاوە بڵێیت من هەڵە بووم، ئەمە هەنگاوێکی دروست نییە. ناکۆکی بە خۆگێلکردن لێی کۆتایی نایەت، بەڵکوو دوادەکەوێت و هەر پەنگ دەخواتەوە تا لە جاری ئاییندەدا توندتر و گەرمتر سەر هەڵ دەداتەوە، برینەکە خاوێن بکەرەوە خۆی زوو چاک دەبێتەوە.

## ٤- ئێستا کاتم نییە!

پێشتر وتمان: دەستنیشانکردنی کاتی گونجاو بۆ هەر کارێک یەکێکە لە گرنگترین هۆکارەکانی سەرکەوتنی کارەکە، بۆیە پێویستە لەسەر هەموو لایەکمان بە ژن و بە پیاوەوە کاتی گونجاو دەستنیشان بکەین بۆ وتنی هەندێک شت بۆ ئەوەی کەسی بەرامبەر ئامادەی گوێگرتنی تێدا بێت، بەمەش خۆمان دەپارێزین لەوەی قسەکەمان جێگەی خۆی نەگرێت بەهۆی ئەوەی لە کاتێکی گونجاودا نەمانکردووە، بۆ نموونە کاتێک هاوژینەکەت لەگەڵ هاورێکانیدا پێکەوە لە ئاهەنگێکدان، تۆش لەم کاتەدا پەیوەندی پێوە بکەیت و بڵێیت: پێت چۆنە کورەکەمان لەم قوتابخانەوە بگوێزینەوە بۆ قوتابخانەیەکی تر؟ یان پێت چۆنە فلان شتی ماڵەوە بگۆرم؟ ئەم قسانەی تۆ لەم کاتەدا لەگەڵ هاوژینەکەتدا دەیکەیت، نەک هەر کاتی خۆی نییە، بەڵکوو کارەساتیشە.

تەنانەت لە بواری پزیشکی و نەشتەرگەریشدا حاڵەتی خێرا و حاڵەتی سارد هەیە! لە حاڵەتە خێراکاندا چاوەروانی تێپەربوونی کات ناکرێت، بریندارانی رووداوەکانی هاتوچۆ راستەوخۆ دەیانبەن بۆ بەشی فریاکەوتن و بە خێرایی پزیشک لە سەریان ئامادە دەبێت، بەڵام ئەگەر کەسێک کیسێکی چەوری لە لاملیدا دروست بووبێ و بیەوێت لای ببات نایەت بۆ ئەم حاڵەتە بچێت بۆ نەخۆشخانەی فریاکەوتن؛ چونکە ئەمە حاڵەتێکی ساردە و پێویست بە چاوەروانی دەکات، لۆژیکی نییە نەخۆشخانەیەک خۆی سەرقاڵ بکات بەم حاڵەتە ئاساییەوە لە کاتێکدا دەیان نەخۆشی مەترسیدار روویان لە نەخۆشخانەکە کردووە، بەڵکوو ئەم کەسە بۆ دەرهێنانی کیسە چەورییەکە سەردانی نۆرینگەی پزیشکێک دەکات، دوای ئەنجامدانی

چەند پشکنینێک ڕۆژێکی بۆ دیاری دەکرێت و بە نەشتەرگەری چەورییەکەی بۆ دەردەهێنرێت! ئەمیش هەر وەک ئەو وایە! با وای دابنێین کوڕە بچووکەکەتان لەسەر سەر کەوتووە و خوێنی لێ دەڕوات، یان ئاوی گەرم ڕژاوە بە دەستیدا ئا لەم کاتەدا گرفت نییە ئەگەر دۆخەکەی لێ تێک بدەیت، بەڵکوو باشتر وایە یەکسەر ئاگاداری بکەیتەوە، چونکە ئەمە بابەتێکی تازە و خێرایە، بەڵام گواستنەوەی منداڵەکەتان لە قوتابخانەیەکەوە بۆ قوتابخانەیەکی تر، یان گواستنەوەی شتێکی ناوماڵ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر ئەمە ئێستا کاتی نییە.

لە بەرامبەردا هاوڕێی بەڕێز دووبارە پێویستە لە حاڵەتە ساردەکانیشدا کاتی گونجاو دەستنیشان بکەیت بۆ داواو و داخوازییەکانت، بۆ نموونە با وای دابنێین کات کاتی تاقیکردنەوەکانی کۆتایی ساڵە، ئەوەی سەعی بە منداڵەکانت دەکات تەنها هاوژینەکەتە، چونکە تۆ سەرقاڵی بە کاری ترەوە، ئا لەم کاتەدا لۆژیکی نییە بێیت بە هاوژینەکەت بڵێیت ئەمەوێت هاوڕێکانم بانگهێشتی ئێوارەخوانێک بکەم بۆ ماڵەوە! تۆ لێرەدا خۆت دەخەیتە ناو گرفتێکەوە کە حەق نییە خۆتی تێبخەیت، مادام کاتی تر هەیە بۆ بانگهێشتکردنی هاوڕێکانت باشتر وایە لەم کاتە ناسکەدا هاوکاری هاژینەکەت بکەیت و ئەرکی سەعیپێکردنی هەندێکیشیان لە ئەستۆ بگریت، نەک بێیت بارەکەی قورستر بکەیت، ئەرکی کۆمەڵێک میوانیش بخەیت بە سەریدا، خۆ ئەگەر ناسکی دۆخەکەت لە بەرچاو نەگرت و داوای ئامادەکردنی خوانەکەت لێ کرد. ئەویش وتی لە ئێستادا کاتم لە بەردەستدا نییە! ئەوا بۆت نییە بڵێیت: ڕێزی پیاوەتی منی نەگرت و قسەی شکاندم و ڕێگە نادات هەر کەسێک بمەوێت بیهێنمە ماڵەوە! تۆ

خۆت کاتێکی نەگونجاوت هەڵبژاردووە و وات لێ کردووە ئەویش کاردانەوەیەکی وای هەبێت کە تۆ پێتوایە هەڵەیە.

با بگەڕێینەوە بۆ سەر باسەکەی خۆمان، ئافرەت پێی ناخۆشە ئەم ڕستەیە لە مێردەکەیەوە ببیستێت: ئێستا کاتم نییە؛ چونکە لەو کاتەدا وا هەست دەکات لە لای مێردەکەی بێزراوە و هەموو شتەکانی تری بە لاوە گرنگە ئەم نەبێت، ئەمەش خۆی بۆ خۆی هەستێکی ئازاربەخشە.

ئەم ئامۆژگارییە وەک چۆن بۆ پیاوانە، ئاوهاش بۆ ژنانە، پێویستە ئەوانیش کاتی گونجاو بۆ قسە و داواکانیان ببیننەوە، بۆ ئەوەی هەم خۆیان و هەم مێردەکانیشیان تووشی ئەو سەرسووڕمانە نەکەن.

زۆر گرنگە ئێمە هەندێک جار وەک ئیسفەنج وابین، نەک وەک مێزی بلیارد! مێزی بلیارد کاتێک تۆپەکە ئەکێشێت بە تەنیشتەکانیدا بە هێزێکی زۆرەوە دەیگەڕێنێتەوە، چونکە لە لاستیک دروست کراوە، بەڵام ئیسفەنج لێدانە توندەکان ناداتەوە، بەڵکوو هەڵیاندەمژێت و خاویان دەکاتەوە، هەندێک جار کاردانەوە کارەکە بچووک دەکاتەوە، هەندێک جاریش لە قەبارەی خۆی گەورەتری دەکات.

یونس الصدفی دەفەرموێت: لە شافیعی ژیرترم نەدیوە، ڕۆژێک لەسەر بابەتێک گفتوگۆیەکی زانستیمان کرد و نەگەیشتینە ڕێککەوتن و لە یەکتر جیا بووینەوە، دوای ماوەیەک پێمگەیشتەوە و دەستی خستە ناو دەستمەوە و فەرمووی: ئەی ئەبو موسا! ئایا ناکرێت من و تۆ برا بین و لە بابەتێکیشدا ناکۆک بین؟

تەماشای ژیریی ئیمامی شافیعی و کاردانەوە جوانەکەی بکە لەگەڵ یونسدا، کاتێک پێی دەگاتەوە لەنێوان دوو بژاردەدایە، یان ئەوەیە وەک دوژمن و نەیار مامەڵەی لەگەڵدا بکات، یان وەک برا و دۆست، دەی ئیمام دووەمیانی هەڵبژارد!

پاشـان تەماشـای ئاسـەواری کاردانەوەکـەی ئیمامـی شـافیعی بکـە لەسـەر دڵ و دەروونـی یونس، ئەوەتا ئەو خۆی جوامێریی شافیعی بـۆ خەڵـک دەگێڕێتـەوە، ئێمـە لـە ڕێگـەی ئـەوەوە ئـەم ڕووداوەمـان پێگەشـتووە کـە جگـە لـە خـۆی و شـافیعی کـەس نەیئەزانـی.

ژیانـی ژنومێردایەتـی مەیدانـی جەنـگ نییـە یەکێـک سـەکەوتن بـە دەسـت بهێنێت و ئەویتریش شکست، ژیانی ژنومێردایەتی بریتییە لە هۆگـری و پێکەوەژیـان، ئەمـەش بـە لەیەکترتێگەشـتن و دانبەخۆداگرتـن و چاوپۆشـیکردن دێتـە دی!

٥- تۆش هەر وەکو دایکتیت!

لـەم ماوانـەی دوایـدا چەندیـن جـار لـە قوتابخانەکانـی وڵاتـە یەکگرتووەکانـی ئەمریـکا قوتابـی بـە چـەک تەقـەی لـە هـاوڕێ قوتابییەکانـی تـری کـردووە، کـە چەندیـن کـوژراو و برینداریشـی لـێ کەوتووەتـەوە! لـە هەمـوو ئـەم ڕووداوانـەدا لێکۆڵینـەوەکان دەڵێـن: کوژراوەکان دووروونزیـک هیـچ پەیوەندییەکیـان بـە بکوژەکەوە نەبووە، هەندێکیـان بکوژەکەیـان هـەر نەناسـیوە، هەندێکـی تریشـیان تەنهـا لـە گۆڕەپانـی قوتابخانـە دیویانـە و بـەس، تووڕەیـی ئـەم بکـوژە ڕەنگـە لـە تەنهـا کەسـێک بێـت، بـەڵام تۆڵەکـەی لـە هەمـووان کردووەتـەوە.

ئەم هەڵسوکەوتە شێتانەیەی کە ئەم قوتابییە پێی هەستاوە، هەندێک لە پیاوانیش بە شێوەیەک لە شێوەکان دووبارەی دەکەنەوە، بەڵام نەک بە تەقاندنـی فیشـەک، بەڵکوو بە تەقاندنـی سـووکایەتی بەسـەر هەمـوو لایەکدا، ئـەوەی پەیوەنـدی بە کێشـەکەیەوە هەیە و ئەوەشـی نیەتی!

ناکۆکـی تـۆ لەگـەڵ هاوژینەکەتدا لەسـەر بابەتێک چ پەیوەندییەکی بـە دایکیـەوە هەیـە؟ بـۆ بازنـەی ناکۆکییەکـە گەورەتـر دەکەیـت؟ بـۆ ژمـارەی نەیارەکانـت بـە دەسـتی خـۆت زیـاد دەکەیـت لـە کاتێکدا بڕیارە

ئەم ناکۆکییە تەنها لەنێوان دوو کەسدا بێت، تۆ و هاوژینەکەتە؟

هەرچەندە خۆشەویستیی بێسنوورت بۆ هاوژینەکەت هەبێت، بەڵام ئەویش دایکێتی و هەرگیز ڕازی نابێت بە تەنها وشەیەکیش سووکایەتی پێ بکەیت!

تۆش بە هەمان شێوە ڕازی نابیت دایکت بە وشەیەکیش سووکایەتی پێ بکرێت، ئەوە بۆ ئەو شتەی تۆ بەرامبەر بە خەڵک دەیکەیت ڕازی نابیت خەڵک بەرامبەر بە خۆت بیکاتەوە! ئەمە یاسایەکی زۆر گرنگە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ دەوروبەردا، هەر شتێک بۆ خۆت پێی ڕازی بوویت، ئەوا بەرامبەر بە خەڵکانی تریش بیکە، بەڵام ئەگەر بۆ خۆت پێی ڕازی نەبوویت ئەی چۆن چاوەڕوان دەکەیت خەڵک پێی ڕازی بن.

ئەم یاسایە هەڵێنجراوی فەرموودەیەکی پێغەمبەری خودایە درودی خوای لەسەر بێت، کە ئیمامی ئەحمەد لە موسنەدەکەیدا دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت:

جارێک گەنجێک هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خودا درودی خوای لەسەر بێت و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ڕێگەم بدە با داوێنپیسی (زینا) بکەم! هەموو خەڵکەکە لێی ڕاپەڕین و تێیانخوڕی، بەڵام پێغەمبەری خودا فەرمووی: وازی لێ بێنن با بێت بۆ لای خۆم، هات بۆ لای و ئەویش لە پەنای خۆیەوە داینا و فەرمووی: پێت خۆشە خەڵک داوێنپیسی لەگەڵدا دایکتدا بکەن؟ وتی: نەخێر قوربان! پێغەمبەری خوداش فەرمووی: دەی خەڵکیش پێیان خۆش نییە داوێنپیسی لەگەڵ دایکیاندا بکرێت!

پێت خۆشە داوێنپیسی لەگەڵ کچتدا بکرێت؟ وتی: نەخێر! پێغەمبەری خوداش فەرمووی: دەی خەڵکیش پێیان خۆش نییە داوێنپیسی لەگەڵ کچیاندا بکرێت.

پێت خۆشە داوێنپیسی لەگەڵ خوشکتدا بکرێت؟ وتی: نەخێر! پێغەمبەری خوداش فەرمووی: دەی خەڵکیش پێیان خۆش نییە داوێنپیسی لەگەڵ خوشکیاندا بکرێت!

پێت خۆشە داوێنپیسی لەگەڵ پوورتدا بکرێت؟ وتی: نەخێر! پێغەمبەری خوداش فەرمووی: دەی خەڵکیش پێیان خۆش نییە داوێنپیسی لەگەڵ پووریاندا بکرێت.

پاشان پێغەمبەری خودا دەستی موبارەکی خستە سەر سنگی گەنجەکە و فەرمووی: خوایە لە گوناهەکانی خۆشبە، دڵی خاوێن بکەرەوە، لە داوێنپیسی بیپارێزە!

هەرگیز رێگە بە سووکایەتیپێکردنی کەسوکارەکەی ئازاری هاوژینەکەت مەدە، چونکە دواجار نێوانتان ئاسایی دەبێتەوە و هەموو شتێک وەک خۆی لێ دێتەوە، هەرچیت بە خۆی وتووە بیری دەچێتەوە، بەڵام ئەوەی بە کەسوکارەکەیت وتووە هەرگیز بیری ناچێتەوە و بەردەوام ناخی ئازار ئەدات، هەمیشە ئەوەی بە بیردا دێت کە تۆ دایکی بە سووک تەماشا دەکەیت و وەک ئافرەتێکی نەگریس لێی دەڕوانی و نموونەی ئەو ئافرەتانەیە کە ژیان لەگەڵیاندا ئەستەمە.

کاری پیاوانی ئاگرکوژێنەوە لە کاتی ئاگرکەوتنەوەدا گەمارۆدانی ئاگرەکە و وەستاندنێتی لە شوێنێکی دیاریکراودا بۆ ئەوەی پەل نەهاوێژێ بۆ شوێنەکانی تر، پاشان خامۆشکردنیەتی، تۆش ئەگەر ئەم رێوشوێنە بگریتەبەر، بە ئاسانی دەتوانیت ئاگری ناکۆکییەکە بکوژێنیتەوە و نێوانتان ئاسایی بکەیتەوە، بەڵام ئەگەر پەلکێشی خەڵکانی تر بکەیت بۆ ناو کێشەکەت، ئەو کاتە دەرگای ئاگرەکە دەکەیتەوە بۆ ئەوەی رووبەرێکی زیاتر بسووتێنێت، کە ئەگەر ئەو هەنگاوە هەڵەیە نەنێیت هەرگیز ئاگرەکە شوێنی تر داگیر ناکات!

**٦- تۆ جیاوازی لە هەموو ئەو ئافرەتانەی کە من ناسیومن!**

ئەم ڕستە لە ڕووکەشدا ستایش و پیاهەڵدانە، بەڵام ناوەڕۆکەکەی شتێکی تر لە خۆ دەگرێت کە هەرگیز هاوژینەکەت خۆشحاڵ ناکات، ئەم قسەیەی تۆ ئەو گومانەی لە لا دروست دەکات کە پێشی ئەم ئافرەتانی ترت ناسیون، ئەو سەرنج ناخاتە سەر ڕووکەشی ڕستەکە، بەڵکوو سەرنج دەخاتە سەر ناوەڕۆکەکەی، ئەمە گومانێکی ڕەوایە و دڵپیسی نییە، ئادەی تۆ خۆت بخەرە شوێنی ئەو و با ئەو بە تۆ بڵێت: تۆ جیاوازی لە هەموو ئەو پیاوانەی کە من ناسیومن، بە دڵنیاییەوە ئەم ستایشە دڵخۆشت ناکات، بگرە دڕدۆنگت دەکات و دەڵێیت ڕەنگە ئەم ژنەی من ئەزموونی زۆری لەگەڵ پیاواندا هەبووبێت، دەکرێت لە دوای بیستنی ئەم قسەیەی ژنەکەت، ژیانتان هەرگیز وەک جارانی لێ نەیەتەوە!

لە زانستی بەلاغەی عەرەبیدا بابێکی فراوان هەیە بە ناوی (باب المدح والذم)، واتە باسی پیاهەڵدان و زەمکردن، لەژێر ئەم بابەتەدا دوو بەشی گرنگ هەن کە ئەوانیش:

- پیاهەڵدان بە مەبەستی زەمکردن.
- زەمکردن بە مەبەستی پیاهەڵدان.

ڕۆژێک حوطەیئە کە ناوی شاعیرێکە بە زیبریقانی کوڕی عەدی وت:

دع المكارم لا ترحل لبغيتها

واقعد فإنك أنت الطاعم الكاسي

واتە: واز لە شکۆ و بەها باڵاکان بێنە و بە شوێنیاندا مەڕۆ، بچۆ لە ماڵەوە بۆ خۆت دانیشە؛ چونکە تۆ خاوەنی خواردن و جلوبەرگیت.

ئەم شیعرە لە ڕواڵەتدا ستایشە؛ چونکە دەڵێت مادام خواردن و جلوبەرگت هەیە، ئیتر ئەوە خۆی بۆ خۆی شکۆ و بەهایە و پێی ناوێت بە شوێنیدا ڕابکەیت، بەڵام لە ناوەڕۆکدا زەم و سووکایەتیپێکردنە؛ چونکە چواندوویەتی بە ئافرەتان لەوەدا کە ئەمیش وەک ئەوان ئیشی تەنها خواردن و خواردنەوە و جللەبەرکردنە!

ئەم زیبیرقانی کوڕی عەدییە هات بۆ خزمەت ئیمامی عومەر و سکاڵای لە دژی حوطەیئە کرد و وتی: قوربان لە شیعرێکدا سووکایەتی پێ کردووم! کە شیعرەکەی بۆ خوێندەوە ئیمامی عومەر فەرمووی سووکایەتی تێدا نابینم، زیبیرقانیش وتی: بۆ قوربان ئیشی من تەنها خواردن و جللەبەر کردنە؟

ئیمامی عومەر ناردی بە شوێن حەسانی کوڕی ثابتدا؛ چونکە ئەو لە بواری شیعردا شارەزاتر بوو، حەسانیش فەرمووی ئەی ئیمام: حوطەیئە لەم شیعرەدا تەنها سووکایەتیی بە زیبیرقان نەکردووە، بەڵکوو جیقنەیشی بە سەریدا کردووە، بۆیە ئیمانی عومەر فەرمانی دەرکرد و چەند شەلاقێکیان لە حوطەیئە دا؛ چونکە زماندرێژیی کردبووە سەر ئابڕووی براکەی!

شیعرەکە لە ڕواڵەتدا ستایش و لە ناوەڕۆکدا زەم و سووکایەتیپێکردن بوو، قسەکەی تۆش: تۆ جیاوازی لە هەموو ئەو ئافرەتانەی کە من ناسیومن! کتومت ئاوایە! ڕاستت دەوێت بەم قسەیەت سووکایەتیت بە ئەو نەکردووە، بەڵکوو سووکایەتیت بە خۆت کردووە، ئاگری دڵپیسیت لە دڵیدا هەڵکردووە، هەرگیز بەراوردی مەکە بە ئافرەتانی تر، پێی مەڵی تۆ سۆز و ئەوینت زۆر زیاترە لە فڵان ئافرەت کە پێشتر ناسیومە، پێشتریش زۆر باسی ئەوەمان کرد کە پیاو نابێت بە هیچ جۆرێک باسی پەیوەندییە سۆزدارییەکانی ڕابردووی بۆ هاوژینەکەی بکات و شانازیشی پێوە بکات!



## زمانی ئاخاوتنی ئافرەتان

جارێک قسەیەکی زۆر جوانم خوێندەوە کە دەڵێت هەندێک قسە هەیە قسەی تری لە پشتەوەیە، بۆ نموونە دەڵێت:

(شۆخیم کرد)، زۆربەی ڕاستییەکانی لە پشتەوەیە.

(باش دەبێت)، زۆربەی ئازارەکانی لە پشتەوەیە.

(نا، ئاساییە)، زۆربەی دڵپیسییەکانی لە پشتەوەیە.

(من باشم)، زۆربەی هیلاکی و ماندووبوونەکانی لە پشتەوەیە.

(نازانم)، زۆربەی زانیارییەکانی لە پشتەوەیە.

(لام گرنگ نییە)، زۆربەی هەست و سۆزەکانی لە پشتەوەیە.

هەمیشە لە پشت ئەو قسەیەی کە دەیکەین قسەیەکی تر هەیە، ئەم ڕاستییە پیاوان و ئافرەتان بەبێ جیاوازی دەگرێتەوە، بەو پێیەی زمانی ئاخاوتن یەکێکە لە گرنگترین تایبەتمەندییەکانی مرۆڤ، تەنانەت هەندێک لە زانایان پێناسەی مرۆڤیان بەم شێوەیە کردووە: گیانلەبەرێکی قسەکەرە! بۆیە ئاساییە لەنێوان پیاوان و ئافرەتاندا زمانی هاوبەش هەبێت، پەیوەندییە زۆروزەوەندەکانی ڕۆژانەمان هەڵناگرێت بە کینایە لەگەڵ یەکتریدا بدوێین، بەڵکوو وشەکە بۆ چ مانایەک دانرابێت بۆ ئەو مانایەی بەکار دێنین لە ماڵەوە بێت، لە بازاڕدا بێت، لەگەڵ هاوڕێکانماندا بێت، لەسەر کار و پیشەکەماندا بێت، وشە

بۆ مانا ڕاستەقینەکەی خۆی بەکار دێنین، بەڵام زمانێک هەیە تایبەتە بە ئافرەتانەوە، مەبەستم بەم زمانە تایبەتەی ئافرەتان ئەو زاراوانەن کە تووڕەی دەدەن و مەبەستیان لێی شتێکی ترە، ئەم زاراوانە زیاتر بە کینایەی زمانی عەرەبی دەچێت، کینایە بە ڕستەیەک دەڵێن کە دوو واتای هەیە، یەکێکیان نزیک و ڕوون کە ئەمەیان مەبەست نییە، ئەویتریان دوور و شاراوە کە مەبەستەکە ئەمەیانە!

بۆ نموونە خەڵک دەڵێن: فلانە کەس دەستی دەڕوات، مەبەستیان لە دەسترۆیشتن دەستە ڕاستەقینەکەی جەستەی مرۆڤ نییە، بەڵکوو مەبەستیان ئەوەیە خاوەنی هێز و دەسەڵاتە و ئیشی لەبەر دەڕوات!

کەواتە ئەو قسانەی کە ئێمە دەیانکەین و دەیانبیستین لە پشت مانا ڕووکەشەکەیەوە مانایەکی تر هەیە و خەڵک بە ئاسانی لێی تێدەگات!

هەر بۆ نوکتە و پێکەنین، ئەهلی زانستی بەلاغە لە باسی کینایەدا دەگێڕنەوە: جارێک پیرەژنێک دەچێت بۆ لای کاربەدەستێک، ئەڵێت: قوربان مشک لە ماڵەکەماندا کەم بووەتەوە! کاربەدەستەکەش وتی: ئای کە کینایەیکی جوان و بەهێز بوو.

بە داروەدەستەکەی خۆی وت: ئەوەندەی بدەنێ با دەست لە دەرۆزەکردن هەڵبگرێت!

پیرەژنەکە بە کاربەدەستەکەی وت: هەژارم و هیچ لە ماڵەکەمدا نییە، بەڵام ڕاستەوخۆ نا، بەڵکوو کینایەی بەکار هێنا؛ چونکە مشکەکان لە ماڵێکدا دەمێننەوە کە خواردنی تێدا بێت، ئەم هێندە هەژارە تەنانەت مشکیش خۆی لە ماڵەکەیدا ڕاناگرێت!

ئەو وشە و زاراوانە کامانەن کە ئافرەتان دەیانڵێن و مەبەستان شتێکی ترە جگە لە مانا ڕووکەشەکەی؟
ئەمەش لیستی گرنگترین ئەو وشە و زاراوانەن:

۱- چی ئەکەیت بیکە!
واتاکەی: نەخەڵەتابیت بیکەیت.
ڕووکەشی ئەم ڕستەیە هەڵکردنی گڵۆپی سەوزە بۆ مێردەکەی و ئازادکردنیەتی لە هەر کارێک، بەڵام لە ڕاستیدا مەبەستی ئەوەیە پێت بڵێت: ئەو کارە نەکەیت!
زۆرجار ئافرەت ئەم ڕستەیەی سەرەوە لە دوای گفتوگۆیەکی دوورودرێژ بەکار دێنێت کە دەیەوێت بۆچوونت بگۆڕێت سەبارەت بە شتێک، بەڵام کە دواجار دەبینێت تۆ هەر نەرم نابیت و لە قسەی خۆت نایەیتە خوارەوە بێهیوا دەبێت، ئا لەو کاتەدا دەڵێت: دە باشە بچۆ چی ئەکەیت بیکە!
وریابە کاتێک کار لە کار ترازا و دواتر بۆت دەرکەوت قسەکەی ئەو ڕاستە، نەچی پێی بڵێت: خۆت ڕازی بوویت و وتت، دەباشە بچۆ چی ئەکەیت بیکە، ئیتر بۆ سەرزەنشتم ئەکەیت؟ نەخێر ئەو هەرگیز ڕازی نەبووە بەو کارە و بە توندیش ڕەتی کردووەتەوە، بەبێ ئەوەی بە خۆت بزانیت پێی وتیت: من لە دەرەوەی ئەم بابەتەم و ئەگەر ئەو کارە بکەیت، بە تەنها خۆت بەرپرسیاریتی هەڵدەگریت!
ئەڵبەت من ناڵێم ئەو کاتێک پێت دەڵێت: (بچۆ چی ئەکەیت بیکە)، ئەو ڕاستە و تۆ هەڵەیت، ناشڵێم هەر کە ئەم وشەیەت لێ بیست یەکسەر لە بڕیاری خۆت وەرە پاشگەزبەرەوە و

داواکارییەکـەی جێبەجـێ بکـە، هەمـوو مەبەسـتەکەی مـن ئەوەیـە تێبگەیـت هاوژینەکـەت بـەو ڕسـتەیە ئەیەوێـت چ پەیامێکـت ئاڕاسـتە بـکات!

لـە کۆتاییـدا دەبێـت بڕیارێـک هـەر بدرێـت، هەنگاوێـک هـەر هەڵبگیردرێـت، ڕاسـتە باشـترین بڕیـاری خێزانـی ئـەو بڕیارانـەن کـە ژنومێرد پێکـەوە هـاوڕان لـە سـەری، باشـترین هەنـگاو ئـەو هەنگاوانەن کـە پێکـەوە دەنرێـن، بـەڵام هەندیـک جـار ژیـان دەمانخاتـە سـەر دووڕێیانێـک کـە ناتوانیـن بـۆ دواوە بگەڕێینـەوە؛ بۆیـە تـۆش هەنـگاو بـەرەو پێش هەڵگرە، مـادام بڕیارەکـەی خـۆت بـە دروسـت دەزانیت، بـەڵام بیـرت بـێ (بچـۆ چـی ئەکەیـت بیکـە) ڕەتکردنـەوەی تونـدی ئـەو هەنگاوەیـە کـە بڕیـارت داوە هەڵیگـری!

**٢- هیچم نییە لەبەری بکەم:**

واتاکەی: ئەمەوێت جلوبەرگی تازە بکڕم!

بۆیـە ئەگـەر ویسـتتان پێکـەوە دەرچوونێـک بکـەن و ئەویـش وتـی هیچـم نییە بیپۆشـم، نەچیت دەرگای کەنتۆرەکـەی بـۆ بکەیتـەوە و پێی بڵێیـت: ئـەوە نییـە ئـەو هەمـووە جلوبەرگـەت هەیـە! تـۆ وا دەزانیـت هەتـا تـۆ پیشـانی نەدەیـت نازانێـت چـی و چـی هەیـە و کامـەی لـە کـوێ و کـەی لەبـەر کـردووە؟ هەرگیـز گومانـت لـەوە نەبێـت، هەمـوو ئەوانـە دەزانێـت وەک چـۆن تـۆ دەزانیـت نـاوی خـۆت بنووسـیت!

ئـەو دەیەوێـت جلوبەرگێکـی تـازە بکڕێـت، تـۆش ئەگـەر ئەتوانیـت گفتوگۆیەکـی قووڵـی لەگەڵـدا ئەنجـام بـدە بـۆ ئـەوەی قایلـی بکەیـت جلوبەرگـی زۆرە و پێویسـتی بـە جلوبەرگـی نـوێ نییـە!

خـۆ ڕەنگـە حـەق لـە لای تـۆ بێـت و هاوژینەکـەت خاوەنـی جلوبەرگێکـی زۆر بێـت، بـەڵام هەندێـک جـار بوونـی شـتی زۆر

لە یەک کاتدا ئەو هەستەمان لە لا دروست دەکات کە خاوەنی زۆر نین، من خۆم لە کڕینی کتێبدا ئەمەم بەسەر هاتووە، کە پێشانگاکانی کتێب ئەکرایەوە بەشداریم تێدا دەکرد و ڕێژەیەکی زۆر باشی کتێبیشم تێدا دەکڕین، لە هەموو پێشانگایەک ئەمە دووبارە دەبوویەوە، کاتێک بە خۆمم زانی کتێبگەڵێکی زۆرم کەڵەکە کردووە و تەنها کەمێکیشیانم خوێندووەتەوە، هەرچەندە ئەو کەمەش هەر زۆر بوو، بەڵام بەراورد بە زۆری ژمارەی کتێبەکانم کەم بوون، سەرەڕای بوونی ئەو هەمووە کتێبە کە هێشتا زۆربەیانم نەخوێندبووەوە وام هەست دەکرد کتێبم نییە بۆ خوێندنەوە و پێویستم بە کڕینی کتێبی زیاترە، کە بەئاگا هاتمەوە بڕیارم دا ئەمجارە پێشانگای کتێب کرایەوە لە سێ کتێب زیاتر نەکڕم، پێش ئەوەی پێشانگای نوێ بکرێتەوە هەرسێکیانم دەخوێندەوە، ئیتر ئەو کاتە هەستم دەکرد کتێبم هەیە بۆ خوێندنەوە!

بۆیە من ئامۆژگاریتان ئەکەم لە یەک جاردا جلوبەرگی زۆر مەکڕن، هەر ماوەیەک و کەمێک بکڕن، ئەو کاتە هەست دەکەین بە بەردەوامی جلوبەرگی نوێمان هەیە!

لە هەموو ئەمانە گرنگتر ئەوەیە کاتێک ئەو دەڵێت: جلوبەرگم نییە بیپۆشم، لەوە تێبگە ئەم حەز و داوایەی ئەو بۆ جلوبەرگی نوێ لەبەر ئەوە نییە کە جلوبەرگی نییە، بەڵکوو لەبەر ئەوەیە ئەوەی هەیەتی ماوەیەکی زۆری بە سەردا چووە و وەک جلوبەرگی کۆن تەماشایان دەکات، ئەگەرچی هی واشیان تیایە تەنها یەک جار بەکاری هێناوە! جاری وا هەیە ئێمە بڕیاری کۆنیەتی بەسەر شتێکدا ئەدەین نەک لەبەر ئەوەی زۆر بەکارمان هێناوە، بەڵکوو لەبەر ئەوەی دەمێکە هەمانە!

کاتێک پێت دەڵێت: جلوبەرگم پێویستە! زۆر چەندوچوونی لەگەڵدا مەکە و پێی بڵێ: پارەی پێویستت پێ ئەدەم بۆ کڕینی، بەڵام ڕێژەیەکی زۆر مەکڕە، هەروەک یاسای پەرستشەکان: کەم بێ و بەردەوام بێت لەوە باشترە زۆر بێ و زوو وازی لێ بهێنیت، بەو واتایەی ئەگەر باری دارییت ڕێگەی پێدایت لە ساڵێکدا چوار جار جلوبەرگ بکڕیت ئەوا هەر ماوەیەک جلێک بکڕە، بەم شێوەیە هەمیشە هەست دەکەیت خاوەنی جلوبەرگی نوێت، بەڵام ئەگەر هەموویت بە جارێک کڕی گوایە حەزی لە گۆڕانکاری و تەرپۆشییە، ئەوا هەمیشە داوای کڕینی زیاتر و زۆرتر دەکات!

٣- ژیانمان هەمووی بووە بە ڕۆتین و شتی دووبارە!

واتاکەی: ئەمەوێت لە ماڵ بچمە دەرەوە و هەوایەک بگۆڕم.

ئەو کاتێک پێت دەڵێت: ژیانمان یەک پارچە بووە بە ڕۆتین و شتی دووبارە، هەوڵ مەدە هۆکارەکەی بۆ ڕوون بکەیتەوە و پێی بڵێیت: ناچارین و دەبێت ژیان ئاوا بگوزەرێنین! ئەو باش دەزانێت ئەو جۆرە ژیانەی لەسەری دەڕۆن گۆڕینی ئەستەمە، ئەو دەزانێت هیچ چارەیەک نییە دەبێت تۆ هەموو بەیانییەک زوو بچیت بۆ سەر کارەکەت و دوای نیوەڕۆ یان جاری وا هەیە دەمەوئێوارە بگەڕێیتەوە، دەشزانێت کە هاتیتەوە دەبێت نان و خوانت بۆ ئامادە بکات و پاشانیش پشوویەک بدەیت، ئەی ئەگەر تۆ ئەمە نەکەیت بە چی بژین، خۆ لە ئاسمانەوە پارە نابارێت، هەتا ڕانەکەیت بە شوێنیدا چنگت ناکەوێت، ئەو هەموو ئەمانە باش دەزانێت و تۆمەتی کەمتەرخەمیش ناخاتە پاڵت!

دووبارە ئەوەش دەزانێت خۆیشی بێبەش نییە لە ڕۆتینی تایبەت بە خۆی، ئەوە کاری ڕۆژانەیەتی و ئەگەر خۆی پێی هەڵنەستێت کەس لەبری ئەو پێی هەڵناستێت، دەبێت هەموو ڕۆژێک نان و خوان ساز بکات، قاپەکان بشۆرێت، ناوماڵ گسک بدات، سەعی بە منداڵەکانی بکات، گرنگی بە پاکوخاوێنیان بدات، بە کورتی دەبێت شەونخونی بکێشێت لەپێناو بەختەوەرکردنی خێزانەکەیدا، هەموو ئەمانە بە بەشێک لە پەیامی خۆی دەزانێت لە ژیاندا و هیچ ڕەخنەیەکیشی لێیان نییە، ئەڵبەت من نکوڵی لەوە ناکەم کە مافی هەیە بخوێنێتەوە، بچێت بۆ بازاڕ، لەگەڵ هاوڕێکانیدا دەرچوون بکات، سەردانی خزم و کەس و کاری بکات، ئەمیش مرۆڤە خۆ کەنیزەکی سەدەکانی ناوەڕاست نییە! بەڵام من باسی ئەو کارە ڕوتینیانەم کرد کە ئافرەت ڕۆژانە لە ماڵەوە پێی هەڵدەستێت!

هەموو قسەکە ئەوەیە هاوژینەکەت لە ماڵەوە سنگی توند بووە و تووشی بێزاری بووە، ئەیەوێت بچێتە دەرەوە و شتێکی نوێ تاقی بکات کە ڕۆژانی تر پێی هەڵنەستابێت، بۆیە کە دەڵێت: ژیانمان هەمووی بووە بە ڕۆتینیات! مەبەستی ئەوە نییە دەرگای مشتومڕت لێ بکاتەوە، یان گلەیی و گازەندەت لێ بکات، یان بێزاری خۆی لە دەستی تۆ دەرببڕێت، ئەو تەنها دەیەوێت دەرچوونێک بکات و هەوایەک بگۆڕێت!

لەوە ئاسانتر نییە بڵێی: بە خوا قسەکەت ڕاستە، منیش هەست بە سنگتوندی و بێزاری دەکەم، منیش پێموایە پێویستە دەرچوونێک بکەین!

بەم شێوازە نەرم و سادەیە هەموو شتێک وەک خۆی لێ دێتەوە و ڕۆتینەکانی ڕۆژانەش هەر بەردەوام دەبن و ناشتوانین لێیان دەرباز ببین!

**٤- هیچ نییە:**

**واتاکەی: هەموو شتێکە!**

زۆرجار کە پیاو پرسیار لە ژنەکەی دەکات پێی دەڵێت ئەوە چیتە؟ ژنەکەش لە وەڵامدا دەڵێت هیچ نییە!

ئەم پرسیارەی پیاو لە ژنەکەی دوای دروستبوونی ناکۆکییەک دێت لەنێوانیاندا، دەکرێت ژنەکە داوای کڕینی شتێکی کردبێ و مێردەکەی ڕەتی کردبێتەوە، یان ژنەکە ویستبێتی لە ماڵ دەربچێت و مێردەکەی ڕێگەی پێ نەدابێت، یان ویستبێتی شتێکی ناوماڵەکەی جێگۆڕکێ پێ بکات و مێردەکەی وەڵامی ئەرێنی بۆی نەبووبێ، گرنگ ئەوەیە بارودۆخەکە ئاسایی نییە، ژنە دەروونی پڕە، حەزی لە ئەنجامدانی کارێک بووە و مێردەکەی شکستی پێ هێناوە، بۆیە زۆر قەڵس و بێزارە و ئەمەش لە ناوچاوانیدا بە ئاسانی دەخوێنرێتەوە، ئا لەم کاتەدا مێردەکەی پرسیاری لێ دەکات: ئەوە چییە؟ ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت هیچ نییە!

ئەم (هیچ نییە)یە، لەم کاتەدا یانی تۆ ئەمڕۆی منت بە تەواوی شێواند، ئەم کاتە نە کاتی قسەکردنە و نە کاتی پۆزشهێنانەوە، ئەگەر ئامادەیت ڕاکەت بگۆڕیت ئەوا منیش گوێت بۆ دەگرم، خۆ ئەگەر ئامادەش نیت بڕۆ کاتێکی تر وەرەوە!

لەم کاتانەدا واباشە لە هاوژینەکەت دوور بکەویتەوە، چونکە هەندێک کات خۆگیردان و قسەنەکردن لەسەر ناکۆکییەکان چارەسەر لە کاتی هێوربوونەوەدا ئاسانتر دەکات، لە کاتی کوڵانی ئاودا ناتوانیت وێنەی ڕووخساری خۆت لەناو ئاوەکەدا ببینیتەوە، پێویستە چاوەڕوان بیت تا ئاگرەکەی ژێری دەکوژێتەوە و ئاوەکەش سارد دەبێتەوە ئەوجا بە ئاسانی ڕووخساری خۆتی تێدا دەبینیتەوە!

ناکۆکییەکانیش هەر بەم شێوەیەن، لە گەرمەی ناکۆکییەکەدا هەوڵدان بۆ قسە و گفتوگۆ وەک ئەوە وایە هەوڵ بدەیت لە کاتی کولانی ئاوەکەدا وێنەی ڕووخساری خۆت ببینیتەوە.

لێگەڕێ با کەفوکوڵی بنیشێتەوە، بەڵام وریابە هەرگیز وا تێنەگەیت (هیچ نییە)، واتای ئەوەیە بابەتەکە کۆتایی هاتووە و پێویست ناکات سەرلەنوێ بیوروژێنیتەوە، بە پێچەوانەوە زۆر پێویستە لە کاتێکی تری گونجاودا بابەتەکەی بە هێوری لەگەڵدا بکەیتەوە، شتە بچووکەکان ئەگەر کەڵەکە بوون، دەبنە شتێکی گەورە، عەرەب دەڵێن: شاخەکان لە وردە بەرد پێکهاتووە!

ماوەیەکی کورت تێپەڕی، ڕۆژێک، شەوێک، نەکەی بهێڵیت لەو ماوەیە درێژتر بێت، خۆ بە دڵنیاییەوە تۆ بەهانەی خۆتت هەبووە بۆ بڕیارەکانت، ئەگەرنا تۆ دیکتاتۆریت و بە ئاگر و ئاسن ماڵەکەت بەڕێوە دەبەیت! بچۆ دەستی بگرە و پێی بڵێ: ڕەزامەندیی تۆم زۆر لە لا مەبەستە، ئۆقرە ناگرم کە بە دڵتەنگی ئەتبینم، هۆکاری جێبەجێنەکردنی داواکارییەکانیش لەبەر ئەم هۆکارانە بوون، یەکەیەکە هۆکارەکانی بۆ باس بکە، پێی بڵێ ئەگەر بۆم بگونجێت هەرگیز دوودڵی ناکەم لە جێبەجێکردنی ئەو شتانەی کە شادومانت دەکەن!

خۆ ئەگەر بۆ ڕێگرییەکانیشت هیچ هۆکارێکی لۆژیکی نەبووە و تەنها ویستووتە پیاوسالاری بکەیت، جارێ پێش هەموو شتێک پێویستە بە چەمکی پیاوێتیدا بچیتەوە، چونکە دیکاتۆریەت واتای پیاوێتی نییە، پاشان دەبێت بە عەقڵیەت و هەڵسوکەوتەکانتدا بچیتەوە، خۆسەلماندن چەندین ڕێگەی تری ئاسانی هەیە جگە لەو ڕێگەیەی تۆ گرتووتەتەبەر!

٥- تۆ وەک جاران منت خۆش ناوێت:

واتاکەی: گرنگی تەواوم پێ نادەیت!

سەرقاڵییەکانی ژیان هێندە زۆرن لە ژمارە نایەن، ئەمەش ڕاستییەکە بڕاوا ناکەم کەس نکۆڵی لێ بکات، ژیانی ئەمڕۆی ئێمە ژیانێکی یەکجار ئاڵۆز و پێکداچووە و هەرگیز بە ژیانی پێشینانی ئێمە ناچێ، هەرچەندە هەر سەردەمە و سەرقاڵی و پێداویستی تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام مرۆڤی ئەمڕۆ لەژێر فشارێکی زۆر گەورەدایە، پێداویستی و داخوازییەکانی ژیان وەک جاران سادە و ساکار نین، هەم ئاڵۆزن هەم تێچوویان زیاترە، فشارەکان لەسەر خەڵکی لە هیچ سەردەمێکدا بەم توندییەی ئێستا نەبووە، شتە ناپێویست و تەواوکارییەکانی ژیان بوون بە پێداویستی سەرەکی و لەمێژینە، خوێندن، وەرگرتنی چارەسەر لە نەخۆشخانە، پەیوەندی و دۆستایەتی لەگەڵ ئەوانی تردا، پێداویستییەکانی بازاڕی کار، هەموو ئەمانە لە ڕۆحمان ئەدزن و ناشتوانین لەم سەردەمەی کە تیایدا هاتووینەتە بوون هەڵبێین، بەڵام لە بەرامبەریشدا نابێت بۆ ساتێکیش ئەوەمان لە بیر بچێت کە ئێمە مرۆڤین و ڕۆحمان مافی هەیە لە سەرمان، هەروەها نابێت ئەوەشمان لە بیر بچێت کە ئەوانەشی لەگەڵماندا دەژین دووبارە مافیان هەیە لە سەرمان، بۆیە پێویستە مرۆڤ جۆرێک لە هاوسەنگی لەنێوان ئەم ژیانە مادییەی کە تیایدا دەژێت و لەنێوان ئەوەی ئێمە مرۆڤین و خاوەن هەست و نەستین و پێویستە خەڵکمان خۆش بوێت و ئەوانیش ئێمەیان خۆش بوێت، هۆگریان بین و هۆگرمان بن، گرنگیمان پێ بدەن و گرنگیان پێ بدەین، دروست بکات!

نەکەیت هەرگیز خێزانەکەت -ژن و منداڵەکانت- سەرپشک بکەیت لەنێوان دابینکردنێ پێداویستییە ماددی و پێداویستییە سۆزدارییەکاندا،

دەکرێت ئەم دووە پێکەوە کۆ بکەیتەوە، ئەو ژیانەی تەنها ڕەچاوی یەکێک لەم دوو لایەنەی تێدا دەکرێت ژیانێکە زیاتر بە باڵندەیەک دەچێت کە یەکێک لە باڵەکانی شکابێت، بۆیە هەرچەندە بە ڕۆحیش زیندوو بێت، ناتوانێت بفڕێت. بە ڕای تۆ ئەم باڵندە باڵ شکاوە ئەبێ هەست بە چ کەموکوڕییەک بکات کە ناتوانێت لە شەقەی باڵ بدات و بفڕێت، هاوژینەکەی تۆش هەمان هەستی تاڵی بۆ دروست دەبێت کاتێک کە گرنگی تەواوی پێ نادەیت!

بۆیە کاتێک پێتدەڵێت: تۆ منت خۆش ناوێت مەبەستی ئەوە نییە ئادەی هەر ئێستا پێم بڵێ خۆشم دەوێی!

خۆ لە ڕاستیدا خراپیش نییە پێی بڵێی خۆشم دەوێی، لەگەڵیشیدا دان بەوەدا بنێی کە بەهۆی کار و ئەرکەکانی سەرشانت و فشارەکانی ژیانەوە نەتتوانیوە وەک پێویست گرنگی پێ بدەیت و کەمتەرخەمیت هەبووە دەربارەی، بەڵام ئەم پێلێنانە، هەنگاوی سەرەتایە و دواهەنگاوی گەیشتن نییە!

بە خۆتدا بچۆرەوە، لەمەولا گرنگی زیاتری پێ بدە، بە تایبەتی لە سەرەتاوە؛ بۆ ئەوەی ئەو هەستی خۆبەکەمزانینەی کە دەروونی تەنیوە بڕەوێتەوە، دیارییەکی سادەی بۆ بکڕە، لە ڕۆژی دووەمدا گوڵێکی پێشکەش بکە، لە ڕۆژی سێیەمدا دەرچوونێک بکەن و لە چێشتخانەیەکدا پێکەوە نانێک بخۆن، بۆ ئەوەی بۆی ڕوون بێتەوە تۆ گرنگی پێ دەدەیت، باشترە هەر ڕۆژێک شتێکی نوێی لەگەڵدا ئەنجام بدەیت، جارێک ستایشی ئەو بۆنە بکە کە بەکاری دێنێت، جارێک لەسەر کارەکەتەوە پەیوەندییەکی تەلەفونی پێوە بکە، جارێک هەواڵی هاوڕێکانی لێ بپرسە، ڕاوێژێکی پێبکە، نوکتەیەکی بۆ بگێڕەرەوە، هەموو ئەمانە تۆ بەشتی بچووک و لاوەکی دەزانیت، بەڵام لە دڵی ئەودا گەورە و پڕ بایەخن!

٦- کات براوە ئەو کارە بکەیت ئێستا نەبێت!
واتاکەی: هەر ئێستا وازی لێ بێنە!

ئافرەت لە سەرقاڵی پیاو تێدەگات و دەتوانێت لەگەڵیشیدا هەڵ بکات، بەڵام ئەوەی لێی تێناگات و ناشتوانێت لەگەڵیدا هەڵ بکات ئەوەیە مێردەکەی لە دوای هەموو شتەکانی ترەوە گرنگی بەم بدات، واتە ئەم دوا شت بێت کە گرنگی پێ دەدات!

بۆیە کاتێک پرسیارت لێ دەکات و دەڵێت: ئەرێ باشە کات براوە ئەو کارە بکەیت ئێستا نەبێت؟ هەست بەوە دەکات کە ئەو لە کۆتایی لیستەکەدایە و ئەو کارەی دەستت داوەتێ لەم بە گرنگتری دەزانیت!

کەواتە ڕوون بوویەوە پرسیارەکەی ئەو لەو جۆرە پرسیارانە نییە کە بە بەڵێ و نەخێر وەڵام بدرێتەوە، هەر لە بنەڕەتەوە پرسیار نییە، بەڵکوو دەربڕینی بێزارییە لە بەرگی پرسیاردا، هەر کە ئەم قسەیەی دا بە گوێتدا دەیەوێت یەکسەر واز لە کارەکە بێنیت و پێی بڵێیت: ئەوا وازم لێ هێنا و هیچ شتێکیش لە تۆ بەگرنگتر نازانم، دەی بزانم تۆ چ پێشنیارێک دەکەیت با جێبەجێی بکەم!

ئەم قسەیەی تۆ لە خوارەوەی لیستەکەوە ئەیباتەوە سەری سەرەوە، ئیتر ئەمە ئەو هەستەی لە لا دروست دەکات کە سەرکەوتنی بەدەست هێناوە بەسەر هەموو ئەو شتانەدا کە سەرنجی تۆیان لەسەر ئەم لاداوە! ئەوەش بزانە عەقڵی ئافرەت کار لەسەر بەراوردکردن دەکات، ئەمەش سروشتی خۆیەتی و ناتوانێت خۆی لێ قوتار بکات، ئامانجی ئەم کتێبەش گۆڕینی سروشتی ئافرەت نییە، بەڵکوو تێگەیشتنە لێی و کارکردنە بۆ ئەوەی دەست و پەنجەیان لەگەڵدا نەرم بکەیت بۆ ئەوەی ژیانێکی پڕ لە ئۆقرەیی و ئارامی بەسەر بەرن!

ئەو بە دەست خۆی نییە بەراورد لەنێوان هەموو شتێكدا دەكات، لەنێوان ئەو كاتەی تەرخانی دەكەیت بۆ ئەنجامدانی كارێک و ئەو كاتەی تەرخانی دەكەیت بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەودا بەڕێی بكەیت! بەراورد دەكات لەنێوان پەرۆشی تۆ بۆ دەرچوون لەگەڵ هاوڕێكانتدا و پەرۆشی تۆ بۆ دەرچوون لەگەڵ ئەودا! بەراورد دەكات لەنێوان حەزی تۆ بۆ سەردانی كەسوكاری خۆت و حەزی تۆ بۆ سەردانی كەسوكاری ئەو، بەراود دەكات لەنێوان ئەو دیارییەی بۆ دایكی خۆتی دەكڕیّ و ئەو دیارییەی بۆ دایكی ئەوی دەكڕیت لە ڕۆژی دایكدا، تەنانەت كاتێک هاوڕێكەی پێی دەڵێت: مێردەكەم گرنگییەكی زۆرم پێ ئەدات، دێت ئەوەش بەراورد دەكات بە ئاستی گرنگیپێدانی تۆ بەو!

٧- قەڵەو دەرناكەوم؟

واتاكەی: پێم بڵێ جوانیت!

زۆرجار ئافرەت پێش هەموو كەس تێبینیی ئەو گۆڕانكارییانە دەكات كە لەسەر جەستەی دروست دەبن، دەزانێت زۆر قەڵەو بووە یان كەم، دەزانێت لەڕ و لاواز بووە، یەک تاڵەمووی سپی لەناو هەزاران تاڵەمووی تردا دەدۆزێتەوە، بۆیە ئەو كاتێک پرسیاری شێوازی جەستەیت لێ دەكات لە ڕاستیدا چاوەڕوانی وەڵام ناكات، ئەو خۆی وەڵامەكە باش دەزانێت، بەڵام ئەو بێزارە و دەیەوێت بەری پێ بگرێت و بە شوێن كەسێكیشدا دەگەڕێت دڵی بداتەوە!

زۆر جوانە پیاو لەوە تێبگات كە ئافرەت لەم حاڵەتەدا پێویستییەكی زۆری بە دڵنیایی و هێوركردنەوە هەیە، تەنانەت ئەگەر ئەو گۆڕانكارییەی كە دروست بووە بە دڵی تۆش نەبێت، ئەوا ئەو كاتە كاتی ئەوە نییە یەكسەر ڕاستییەكەی پێ بڵێیت، بەڵكوو

کاتی تێگەیاندن و لەئامێزگرتنیەتی، پاش ئەوە دەکرێت هەر شتێکی پێ بڵێیت، بەڵام بە شێوازێکی گونجاو و دوور لە بریندارکردن و شکاندن، ئافرەتان گرنگییەکی زۆر بە سیما و ڕووخساری خۆیان دەدەن، زۆر هەستیارن بەوەی ڕەخنە لە ڕووخسار و دیمەنیان بگیرێت!

لەسەر بابەتی قەڵەوی پێشتر قسەمان کرد و نامەوێت لێرەدا شتەکان دووبارە بکەمەوە، ورووژاندنی ئەم خاڵەش لێرەدا تەنها بۆ ئەوە بوو کە لەوە تێبگەین ئافرەت بە چ ڕێگەیەک نائومێدی و بێزاری خۆی دەردەبڕێت کاتێک دەبینێت گۆڕانکاری لە جەستەیدا دروست بووە و چۆنیش داوا دەکات لێی تێبگەین و ئامێزی بۆ بکەینەوە و دڵخۆشیی بدەینەوە!

٨- ئای کە ڕقم لێتە.

واتاکەی: هێشتا خۆشم ئەوێیت!

زۆر بە کەمی ئافرەت بە زمان هەستی ڕق و بێزاری خۆی دەردەبڕێت، بەڵکوو زیاتر بە کردەوە دەریدەبڕێت، لە حاڵەتی وادا خۆی لووتەلا و تووڕە و بێ مەیل پیشان ئەدات، بەڵام بە زمان دەریببڕێت و بڵێت ڕقم لێتە، ئەمە تەنها لە حاڵەتی زۆر دەگمەندا ڕوودەدات!

یەکێک لە کێشە لەمێژینەکانی ئافرەتان ئەوەیە لە کاتی تووڕەبووندا هەندێک قسە ئەکەن ئەو قسانە مەبەستی دڵیان نییە! ئەوان هەر ئاوا هەڵەشە و میزاجین، بە ئاسانی دڵیان دەشکێت، هەر ئەوەندەی پشتت تێکردن یەکسەر هەست بە تەنهایی دەکەن، بۆیە کاتێک دەڵێن: (ڕقم لێتە)، ئەوە بە ڕێگەیەکی پەرگیرانە پێت دەڵێت: (خۆشم دەوێت، ئاگات لێم بێت!)

ئەزانم بەڵگەهێنانەوە بۆ ئەم قسەیە ڕەنگە تۆزێک قورس بێت، بەڵام دڵنیابە ئەمە شتێکی ڕاستییە و هەمیشە دووبارە دەبێتەوە، ئەم بابەتە بە لای منەوە زیاتر بەوە دەچوێت کە پسپۆڕانی بواری پەروەردە دەربارەی منداڵانی بزێو و سەرگەرم دەیڵێن، منداڵانی بزێو کە هەمیشە شت تێکدەدەن و دەیشکێنن، زۆرجار ئەو منداڵانە شەڕانی نین بە ئەندازەی ئەوەی پشتگوێ و پەراوێز دەخرێن، هەموو ئەو لاسارییانەش کە دەیکەن بۆ ڕاکێشانی سەرنجی بەرامبەرەکەیانە، ئەوەی بە ڕێگەی ئاشتی ناتوانێت بە دەستی بێنێت، ئەیەوێت بە شەڕ بە دەستی بێنێت، ئافرەتانیش بە هەمان شێوەن، لە هەناوی هەر ئافرەتێکدا کچۆڵەیەکی بچووک هەیە هەر پیاوێک بتوانێت دەستی پێ بگەیەنێت و بیلاوێنێت، ئەوا ئەتوانێت دڵی ئافرەتەکەش وەربگرێت!

ئافرەتان هەندێک جار بە ڕێگەی ناڕوون و پێکەنیناوی هەستی تووڕەیی و بێزاری خۆیان دەردەبڕن، بەڵام پیاوی زیرەک و وریا لە زمان و ئاماژەیان باش تێدەگات!

پێغەمبەری خودا درووودی خودای لەسەر بێت جارێک بە عائیشەی فەرموو: ئەزانم کەی لێم ڕازیت و کەیش لێم تووڕەی!

وتی: چۆن دەزانیت؟

فەرمووی: کاتێک لێم ڕازیت دەڵێیت: نا بە خودای موحەمەد، کاتێکیش لێم تووڕەیت دەڵێیت: نا بە خودای ئیبراهیم!

عائیشە وتی: بە خوا وایە ئەی پێغەمبەری خودا، تەنها ناوت ناهێنم!

خودای موحەمەد و خودای ئیبراهیم هەر یەکە، بەڵام تەماشای عائیشە بکە بە چ شێوازێک تووڕەیی خۆی

دەردەبڕێـت، ئەمـە عائیشــەی ژیـر و ئیمانـدارە، بـەڵام سروشــتی وەک سروشــتی هــەر ژنێکـی تـرە، ئەگــەر تـۆ پێتوابێـت ئافـرەت پێویسـتی بـە هۆکارێکـی ڕوون هەیـە بـۆ ئـەوەی تـووڕە و بێـزار بێـت، ئـەوە بزانـە لـە ڕەوشـتی پێغەمبـەری خـوداوە دوورە کـەس تـووڕە بـکات، بـەڵام هەمـوو ماڵـەکان خاڵـی هاوبەشـیان هەیـە بـە ماڵــی پێغەمبەرانیشـــەوە!

تووڕەبوونـی ئافرەت کارەسات نییە، کاتێکیش کە بە کەمتەرخـەم ئەتـدات لـە قەڵـەم، بەڵگـەی ئـەوە نییـە کـە خۆشـی ناوێـت، ئـەو کاتانـەش کـە هەڵسـوکەوت و مامەڵـەی لەگەڵتـدا توند دەبێت، تەنها بـۆ سەرنجڕاکێشـان و وریاکردنـەوەی تۆیـە، سـوێندەکەی عائیشـە: (نـا، بـە خـودای ئیبراهیـم) بـۆ ئـەوە بـوو بـە پێغەمبـەری خـودا بڵـێ مـن تـووڕەم!

خۆ لـە دڵـەوە هـەر پەیوەست بوو بە پێغەمبـەرەوە، خۆشەویستی هـەر وەک جاران بوو، تەنها ئـەوە بوو نـاوی نەئەهێنا، ئیتر ئەویش ئافرەتـە و سروشـت و خـووی تایبـەت بـە خۆیـی هەیـە، مامەڵـە کردن لەگـەڵ ئـەم سروشـت و خـووە بەشـەریانەدا پێویسـتی بـە ڕۆحێکـی وەرزشـی هەیـە لـە جۆری: هاوژینی ئازیـز، سروشـتت ئەزانـم و لێت تێدەگـەم، پێویسـت بـە ناکۆکـی و ململانـێ نـاکات و کۆتایـی پـێ بێنـە!

ئەو قسەیەی وەرمەگرە کە دەڵێت: ڕقم لێتە.

واتاکەی وەربگرە: هێشتا خۆشم ئەوێیت.

ئـەوکات ئەویـش دەڵێـت: ئـەوەی منـی بێـزار کـردووە فـڵان هەڵوێسـتی تۆیـە، ئـەم هەڵوێسـتەت بگـۆڕە، شـێوازی مامەڵـەت ڕێـک بکـەرەوە، لێـم تێبگـە، بـۆ ئـەوەی بـە شـێوازە جـوان و شـیرینەکە بڵێـم خۆشـم ئەوێـی، نـەک بـە ڕێگـە پەرگیـر و توندەکـە!

**٩- باش دەبوو ئەگەر...**

**واتاکەی: زۆر نایابە ئەو کارە بکەیت.**

زۆرجار ئافرەتان خۆیان لەوە دەپارێزن فەرمانی ڕاستەخۆ بەسەر مێردەکانیاندا بکەن، ئەوان بوونەوەرێکی وریا و زیرەکن، تێدەگەن پیاو فەرمان و ناچارکردنی پێ خۆش نییە، پاشان ئەو هەر بە سروشتی خۆی حەزی لە خۆسەپاندن و سەرۆکاریکردن نییە، بەڵکوو هەمیشە پێی خۆشە لە پەنای پیاوەوە بێت، بەلام نەک هەست بە پاشکۆیەتی بکات، وەک چۆن پێی خۆش نییە گەورە و دەسەلاتدار بێت، پێشی خۆش نییە کەنیزەک و خزمەتکار بێت، ئەو کاتێک دەڵێت: زۆر باش بوو ئەگەر ئەو کارەت بکردایە، ئەوە پێت دەڵێت: تکات لێ دەکەم ئەو کارە بکە! بەلام بە زیرەکییەکی زۆرەوە، ئەو ئەیەوێت تۆ وا هەست نەکەیت کە ئەو بڕیاری خۆی دەسەپێنێت بە سەرتدا، ئەو دەیەوێت تۆ وا هەست بکەیت کە ئەو بیرۆکەیە بیرۆکەی خۆتە، بڕیارەکە بڕیاری خۆتە، چاوت لێیە تا چ ئەندازەیەک ڕەچاوی بارودۆخی تۆ دەکات؟

بۆیە کاتێک لێی دەبیستیت: (زۆر باش بوو ئەگەر ئەو کارەت بکردایە)، پەرۆشی خۆت بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە پیشان بدە، پێی بڵێ: ئەمە بیرۆکەیەکی جوانە! ئەو بە زۆری نایەت پێشنیاری شتی قەبە و چارەنووسساز بکات، نموونەی ئەم پێشنیارانە ناخاتە بەردەستت:

- ئەم خانووەمان بفرۆشتایە باش بوو.
- سەیارەیەکی نوێمان دەستخستایە باش بوو.
- پیشەکەت بگۆڕیایە باش بوو.
- وازت لە هاوڕێکانت بهێنایە باش بوو.
- دەستت لە هاوکاریکردنی کەسوکارەکەت هەڵبگرتایە باش بوو.

ئافرەتـان بـە هیـچ شـێوەیەک داوای ئـەم شـتە ئاڵـۆز و قورسـانە ناکەن، بەڵکوو داوای شتگەلێک دەکەن کە یەکجار سـادە و سـاکارن، بۆ نموونـە دەڵێـن:

- کەمێک لە مووچەکەمان پاشەکەوت بکردایە باش بوو.
- ڕەنگی بۆیاخی خانووەکەمان بگۆڕیایە باش بوو.
- یارمەتییەکی منت بدایە و سەعیت بە منداڵەکان بکردایە باش بوو.
- جلەکانت بخستایەتە ناو کانتۆرەکەوە باش بوو.
- لە پشووەکەدا دەرچوونێکمان بکردایە باش بوو.

وەک تێبینیـت کـرد، هەمـوو ئەمانـە شـتی سـادە و سـاکارن و جێبەجێکردنیـان گەلێـک ئاسـانە و تێچـووی زۆریشـیان ناوێـت!

۱۰- پێنج خولەک!

واتاکەی: سەیری کاتژمێرەکەت نەکەیت!

تێبینیی ئـەوە کراوە ئێمـە هـەم بە پیاوان و هـەم بە ئافرەتانـەوە بـە شێوەیەکی ورد و دروست ئەندازەی ئـەو کاتـە ناڵێین کە پێویستمانە، بـۆ نموونـە هاوڕێکانـت لـە قاوەخانەیەکدا دانیشـتوون و پەیوەندیـت پێوە دەکەن بزانن گەیشتوویتە کوێ؟ تـۆش یەکسـەر دەڵێیت: یـەک خولەکی تر لـە لاتانم، مەبەستی تۆ لێرەدا ئـەو یـەک خولەکە نییە کە لـە شەست چرکە پێک هاتووە، بەڵکوو مەبەستت ئەوەیە شوێنەکەم نزیکـە لێتانـەوە و خەریکـە ئەگەمـە لاتـان! لـە بیرمـە کاتێـک منـداڵ بووین و لـە قوتابخانە دەگەڕاینـەوە زۆرمـان برسـی بـوو، کە خۆمان دەکـرد بـە ماڵـەوەدا یەکسـەر داوای خواردنمـان دەکـرد، دایکیشـمان دەیوت: پەلـە مەکەن تەنها دوو خولەکی مـاوە، مەبەستیان ئـەوە بـوو خواردنـە خەریکـە پێئـەگات، ئیتـر دوو خولەکەکـەش درێـژ دەبوویـەوە تـا دەگەشتە دە خولـەک و زیاتریش!

تێبینییەکی تر ئەوەیە: پیاوان زیاتر هەست بە کات دەکەن تا ئافرەتان، ئەوەی بە لای ئافرەتانەوە گرنگە تەواوکردنی کارەکەیە، نەک چەندی کات پێویست بووە بۆ تەواوبوون، بۆیە بە ڕای من بە درێژایی مێژوو هەرگیز ئافرەت وەک پیاو گوێی بە کات نەداوە، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە پیاوان زیاتر لە ئافرەتان پەیوەندیان بە جیهانی دەرەوە هەبووە و هەیە!

کابانی ماڵ کارەکانی لە کاتژمێر هەشتی بەیانیەوە دەست پێ ناکات، بەڵکوو کات لە بەردەستیدا کراوەیە، هەر کاتێکی بوێت دەتوانێت کارەکانی خۆی تێدا ئەنجام بدات، بەڵام ئێمە پێویستە پەیوەست بین بە کاتی دەوامەوە!

کابانی ماڵ کاتی تەواوبوونی کاری نییە، هەتا پێشبڕکێ لەگەڵ کاتدا بکات، ئەوە ئێمەین پێش جێهێشتنی شوێنی کارەکەمان دەبێت فلان کار و فیسار کارمان تەواو کردبێت!

کابانی ماڵ نازانێت ئەگەر ئێمە لە کاتی دیاریکراودا پڕۆژەکە ڕادەست نەکەین، تووشی چ سزایەکی گەورەی دارایی دەبین، چونکە کات لە لای ئەوان کراوەیە!

ئەمە ئەو ڕاستیەیە کە ئێمە لێی بێئاگاین، کات ئەوەندەی کۆنترۆڵی جیهانی ئێمەی پیاوان دەکات، ئەوەندە کۆنترۆڵی جیهانی ئەوانی ئافرتان ناکات، نابینیت کاتێک پێکەوە دەمانەوێت دەرچوونێک بکەین، یان بچین بە دەم بانگهێشنامەیەکەوە، ئەوان درەنگ ساز و ئامادە دەبن؟ ئەمەش شتێکی بێزارکەرە بۆ ئێمە.

بۆیە کاتێک پێت دەڵێت: پێنج خولەک و خۆم ئامادە دەکەم، نەکەی وەک داوەری تۆپی پێ لە خولەکی کۆتاییدا و بەبێ ئەوەی گوێ بدەیتە ئەنجامی یارییەکە فیکەی کۆتایی لێبدەیت! ئافرەت گرنگ نییە بە لایەوە ماوەی یارییەکە چەند درێژ

دەبێتەوە، ئەو ئەنجامی دەوێت! بۆیە دڵنیابە ئەگەر چووە ژوورەوە و خۆی ئامادە کرد و جلی چوونەدەرەوەی لەبەر کرد، پاشان پێی جوان نەبوو، بەبێ دوودڵی دایدەکەنێت و جلێکی تر لەبەر دەکاتەوە، تۆ و پێنج خولەکەکەش بۆ دۆزەخ، وەک چۆن بیانییەکان لەو فیلمانەی ئێمە دەیانبینین و دۆبلاج کراون وادەڵێن!

بێگومان ئەو بێخەم نییە لەو چاوەڕوانی و تووڕەیییەی تۆ، بەڵام لە هەموو شت گرنگتر بە لای ئەوەوە ئەوەیە لەوپەڕی جوانی و کەشخەییدا ببینرێت، بۆیە هەوڵ مەدە پێشبڕکێی پێ بکەیت لەگەڵ کاتدا، هەوڵ بدە ڕێگاچارەیەکی تر بدۆزیتەوە بۆ ئەوەی لەو سەرئێشەیە ڕزگار بیت، بۆ نموونە ئەگەر پێویست بوو کاتژمێر حەوتونیو دەربچن پێی بڵێ سەعات حەوت دەردەچین، دڵنیابە هەرچۆن بکات کاتژمێر حەوت ئامادە نابێت، بەڵام ڕەنگە حەوت و چارەک ئامادە بێت، ئەمەش بۆ تۆ کاتێکی تەواو لەبارە!



## له ئەو سۆز و میهرەبانی...
## له تۆش ئارامی و ئاسوودەیی

کاتێک باسی سۆز و میهرەبانی دەکەین، دەبێت قسەکەی (ئێوریه دی بلزاک)ـی بەناوبانگمان بیر بێتەوە کە دەڵێت: جوانی خۆشەویستی دەورووژێنێت و سۆز و میهرەبانی دەپارێزێ!

خوای گەورە ئافرەتی بە ناسک و میهرەبان و پیاویشی بە بەهێز و تۆکمە دروست کردووە، ئەمەش بە ڕێکەوت و لەخۆڕا نەبووە، بەڵکوو ئامانجێکی گرنکی لە پشتەوە بووە، ئەویش ئەوەیە هەریەکەیان تەواوکەری ئەوی تریان بێت، ڕەنگە بڵێیت ئەم ناسک و ئەو بەهێز چۆن دەبنە تەواوکەری یەکتری؟

گوێ بگرە با وەڵامت بدەمەوە:

پەیوەندیی ژن و پیاو بە یەکترییەوە بە تەرازوویەک دەچوێت کە تایەکی پیاو بێت و تاکەی تریشی ئافرەت. بۆ ئەوەی تەرزاووەکە بە دروستی کاری خۆی بکات پێویستە تاکانی یەکسان بن، یان لانی کەم نزیک بن لە یەکەوە، ئێمە ئەگەر تەماشای خوو و سیفەتەکانی ئافرەت بکەین بە بەراورد بە خوو و سیفەتەکانی پیاو، دەبینین جیاوازییەکی زۆر لە نێوانیاندا هەیە، بەڵام ئەم جیاوازیانە هەرگیز دژایەتی و ناکۆکیان لە نێوان ژن و پیاودا دروست نەکردووە بە ئەندازەی ئەوەی بوونەتە هۆی تەواوکردنی یەکتری!

ئافرەت لاوازی و ناسکییەکەی بەرەو لای هێزی پیاو ڕایدەکێشێت بۆ ئەوەی ئارامی و ئاسوودەیی بە دەست بهێنێت

پیاویش هێز و پێزەکەی بەرەو لای ناسکی و نەرمی ئافرەت ڕایدەکێشێت بۆ ئەوەی سۆز و میهرەبانی لێ وەربگرێت.

گومان لەوەدا نییە سۆز و میهرەبانی خوویەکی لەبنەهاتووی ئافرەتانە، بەڵکوو دەتوانین بڵێین چەکی بەهێزی دەستیشیانە، ئافرەت دایکە بە پلەی یەکەم، ئەم هەستی دایکایەتیە تەنانەت پێش ئەوەی منداڵیشی ببێت تیایدا گەشە دەکات، هەستی دایکایەتی لە ناخیدا ڕەگی داکوتاوە، تەنانەت دەتوانین بڵێین: ئەمە سەرچاوەی هەموو هەست و سۆزەکانی تریەتی، ئافرەت مامەڵە لەگەڵ هەر کەسێکدا بکات، ئیتر خوشکی بێت، باوکی بێت، تەنانەت مێردیشی بێت، ئەو بە هەستی دایکایەتییەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکات.

من بڕوام وایە لێرەوە، لەم کانیاوی دایکایەتیەوە کە لە دڵی ئافرەتدا هەڵدەقوڵێ سۆز و میهرەبانی بە هەموو جیهاندا پەخش دەبێت!

سۆز و میهرەبانی ئافرەت وەک هەستی دایکایەتیەکەی شتێکی خۆڕسک و خواکردە، شتە خۆڕسکەکانیش لە خۆیانەوە دێن و مرۆڤ پێویستی بە فێربوونیان نییە، بۆیە کاتێک ئافرەتێکی توندو ڕەق دەبینیت، ئەوە بزانە شتێک ڕوویداوە، وێرانکارییەک لەناو دڵیدا بەرپا کراوە و هەموو سۆز و هەستە ناسکەکانی لێ بردووە، لە بەرامبەردا پیاوان بە سروشتی خۆیان زبرن و حەزیان بە پیشاندانی هێز و بازووی خۆیان هەیە، تەنانەت ئەمە لەناو مێردمناڵەکانیشدا بەدی دەکەیت، هەر ئەوەندەی توانیان دەست و قاچیان بەکار بهێنن، ئیتر لە دژی هاوڕێ و نەیارەکانیان بەکاری دێنن. بڕوا ناکەم مێردمناڵ هەبێت تەمەنی گەشتبێتە دە ساڵ و شانازی بەوەوە نەکردبێت کە لە فلانە هاوڕێیی داوە، یان شەڕی لەگەڵ فلانە هاوڕێیدا کردووە سەرکەوتووە بە سەریدا.

کە گەورەش دەبن شتەکان زۆر ناگۆڕێن، ئەو بەردەوام دایکایەتی خۆی پیادە دەکات بەسەر هەموو لایەکدا هەر وەک چۆن بە منداڵی لەگەڵ بووکەڵە و پشیلەکانی ناو کۆڵان پیادەی دەکرد، تۆش هاوشێوەی منداڵیت ژیان وەک مەیدانی جەنگ دەبینیت و هاوڕێ و برادەرەکانیشت وەک نەیار، با دەست و قاچیش لە ململانێکاندا بەکار نەهێنیت...

لەناو ئەم جەنگ و ئاڵۆزیانەی ژیانەوە دەگەڕێیتەوە بۆ ماڵەوە، ئەویش بەهەشتێکت بۆ دەخولقێنێ، سۆزی خۆیت بە سەردا دەڕێژێت، برینەکانت بۆ ساڕێژ دەکات، تەپوتۆزی ئەم جیهانە بێبەزەییە بە ناوچاوانتەوە دەسڕێت، یارمەتیت ئەدات بۆ ئەوەی ئامادە بیت بۆ جەنگی سبەینێ... هەموو ئەمانەت بۆ دەکات بەبێ ئەوەی هەست بە ماندووبوون بکات؛ چونکە تۆ ئارامی تەواوت بۆ دابین کردووە و کەشێکی وات بۆ ڕەخساندووە دەتوانێت بە ئاسانی سروشتی خۆی تێدا پیادە بکات!

بەڵام دەبێت ئەوە بزانیت سۆز و میهرەبانی ئافرەت هەرگیز گەشە ناکات و گەورە نابێت ئەگەر پیاو ئارامی و ئاسوودەیی بۆ دابین نەکات، بۆیە کاتێک دڵڕەقی، یان لووتەلایی لێ بەدی دەکەیت ئەوە بزانە ئەو ئارامی و ئاسوودەیی و متمانەیەی کە لە پەنای تۆدا هەیبووە لە دەستی داوە، بۆیە خۆی بە ناچار دەزانێت بۆ پارێزگاریکردن لە خۆی دەست لەو سروشتەی خۆی هەڵبگرێت کە خاڵی لاوازی بووە و لە ڕێیەوە تووشی ئازار بووە، چونکە ئەو قەڵغانەی کە جاران خۆی پێ دەپاراست ئێستا لە دەستی داوە!

کاتێک دەبینێت زمانت زبرە، دەستەکانت بێبەزەیین، ڕووت گرژە، دڵت توندە، ئیتر پەنا بۆ خۆی ئەباتەوە و قەڵای پۆڵایین لە دژت بنیات دەنێت... هیچ شتێک هێندەی ئەوە ناخۆش نییە پێچەوانەی سروشتی خۆت هەڵسوکەوت بکەیت!

ئارامی هەر ئەوە نییە لەگەڵتدا بێت و هەست بە مەترسی دەرەکی نەکات، بەڵکوو ئەوەیە لە خۆشت نەترسێت، لە پەنای تۆوە هەست بە ئاسوودەیی و متمانە بکات، چونکە بەبێ متمانە ئاسوودەیی و ئارامی نایەتە کایەوە!

لەمبارەوە چیرۆکێکی سەردەمی نەفامیتان بۆ دەگێڕمەوە لەنێوان فاکیهی کوڕی موغیرە و هیندی کچی عوتبەی هاوژینیدا ڕوویدا:

فاکیهـ یەکێک بوو لە گەنجانی قوڕەیش و کەسێکی زۆر خانەدان بوو، میوان بەبێ پرس خۆی ئەکرد بەماڵەکەیدا، نیوەڕۆیەک پێکەوە لەگەڵ هیندی ژنیدا خەوتبوون، پاشان فاکیهـ بۆ ئیشێکی خۆی هەستا چووە دەرەوە و هیندی ژنی لە ماڵەوە بە خەوتوویی بەجێ هێشت، میوانێک خۆی کرد بە ماڵیاندا کە بینی هیند خەوتووە بەپەلە هاتە دەرەوە، فاکیهیش لەولاوە کە گەڕایەوە ئەم کەسەی بینی بەپەلە لە ماڵەکەی هاتە دەرەوە، بۆیە یەکسەر خۆی گەیاندە لای هیند و خەبەری کردەوە.

وتی: ئەوە کێ بوو ئێستا لە لات هاتە دەرەوە؟

وتی: بە خوا ئاگام لە هیچ نییە و کەسیشم نەدیوە!

وتی: هەستە بچۆرەوە بۆ ماڵی باوکت.

ئەم هەواڵە بەناو خەڵکدا بڵاو بوویەوە و کەوتە سەر زاری هەموو خەڵک.

باوکی پێی وت: کچم! وەرە ڕاستییەکەم پێ بڵێ، ئەگەر ئەم کابرایە ڕاست دەکات، ئەوا کەسێکی بۆ دەنێرم بە نهێنی بیکوژێت و ئیتر ئەم قاڵە ئەبڕێتەوە، ئەگەر درۆیش دەکات، ئەوا ڕاپێچی لای جادووگەرەکانی یەمەنی دەکەم بۆ ئەوەی ئەوان پاکی تۆ ئاشکرا بکەن.

هیند وتی: بە خوا باوکە گیان درۆ ئەکات!

باوکی هیند ناردی بەدوای فاکیهدا و پێی وت: تۆ تۆمەتێکی گەورەت داوەتە پاڵ کچەکەم، یان ئەوەیە دەبێت تۆمەتەکە بسەلمێنیت، یان دەبێت بچین بۆ لای جادووگەرەکانی یەمەن بۆ ئەوەی ئەوان ئەم بابەتە یەکلایی بکەنەوە!

وتی: باشە ڕازیم با بچین بۆ لای جادووگەرەکانی یەمەن! فاکیهـ بە خۆی و کۆمەڵێک لە پیاوانی قورەیش و ژنانی مەخزومیەوە هاتن، عوتبەش لەگەڵ کۆمەڵێک لە پیاوان و ئافرەتانی بنی عبدالمنافدا هاتن، کە نزیکی شاری جادووگەرەکان بوونەوە، هیند ڕووخساری گۆڕا و ترس و دڵەڕاوکێیەکی زۆری لێ نیشت، باوکی کە ئەمەی بینی پێی وت: کچم! کە ئەتزانی ئاوایە با هەر لە سەرەتاوە نەهاتینایە و قاڵمان بڵاو نەبوایەتەوە. وتی: بە خوا باوکە گیان هیچ شتێکی خراپ لە خۆمدا شک نابەم، بەڵام ئێمە دەچین بۆ لای کەسانێک دەکرێ هەڵە بکەن و دەکرێ ڕاستیش بکەن، ئەترسم ئەم تۆمەتەم بە سەردا ساغ بکەنەوە و بۆ هەتا هەتایە عەرەب بیگێڕنەوە. وتی: کچم سەرەتا تاقییان دەکەمەوە، ئەسپەکەی وەستاند و دەنکە گەنمێکی خستە ناو چووکی ئەسپەکەیەوە و بەستی، کە چوونە لای جادووگەرەکە زۆر ڕێزی لێ گرتن و حەیوانێکیشی بۆ سەربڕین.

عوتبە پێی وت بۆ کارێک هاتووین بۆ لات و شتێکیشمان بۆ شاردوویەتەوە، بزانم ئەزانیت ئەو شتە چییە؟

وتی: بەرهەمێکە لەناو تاقێکدایە.

وتی: ڕوونتر قسە بکە.

وتی دەنکە گەنمێکە لەناو چووکی ئەسپێکدا.

وتی: ڕاست دەکەیت، ئادەی ئێستا قسەیەکمان دەربارەی ئەم ئافرەتانە بۆ بکە، یەکە یەکە دەستی دەهێنا بە سەریاندا و پێی دەوتن بڕۆ بە دەم کاری خۆتەوە، تا سەرەکە گەیشتە سەر هیند و پێی وت: هەستە تۆ لەو ئافرەتانە نیت داوێنپیسی بکەی! دەبێتە دایکی پادشایەک ناوی موعاویەیە، کە هاتنە دەرەوە فاکیهـ دەستی هیندی گرت، بەڵام ئەو زۆر بە توندی گەڕاندییەوە و وتی سوێند بە خوا نابێ ئەو پادشایە لە تۆ بێت، دواتر ئەبوسوفیان مارەی کرد و موعاوییە هاتە دنیاوە.

لەم چیرۆکەی فاکیهـ و هینددا تەنها بێمتمانەیی نییە و بەس، بەڵکوو نامەردیش هەیە، چونکە فاکیهـ وەک ڕووداوێکی ڕاستەقینە مامەڵەی لەگەڵ ئەم گومانە نابەجێیەدا کرد، لە کاتێکدا مەردی و جوامێری وا دەخوازێت مرۆڤ لەسەر بنەمای گومان ئەگەرچی گومانەکەش لە جێی خۆیدا بێ! شکۆ و ناموسی خۆی لەکەدار نەکات و نەیخاتە ژێر پرسیارەوە!

ئەم چیرۆکە ئەگەرچی لە سەردەمی نەفامی و پێش هاتنی ئیسلامدا ڕوویداوە، بەڵام ئەم جۆرە هەڵسوکەوتانە بەردەوام دووبارە دەبێتەوە، بەڵکوو خەڵکانێک هەن لە فاکیهـ خراپتر نامووسی خۆیان دەشکێنن و پەردەی نهێنییەکانی خۆیان هەڵدەماڵن و دەستبەرداری هەموو پیاوەتی و مەردایەتییەکی خۆیان دەبن، تەنها لەبەر گومانێکی بێبنەما، لە کاتێکدا خوای گەورە فەرمانمان پێ ئەکات خۆمان لەم جۆرە گومانانە بە دوور بگرین و دەفەرموێت (إن بعض الظن إثم) واتە: هەندێک لە گومانەکان گوناه و تاوانن.

کەس ناڵێت گومانەکانی خۆت بە یەکجاری بسڕەوە! بەڵام وەک گومان مامەڵەی لەگەڵدا بکە، نەک وەک ڕووداوێک کە بە چاوی خۆت دیبێتت.

ئارامی لە ژیانی هاوسەرگیریدا ئەوەیە هەر یەکەیان دڵ و ڕۆح و عەیبەکانی یەکتری بپارێزن، هەمیشە ئەوەت لە بەرچاو بێت تۆ هاوسەرگیریت لەگەڵ مرۆڤدا کردووە، نەک فریشتە، کەسیش چاوەڕوانی فریشەیی لە تۆ ناکات، بەڵام خاڵی گرنگ و پێویست ئەوەیە ئێمە ڕەوشتبەرزانە مامەڵە لەگەڵ یەکتریدا بکەین!



## ژن چیت پێ دەڵێ؟

ئـەم کتێبـە تەنیـا بـۆ پیاوانـە! بـەڵام بـە چـواردەوی ژنانـدا ئەخولێتـەوە، دونیـای شـاراوەی ژنـان، شـێوازی بیرکردنەوەیـان، چۆنیەتـی ڕووبەڕووبوونەوەیـان لەگـەڵ پێشـهاتەکان، زمانـی تایبەتـی خۆیـان، ئـەو وشـانەی کـە پێیـان خۆشـە لـە پیاوانـەوە بیبیسـتن!

ئـەم کتێبـە ئـەو کۆسـپ و کڵۆ و کلۆسمانە لادەبا کە وای کردووە ژنـان لـە بـەر چاوی پیاواندا جۆرە دروستکراوێکی تایبەتـی بن!

ئەزانـم خـۆت ئـەم قسـانەت بـۆ ڕوون بووەتـەوە و لەوانەیـە بڵێـی: جـا چ پێویسـت ئـەکا ئـەم قسـانە لـە دوادوایـی کتێبەکـەدا دووبـارە بکەیتـەوە؟

لـە ڕاسـتیدا مـن بـەو جـۆرە باسـی ژنانـت بـۆ ئەکـەم کـە خوێندوومەتـەوە، یـان بیسـتوومە، یـان بینیومـە، یـان لێکۆڵینـەوەم لـە بـارەوە کردووە، یـان خوێندوومـە! بـەڵام لـە پڕێکدا بیرۆکەیەکـم بـە مێشـکدا هـات وابزانـم باسـکردنی بێسـوود نەبێ، بۆیـە بڕیـارم دا باسـی بکـەم، لـە دڵـی خۆمـدا وتـم:

باشـە بـۆ مـن باسـی ژنـان بکـەم، ئـەی بـۆ خۆیـان باسـی خۆیـان نەکـەن؟

باشـە بـۆ مـن لەبـری ژنـان هـاوار بکـەم! ئـەی بـۆ خۆیـان دەنـگ بـەرز ناکەنـەوە و هـاوار ناکـەن؟

سەرەتا ویستم بە شێوەیەک کتێبەکە بنووسم کە ڕوونکردنەوەیەکی وا بێت، ژنان وەڵامی بدەنەوە، بەڵام دوایی وازم لەوە هێنا، چونکە ئەزانم ئەگەر وابێ کتێبەکە زیاتر بە ڕێچکەیەکدا ئەڕوا وەک ئەمڕۆ پێی ئەڵێن (ئاکادیمی) ئەبێ، بڕوام وایە تۆش پێویستت بەم جۆرە شتانە نەبێ، دوای ئەوەی ماوەیەکی زۆر بیرم کردەوە بڕیارم دا سوود لەو وانانەی پێشکەشم کردون وەربگرم، دوای ئەوەی وانەکەم وتەوە و کاتی پرسیار و وەڵام دەستی پێ کرد لێیان پرسیم:

بەرهەمی داهاتووت چی ئەبێ؟

منیش یەکسەر وەڵامم داویەوە و وتم: کتێبێک بە ناوی (تەنها بۆ پیاوان)، دوایی باسی بیرۆکە و چۆنیەتی نووسینی کتێبەکەم بۆ کردن، دوای ئەوە بڕیارم دا هەموو قوتابییەکی کچ پەڕێکی سپی پێ بدەم، لاپەڕەی سپیم دا بە قوتابییە کچەکان، پێموتن: هەر کچە و چ وشەیەکی پێخۆشە لە پیاوانی ببیستێ بۆم بنووسێ!

ئەو کارەم بە مەبەستی ئەوە کرد زیاتر هانیان بدەم، داوای ئەوەشم لێکردن کە هیچ کەسێکیان ناوی خۆی لەسەر ڕووپەڕەکە نەنووسێت، با نەزانم کام قسەیە هی کام قوتابییەیە!

وتم: تەنیا یەک دێرم بۆ بنووسن! پەیمانم پێدان و وتم: لێرە تەماشای لاپەڕەکان ناکەم، ئەیانبەمەوە لە ماڵ ئەیانخوێنمەوە!

جارێکی تریش هەمان کارم دووبارە کردەوە، ڕستەکان ئەوەندە زۆر بوون کە بەشی ئەوەیان ئەکرد لەم کتێبەدا ڕۆڵێکی گرنگ ببینن!

ئەو ڕستانەی ئەوان نووسییان ئەبنە سەردێڕ و منیش ڕاڤەیان ئەکەم، بیر و بۆچوونی خۆم دەرئەبڕم، کەواتە گوێی خۆت واڵا بکە بۆ بیستنی ئەو وشانەی ژنانی پێ خۆشحاڵ ئەبێ، بۆ ئەو ڕستانەی کە ژنان پێیان خۆشە پیاوان بیزانن!

### ١. کاتێک قسەت لەگەڵدا ئەکەم، تەماشام بکە!

ژنان بڕوایان وایە، منیش پشتگیرییان لێ ئەکەم و بڕواکەیان تەواوە بەڵێ! بڕوایان وایە کاتێک کە قسە لەگەڵ پیاودا ئەکەن، ئەگەر پیاوەکە ڕاستەوخۆ لە کاتی قسەکردندا تەماشای ژنەکە نەکا، ئەوا قسەکەی بەهەند وەرناگرێ، یان لەوانەیە هەر خودی ژنەکەی بە لاوە گرنگ نەبێ!

ژن پێی خۆشە کاتێک قسەت لەگەڵدا دەکات هەموو گیانت بکەی بە گوێ و جوان گوێبیستی قسەکانی بی، جاری وا هەیە تۆ ئەوەندە مێشکت زیرەکە، ئەتوانی بە مۆبایلەکەت خەریکی نامەنووسین بی و لەولاشەوە گوێ لە ژنەکەت بگری، بەڵام باش ئەوە بزانە تەماشاکردنی ژنەکەت لەو کاتەی کە قسەت بۆ ئەکا پەیوەندی بە ئەوەوە هەیە نەک بە تۆ! ئەو نایەوێ تۆ لەبەر ئەوە سەیری بکەی نەکا وشەیەکی ئەو بە باشی گوێبیست نەبی، ئەو هەر ئەیەوێ تۆ لای ئەو بی، من پێموایە ئەوە داواکارییەکی گەورە نەبێ، من و تۆش پێمان خۆشە کاتێ قسە بۆ کەسێک ئەکەین و بە دڵ و گیان ئاگای لە قسەکانمان بێت و بە چاویش سەیرمان بکا، خۆ ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان تۆ قسە بۆ ژنەکەت بکەیت و ئەویش لا نەکاتەوە بە لای تۆدا و خەریکی لانکی مناڵەکەتان بێ، یان تەماشای مۆبایلەکەی بکا، تۆش هەمان هەستی ئەوت بۆ دروست ئەبێ و وا ئەزانی ئەو هیچ گرنگیەکت پێ نادا!

ئەمە هەستێکە تایبەت نییە بە نێوان ژن و مێردەوە، بەڵکوو لەنێوان هەموو دوو کەسێکدا کە بە یەکەوە قسە ئەکەن ئەم هەستە دروست ئەبێ، تۆ پێت خۆشە ڕۆژێک لە فەرمانگە بڕۆی

بۆ لای بەڕێوەبەر و قسەی دڵی خۆتی بۆ بکەی و ئەویش خەریکی لێکدانەوەی فایل بێ، یان خۆی خەریک بکا بە کارێکی ترەوە؟

بێگومان پێت خۆش نییە و ئەگەر شتێکی وا ڕووبدات دڵت گەرد ئەگرێ و ئەو بەڕێوەبەرەت لە بەرچاو ئەکەوێ!

بۆچی لێی قەڵس ئەبی؟ بۆچی دڵت بەرامبەر بەڕێوەبەرەکەت ئەگۆڕێ؟ با من وەڵامت بدەمەوە:

قسەکردن ئەوەندەی پەیوەندی بە نێوان دوو دڵەوە هەیە ئەوەندە پەیوەندی بە نێوان زمان و گوێچکەوە نییە!

جا ئەگەر ئەمە هەستی تۆ بێت بەرامبەر بەڕێوەبەرێک کە لەوانەیە حەفتەی جارێک نەیبینی ئەی ئەبێ هەستی ژنەکەت چۆن بێ بەرامبەر بە تۆ کە زۆربەی کات پێکەوەن و لەسەر یەک سیستەم ئەخەون و لە تەنیشت یەکترن؟

**٢. پێم خۆشە غیرەم لێ بکەی، بەڵام مەیگەیەنە ڕادەی شێتبوون!**

پەندێک هەیە ئەڵێ: غیرەی کەم خۆشەویستی هەڵئەگیرسێنێ، غیرەی زۆر ئەیسووتێنێ!

غیرەکردن هەم بۆ پیاوان جوانە و هەم بۆ ژنان، بەڵام جیاوازی زۆرە لەنێوان غیرەیەک لە عەقڵ و ئاوەزەوە سەرچاوە بگرێ لەگەڵ غیرەیەکدا لە شێتییەوە سەرچاوەی گرتبێ!

ئەگەر پیاو غیرەی ئەوەی هەبوو کە نابێ ژنەکەی خۆشەویستەکەی خۆی لەت بکات و بەشێکی بە یەکێکی تر بدا، یان نابێ هیچ کەسێکی تر بکاتە هاوبەشی ئەم، ئەوە ئەو غیرەیەیە سەرچاوەکەی ژیرییە! بەڵام ئەو غیرەیەی کە وابکا لە پیاو داوا بکا لە ژنەکەی هەموو ڕۆژێ بیسەلمێنێ کە خۆشەویستی

خۆی لەت نەکردووە، یان بیسەلمێنێ کە ژنێکی پاکداوێنە، یان بیسەلمێنێ کە لە دەرەوە دڵی شتێکی نەکردووە، ئەوە ئەو غیرەیە ڕەگی شێتییە!

ژن کاتێ هەست ئەکا پیاوەکەی کەمێ غیرەی لێ ئەکا دڵخۆش ئەبێ، ئەوەی بۆ دەرئەکەوێ کە هیچ شتێک کاریگەری لەسەر پیاوەکەی بەجێ نەهێشتووە و هەمیشە ئەوی خۆش ئەوێ، ژن پێی ناخۆش نییە کە پیاوەکەی لە بازاڕدا دەستی بخاتە سەر لاکەلەکەی بۆ ئەوەی بەر پیاوێکی تر نەکەوێ! بە پێچەوانەوە تەواو هەست بە بەختەوەری ئەکا.

هەرگیز پێی ناخۆش نییە کاتێ هاوکارێکی فەرمانگەکەی تەلەفۆنی بۆ ئەکا لێی بپرسێ: ئەوە کێ بوو؟ کاری چی بوو؟

با باسی ئەو غیرەیەش بکەین کە لە شێتییەوە سەرچاوەی گرتووە، شکسپیر ئەڵێ: غیرە وەک گیاندارێکی کێوییە کە جووتێ چاوی سەوزی هەبێ، باش بزانن کە خۆشەویستی نابێتە بەهانەیەک بۆ خراپ جووڵانەوە بەرامبەر خۆشەویستەکەت! ئەو غیرەیەی کە ژنان ئەخاتە نێو قەفەسەوە ئەوە خراپەکارییە نەک غیرە! یەکەمجار خراپەیە بەرامبەر خۆت، کەواتە تۆ بڕوات بە خۆت نییە، بڕوات بە پەیوەندی نێوان خۆت و ژنەکەت نییە، خراپەیە بەرامبەر ژنەکەشت، کەواتە تۆ بڕوات وایە کە ژنەکەت زۆر بە ئاسانی حەیا و شەرەفی خۆی ئەبا.

ئێمە کە لەسەر ئەم زەوییە ئەژین هیچمان بێکەسوکار نین، هەموومان خزم و کەسوکارمان هەیە، دۆست و برادەرمان هەیە، ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان ژنەکەت چاکی و چۆنی لەگەڵ کوڕە مامەکەی خۆیدا کرد مەیکە بە هەرا، ئەگەر تەلەفۆنی بۆ کوڕە پوورەکەی کرد و هەواڵی پرسی، مەیکە بە هەرا.

٣- من بەهێزم، بەڵام پێویستم بە تۆیە!

ئافرەت هەرچەندە بەهێز بێت دیسان ئاتاجی پیاوە، هەرچەند خوێنەوار بێ، زیرەک بێ، رۆشنبیر بێ، سەرکردەش بێ، دیسان پیاوی پێویستە، پیاویش وەک ئافرەتە، هەموو دونیا هی تاکە پیاوێک بێ، ئەگەر ژنی نەبوو خۆشی لەو ماڵەی خۆی نابینێ، ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ کە خوای گەورە لەسەر نەخشەیەک مرۆڤی دروست کردووە کە گۆڕانکاری بەسەردا نایەت، ئەگەر ژنێک بە ئەندازەی قارون دەوڵەمەند بێت، ئەو هەمووە سەروەت و سامانە ناتوانن غەریزەی دایکایەتی لەو ژنەدا بشواتەوە، هەرچەندە دەوڵەمەند بێ دیسان پێی خۆشە ببێ بە دایک! بە هەمان شێوە، ئەگەر سەروەت و سامانی قارون هی یەک پیاو بێ، ئەو پیاوە حەزی لەوەیە کە ببێ بە باوک! کەواتە سەروەت و سامان شتێکە مرۆڤ بە هەوڵ و کۆشش پەیدای ئەکا، بەڵام حەزی باوکایەتی و دایکایەتی حەزێکە خوا لە دڵی مرۆڤی داناوە!

حەزی پیاو بۆ ژن و حەزی ژنیش بۆ پیاو شتێکە خوا نووسیویەتی و دایناوە، بە هیچ هێزێک و بە هیچ شتێک ئەو حەزە لە دڵی مرۆڤ دەرناچێ، کەوابوو ئەو حەزەی خوا نووسیویەتی زاڵە بەسەر ویستی مرۆڤدا، هەرچەند مرۆڤ خۆی وا دەربخا کە پێویستی بە هاوسەر نییە، بەڵام ئەوە درۆی لەگەڵ ناخی خۆیدا کردووە، ئەو حەزەش کە مرۆڤ بۆ بەرامبەرەکەی خۆی هەیەتی، مانای کەمایەتی و پوختەنەبوونی مرۆڤ نییە!

ژن خۆی دەتوانێ دەرگای سەیارەکە لا بدات و سەرکەوێ، بەڵام کاتێ پیاوەکەی دەرگاکەی بۆ لادەدا ئەوە ئەوپەڕی چێژی پێ ئەبەخشێ، ئەوە شابەیتی شیعرەکەیە!

ژن ئەتوانێ خۆی نەک لقێ، بەڵکوو چەپکێ گوڵ بکڕێ و بۆنی بکا، بەڵام کاتێ پیاوەکەی لقێک گوڵی بۆ ئەکڕێ وا ئەزانێ دونیا هەرهەمووی هی ئەوە!

هەموو سەروەت و سامانی دونیا هی ژنێک بێت دیسان چاوی لەوەیە کە پیاوەکەی لە بۆنەیەکی تایبەتی ئەودا دیارییەکی بۆ بکڕێ، ئیتر ئەو دیارییە هەرچەند بچووکیش بێت، بە لای ئەوەوە هەر گەورەیە!

ژن پێویستی بە تۆیە، نەک لەبەر ئەوەی لاوازە، یان هەژارە، یان پیویستی بە دیارییەکی تۆیە، یان برسییە، نەخێر لەبەر ئەوانە نییە، بەڵکوو پێویستی بە کەسایەتی تۆیە! بەبێ تۆ خۆی بە تەنیا دێتە بەرچاو!

ئەو ئەمن و ئەمانەی لە پەنا تۆدان هەستی پێ ئەکات، بە هەزار پاسەوانی زیرەک و زیتەڵ دروست نابێ!

٤. لەبەرچاوی خەڵکدا ڕەخنەم لێمەگرە!

عەرەب ئەڵێ: ڕەخنەی بەرچاوی بۆ ڕووخاندنە!

هەر کارێکی جوان کە ببێتە هۆی لەناوبردنی ڕێزی مرۆڤێک، نەکردنەکەی جوانترە! هەر لەبەر ئەوەیە خوای گەورە دەفەرموێ: خێر و سەدەقەی خۆتان بەهۆی منەتی نان و ئازادانی دڵی هەژاران پووچ مەکەنەوە!

کاتێک تۆ هاوکاریی هەژارێک ئەکەی، ئەوە چاکە و خێرێکی گەورەیە، خوای گەورە بۆت دەنووسێ و لە قیامەتدا پاداشتت دەداتەوە، بەڵام ئەگەر دوای ئەوەی دەستگرۆیی هەژارێکت کرد، داتەوە بە ناوچاویدا و منەتت کرد بە سەریدا ئەوا خێر و پاداشتەکەت پووچ ئەبێتەوە و لەبری ئەوەی پاداشت وەربگری تۆڵەت لێ وەردەگیرێ!

قسەی چاک و پاکیش سەدەقە و خێر و خێراتە، جا ئەگەر لە کاتی خۆیدا و لە شوێنی خۆیدا بوو، ئەوە پاداشتی لەسەر وەرئەگریتەوە، بەڵام ئەگەر قسە خێرەکە لە بەرچاوی خەڵک و بە مەبەستی شکاندنەوە بوو، ئەوا لەبری پاداشت، تۆڵەت لێ دەسەنرێتەوە!

باشە ئێمە ئامۆژگارییەکمان بۆ چییە کە بە بەرچاوی خەڵکەوە بێت و کابرا وابزانێ شێتێک، یان گەمژەیەک ئامۆژگاری دەکات؟

خۆ هەر ئەو ئامۆژگارییە ئەگەر لە شوێنێکی دوور لە بەرچاوی خەڵکدا بێ، ئەوا زۆرمان پێویست پێیەتی!

ژنانیش وەک پیاوان کەرامەت و ڕێزیان هەیە، ئەوان شتێکی زیاتریشیان لە پیاوان هەیە کە بریتییە لە هەستێکی ناسک! کەوایە دەبێ چەندە خاتری پیاوان ئەگیرێت، لەوە زیاتر خاتری ژنان ڕەچاو بکرێ!

ژنیش وەک پیاو هەڵە ئەکا، چی ژن و چی پیاو پێویستمان بە تەمێ و ئامۆژگارییە، بەڵام بە نهێنی، ئەگەر ئامۆژگاری ژنەکەت دەکەی، با دوو بە دوو بن، ئەو کاتە ئاگری خۆشەویستی بەرئەدەیتە گیانی و ناشیسووتێنی! نەتبیستووە کورد ئەڵێ: دووبەدوو های دووبەدوو ئاگر لە گیانم بەربوو!

بۆ ئەبێ پیاو و ژنماڵەکەی خۆیان وەک دەشتێکی پان و بەرین بێ و هەموو کەسێ بە هەموو شتێکیان بزانێ؟ ئەی ئیتر سوودی هاوسەری و کۆبوونەوە لە ماڵێکدا لە کوێدایە؟

ئەگەر کارێکی ژنەکەت بە دڵ نەبوو ئاساییە، خۆ ماڵێکتان هەیە بە یەکەوە کۆ ببنەوە و پێی بڵێی، خۆ ژوورەکەتان تایبەتە بە خۆتان، لەوێ دووبەدوو پێکەوەن، ئا لەوێدا پێی بڵێ!

خوای گەورە بە پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی خۆی دەفەرموێ: (وَلَوْ كُنْتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانْفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ) یانی: خۆ ئەگەر تووڕە و قسەڕەق و بێبەزەیی بوویتایە، ئەوە هەموو لە دەورت بڵاوەیان دەکرد.

**٥. ڕەفتار جوان و گوفتار جوان بە!**

ئایینی ئیسلام مۆڵەتی بە مسوڵمانان داوە لە سێ کاتدا درۆ بکەن:

أ بەرامبەر دوژمن.

ب بۆ ئاشتکردنەوە.

ج لەنێوان ژنومێرددا.

کەی ماقوڵە مسوڵمانێک ببێتە، دیلی کافران و ئەوانیش پرسیاری سوپای مسوڵمانانی لێبکەن و ئەویش وردودرشتی سوپای مسوڵمانانیان وەک خۆی بۆ بگێڕێتەوەو بڵێ: نابێ درۆ بکەم، چونکە درۆ حەرامە. ئەمەیان بەشی یەکەم!

لەبارەی ئاشتکردنەوەیشەوە، نموونەیەکت بۆ ئەهێنمەوە: کاوە و کامەران دوو برادەری گیانیبەگیانین، بەڵام ئێستا لێک زیز بوون و بە یەکەوە قسە ناکەن، تۆش ئەتەوێ ئاشتیان بکەیتەوە، دەڕۆی بۆ لای کاوە و ئەڵێی: بەڕێز کاوە! کامەران زۆری پێ خۆشە لەگەڵتدا ئاشت بێتەوە، ئەو زۆر ڕێزی تۆی لایە، زۆری پێناخۆشە چەند ڕۆژێکە بەیەکەوە قسە ناکەن.

دواییش دەڕۆی بۆ لای کامەران و دەڵێی: بەڕێز کامەران...

هەمان ئەو قسانەی لای کاوە کردت بە کامەرانیشی ئەڵێی، دڵی هەردوو لا نەرم دەکەی بۆ ئەوەی ئاشت ببنەوە، هەرچەند قسەکانی تۆ ڕاست نەبوون و کاوە و کامەران ئەو قسانەیان نەکردووە،

بەڵام لەبەر ئەوەی تۆ دەتەوێ تۆ دوو دۆست ئاشت بکەیتەوە، خوای گەورە ئەو قسانەت بە درۆ بۆ تۆمار ناکات، لەجیاتی ئەوەی تۆڵەت لێبکاتەوە، کەچی پاداشتی چاکەت ئەداتەوە، چونکە تۆ نیەتی چاکە و خێرت بووە. ئەمەش دووەم، ماوە سێیەم، کە بریتییە لە درۆی نێوان ژنومێرد و باسەکەی ئێمە ئەمەیانە:

نە ئایین و نەژیری و لۆژیک داوای ئەوەمان لێناکەن کە ئێمە کەسێکی درۆزن بین، مرۆڤ ئەبێ ڕاستگۆ بێ، بەڵام لە چەند کاتێکدا درۆ حەڵاڵ کراوە بۆ ئەوەی زنجیرەی ژیان نەپچڕێ و ژیان بەردەوام بێ، ژنومێرد ئەبێ وشیار و زیرەک و چاوکراوە بن، هەموو ڕاستییەک لە هەموو کاتێکدا نابێ بوترێ، با بۆ زێدە تێگەشتن ڕووداوێکی ڕاستەقینەت بۆ باس بکەم:

جارێک پیاوێک هاتە خزمەت پێشەوا و گەورەی مسوڵمانان حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب، پێیوت:

گەورەم! ئەمەوێ ژنەکەم تەڵاق بدەم!

حەزرەتی عومەر فەرمووی:

- بۆچی؟

بە خودا سوێندم دا و وتم پرسیارێکت لێ دەکەم، ڕاست وەڵامم بدەرەوە، پێموت: تۆ منت خۆش ئەوێ؟ وتی: سوێندت داوم ڕاستییەکەی بڵێم، نەوەڵڵا خۆشم ناوێی!

پێشەوا عومەر ناردی بە شوێن ژنەکەدا و لەوێ ئامادە بوو، فەرمووی:

- تۆ بە مێردەکەت وتووە: خۆشم ناوێی؟

ژنەکە وتی:

- بەڵێ! قوربان، ئەو سوێندی دام کە ڕاستییەکەی بڵێم و منیش ڕاستییەکەییم وت! ئەکرا درۆ بکەم؟

- بەڵێ! با درۆت بکردایە.

ئەم درۆیە درۆیەکی جوانە، درۆیەکە پەیوەندی نێوان خێزان پتەوتر دەکا، ئەگەر لە جێی ئەو درۆیە ڕاستی دابنرێ پەیوەندیی نێوان خێزان هەڵدەوەشێتەوە!

پێویستە ئێمە لەم جۆرە درۆیانە بزانین و لە کاتی خۆیدا بیانکەین، با پیاو بە ژنەکەی بڵێ: تۆ جوانترین ژنی دونیای!

خۆ قسەکە درۆیە، تۆش لە بەردەم دادوەردا ئەو شایەتییە نادەی! لە دادگا ئەو قسەیەت نەکردووە، ئەویش ناڕوا قورئانێک بێنێ و بڵێ: ئادەی دەست بخە سەر ئەو قورئانە و بڵێ: بە ڕاستم بووا ئەمە شێوازێکی گوفتار جوانییە، با ڕاستیش نەبێ، بەڵام جوانە و پەیوەندی خێزانی پێ توندوتۆڵ دەبێ، کام ژنە زۆر جوانە لەو جوانتر هەیە، کام پیاوەش زۆر جوانە دیسان پیاوێک هەیە لەو جوانتر بێت، ئەگەر تۆ بە ژنەکەت بڵێی: جوانترین ژنی دونیای! ئەو دێ بڵێ: وەڵڵا وا نییە فلان ئافرەت لە من جوانترە؟ بێگومان شتی وا ڕوونادا، ئەگەر ژنێک بە پیاوەکەی بڵێ: جوانترین پیاوی دونیا تۆی! پیاوەکە ئەڵێ: ئەی کە نەتزانی، وەڵڵا فلان پیاو لە من جوانترە؟

خۆ ئەگەر بە ژنەکەت بڵێی: خۆشترین خواردن ئەو خواردنەیە کە تۆ دروستی ئەکەی! ئەمە تاوان نییە، ناچێتە خانەی درۆوە، هەرچەند وا نییە، بەڵام دیسان پێی ناوترێ درۆ، ئەگەر جگە لە وشەی درۆ، ناوێکی تر بۆ غەیری ڕاستی هەبووایە و وەک وشەی درۆ ناشیرین نەبووایە، ئەوا ئەم جۆرە درۆیانە شایانی ئەو ناوە بوون. هەموو ژن و پیاوێک ئەزانن ئەو پیاهەڵدانەی بەرامبەرەکەی لە سەدا سەد وەک خۆی نییە، بەڵام دڵیان پێی خۆشە و پەیوەندیی نێوانیان بەهێز دەکات.

### ٦. دەستپێشخەری بکە!

دەستپێشخەری شتێکە کە ژنان دڵیان پێی خۆشە، ژن پێی خۆشە پێش ئەوەی بیەوێ داوای شتێک بکا، پیاوەکەی پێی بڵێ: فلان شتت ناوێ؟ ئەو کاتە وا هەست ئەکا کە پیاوەکەی گرنگی پێ ئەدا، بۆ نموونە: ژن پێی خۆشە جارجار لە ماڵەوە هیچ خواردنێک دروست نەکات و لەگەڵ مێردەکەیدا بچنە دەرەوە بۆ نانخواردن، پێش ئەوەی ئەو پێتبڵێ تۆ بەو بڵێ: ئەرێ ژنەکە بۆ ئەم ئێوارەیە لە دەرەوە نان نەخۆین؟

هەموو کەس پێی خۆشە بەرانبەرەکەی لێی تێبگا و ئەو شتەی کە دڵخوازیەتی پێش ئەوەی داوای بکا بەرامبەرەکەی بۆی بکا!

جیاوازی زۆرە لەنێوان ئەوەی کە ژنەکەت پێت بڵێ: با بچینە دەرەوە نان بخۆین، لەگەڵ ئەوەی تۆ لە پێشدا بەو بڵێی.

### ٧. ئەترسم ئافرەتێکی تر تۆ لە من داگیر بکات!

مرۆڤ لە هەموو سەروبەندێکدا پێویستی بە ئەمان هەیە، هەر شارێک جەنگ و شەڕی تیا بەرپابوو، ئێمە تیایدا دانانیشین و لێی رائەکەین، خۆمان لە هەموو مرۆڤێکی تووڕە و تاڵ ئەپارێزین، چونکە نازانین کەی دەتەقنەوە. ئەمان لەنێوان ژن ومێرددا زیاتر لە بوونی ئەمان لە هەر شوێنێکی تر پێویستە، ژیانی ئەو ژنومێردەی ئەمانیان نییە وەک ڕۆشتنە بەناو دەشتێکدا کە پڕ بێت لە مین و تەقەمەنی، هاکا لوغمێک تەقییەوە و ژیانی کۆتایی پێ هێنا، ڕێکردن لە دەشتێکی ئاوادا پڕە لە مەترسی!

زۆرێک لە پیاوان بە گاڵتەوە هەمیشە بە ژنەکانیان ئەڵێن: ئەمڕۆ بێ یا سبەی ژنی دووەم دەخوازم!

ئەم قسەیە هەرچەند بۆ خۆشی و گاڵتەش بێ، بەلاَم ژنان پێیان ناخۆشە و بە هەندی وەرئەگرن، بڕوایان وایە پیاوەکەیان شتێکی لە مێشکایە و بە ناوی گاڵتە و شۆخییەوە دەریدەبڕێ، وەک کورد ئەڵێ: سوعبەت نیوەی ڕاستە!

کەوابوو هەرگیز ژنەکەت دڕدۆنگ مەکە، ئاگر لە دڵیدا هەڵمەگیرسێنە! سەرەنجام گڕ و بڵێسەی ئەو ئاگرە خۆت دەسووتێنێ! ژیانت لێ تاڵ ئەبێ، سیخوڕیت بە سەرەوە دەکات.

٨. من ژنی تۆم، خۆ کەنیزەک و خزمەتکارت نیم!

لەوەتای دونیا دونیایە ژنان بە دەگمەن و زۆر بە کەمی بۆ کار چوونەتە دەرەوە، داب و دەستوور وابووە ژن لە ماڵەوە کار بکات و گرنگی بە کاروباری ماڵەوە بدا، پیاویش لە دەرەوە کار بکات و بژێوی بۆ ماڵ و منداڵەکانی پەیدا بکا، بەلاَم وەک دەزانی لەم سەردەمەی ئێستاماندا دەور و چەرخی زەمانە گۆڕاوە و زۆرێک لە ژنانیش لە دەرەوە و بگرە لە بازاڕیشدا کار ئەکەن! جا هەرچۆنێک بێت، لە ماڵەوە بێت، یان تەنیا لە دەرەوە، یان کاری ماڵ و دەرەوەش بکا، ئەوا بە هیچ شێوەیەک پێی خۆش نییە وەک کرێکارێک، یان خزمەتکارێک، یان کەنیزەکێک چاوی لێ بکرێ! خۆ ژنان هەرچەندێ ماندو بن و کاروباریان زۆر بێ، دیسان خۆیان بە کەنیزەک و خزمەتکار نازانن، بەڵکوو ئەوە هەڵسوکەوتی پیاوە لەگەڵ ژنەکەیدا وای لێ دەکا خۆی بە خزمەتکار و کەنیزەک بزانێ! پیاوی وا هەیە ئەوەندە لەگەڵ ژنەکەیدا باشە و بە جۆرێک مامەڵەی لەگەڵدا ئەکا، ئەو ژنە بەیانی تا ئێوارە هەر خەریکی گسکلێدان و شۆردن و کاری ترە، کەچی خۆی بە گەورەی هەموو ئافرەتانیش ئەزانێ! ژنی واش هەیە خۆی وەک ئامێرێکی ناوماڵ دێتە بەرچاو! وەک کەوانتەرێک، یان بەفرگرێک، یان... چونکە پیاوەکەی نازانێ باش مامەڵەی لەگەڵدا بکات.

کەوابوو وەک وتمان کارکردن ئافرەت وا لێناکا کە خۆی بە خزمەتکار و کەنیزەک بزانێ، بەڵکوو شێوەی هەڵسوکەوتی پیاو ئەو هەستە لای ژن دروست ئەکا! هەرکاتێ ژن خۆی بە ئامێر، یان کەنیزەک و خزمەتکار زانی ئەگەر پیاوەکەیشی خزمەتکارێکی بۆ بەکرێ بگرێ، دیسان ئەو هەر خۆی بە خزمەتکار ئەزانێ! کەوابوو تەنیا مامەڵەی ژیرانەی پیاوە ئەو هەستە نامۆیە دەرەوێنێتەوە! ئەبێ پیاو جۆرێک ڕەفتار بکا، کە ژن هەستی ئەوەی لا دروست ببێ کە پیاوەکەی خۆشی ئەوێ!

ژن بۆ ئەوەی خۆی بە هاوسەر و هاوژین و خاوەن ماڵ بزانێ، نەک بە کۆیلە و خزمەتکار، لە ناخەوە ئەم شتانەی لە پیاو ئەوێ:

پێم خۆشە لەپڕ و لەناکاو کارێکم بۆ بکەی و خۆم ئاگام لێی نەبێ!

لە هەموو شتێ خۆش ئەبم، بەڵام لە درۆ نا!

بە باشی گوێم بۆ بگرە!

قسەیەکی خۆشم بۆ بکە!

جار جار بەبێ هیچ هۆکارێک لە ئامێزم بگرە!

لە کاروباری ماڵدا یارمەتیم بدە!

گورجوگۆڵ بە! ناوماڵ شپرز مەکە!

پێم خۆشە کەمێک غیرەم لێ بکەی!

جارجار بەبێ هۆکار خەمگین ئەبم، هەموو کاتێک وانەزانی هۆکارێکی هەیە!

هەرچەندە بە زاریش نەیڵێم، بەڵام هەموو کارەکانتم لەبەر چاوە!

هەرگیز من مەچوێنە بە دایکت، چونکە ئەو کاتە وا هەست ئەکەم هێشتا مناڵی!

من تۆ بە هیچ کەسێک ناچوێنم، تۆش بۆ من وابە!
پیاوێکی ترم ناوێ، ئەمەوێ تۆ ببی بە پیاوێکی ترا!
ئەو کاتەی دڵسۆزی وا هەست ئەکەم کە بەهێزی، بەڵام هەرکاتێ تووڕە و تاڵ بووی وا هەست ئەکەم زۆر لاوازی!
لەبەر تۆ زۆر شت ئەکەم، کە خۆم پێمخۆش نییە، تۆش لەبەر من هەندێ شت بکە، هەرچەندە پێت خۆشیش نەبێ!
کەس وەک تۆ خۆشبەختم ناکا!
ئەو بزەیەی تۆ دەیخەیتە سەر لێوم لە هەموو بزەیەک جیاوازترە، ئەو خەمەش تۆ پێم دەدەی لە هەموو خەمێک جیاوازترە!
من تەنیا هی تۆم، تۆش تەنیا بۆ من بە!
هەرکاتێک لێم دەدەی ئازارم نادەی، بەڵکوو ئەمشکێنی!



## له خوا بەزیاد بێت له بیری دەچێ!

بە دڵنیاییەوە تۆش هاوڕای منی و پێتوایە کە لە بیرچوونەوە یەکێکە لە نیعمەتەکانی خوای گەورە، تۆ بێنە بەر چاوی خۆت ئەگەر لەبیرچوونەوە نەبووایە چی ڕووی دەدا؟

ئەگەر مێشکی مرۆڤ هیچ شتێکی لە بیر نەچووایەتەوە و بەردەوام لیستی هەموو شتەکانی تیا بمایەتەوە چی ڕووی دەدا؟

ئەوکات ئەگەر خراپەیەکت بەرامبەر بکرایە، هەرگیز لە بیرت نەدەچووەوە!

لەوانەیە کەسێک پێی وانەبێ لەبیرچوونەوە نیعمەتە! بەڵام با کەمێک خۆڕاگر بێ تا پێی بسەلمێنین نیعمەتە!

بەرەو دوا ئاوڕ ئەدەینەوە و ئەچینە نێو یەکێک لە باخچە و پارکەکانی ئەندەلووسی ئەو سەردەمانەی کە لەژێر حوکمی ئیسلامدا بوو، ئەچین بۆ لای موعتەمیدی کوڕی عەبباد و شاعیرە تایبەتەکەی کە ناوی ئیبنوعەممار بوو، ئەم دووانە جارێک لە باخچەیەکی سەر ڕووبارەکەی نێو شاری ئیشبیلییە پیاسەیان ئەکرد، موعتەمید لەناکاو نیو بەیت شیعری بۆ هات و وتی: (صنع الريح من الماء زرد)، واتە (شنەی با ئاوی وەک زرێ چنی)، چاوەڕێ بوو ئیبنوعەممار نیوەکەی تر تەواو بکات، ببێ بە بەیتە شیعرێک، بەڵام مێشک و بیر و هۆشی ئیبنو عەممار بەگوێیان نەکرد و هەرچی خۆی بادا نەیتوانی نیو بەیت شیعر

بڵێ، ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوو، بیری دەکردەوە، بەڵام هیچ! لە نزیک ئەوانەوە ژنێک لە گوێی ڕووبارەکەدا جلوبەرگی دەشۆرد، گوێی لەم دووانە بوو، زانیی کە ئیبنوعەممار دەمی بووە بە تەڵەی تەقیو هیچی بۆ ناوترێ، شاعیرەکانی ئەمڕۆ وتەنی: ژانی لەتەشیعرێک نایگرێ، بۆیە خۆی پێ نەگیرا و هاتە وەڵام و وتی: (أي درع لقتال لو جمد)، واتە (گەر بیبەستایە چ زرێیەک بوو؟) موعتەمید گوێقوڵاخ بوو بزانێ ئەوە کێیە ئەو شیعرەی تەواو کردووە، تەماشا ئەکا ژنێکە، لە جوانیدا لەوێنەی نییە! هەم بە جوانییەکەی و هەم بە زیرەکییەکەی تەواو سەرسام بوو، هەواڵی پرسی، وتیان: ناوی ئیعتیمادە و کەنیزەکی (ڕەمیکی کوڕی حەججاجە)، موعتەمید ڕۆشت بۆ لای ڕەمیک و ئیعتیمادی لێ کڕی، دوایی ئازادی کرد و مارەشی کرد و بووە خۆشەویستترین ژنی، با ئەوەش بزانین کە موعتەمید ناوی (ئەلموئەییەد بیللا) بوو، بەڵام دوای ئەوەی ئیعتیمادی مارە کرد، لە خۆشەویستیی بۆ ئیعتیماد ناوی خۆیی گۆڕی و کردی بە (ئەلموعتەمید بیللا)، بۆ ئەوەی ناوی ئیعتیماد تێکەڵی ناوەکەی خۆی بکا!

موعتەمید پارە و پوولێکی زۆری بۆ دڵخۆشبوونی ئیعتیماد خەرج ئەکرد، تەنانەت دەگێڕنەوە جارێک ئیعتیماد دەیویست بڕواتە دەرەوە، بەڵام ڕێگاوبان قوڕ و چڵپاو بوو، موعتەمید فەرمانی دەرکرد کە میسکی وشک بێنن و بیهاڕن، دوایی بیبێژن، پاشان بە عەتر و گوڵاو بیشێلن و بیکەن بە قوڕ بۆ ئەوەی ئیعتیماد خۆی و کەنیزەکانی بە سەریدا تێپەڕن، بۆ ئەوەی قاچیان قوڕاوی نەبێ، بەڵکوو میسکاوی و عەتراوی بێت!

دوای ماوەیەک گرژی و ئاڵۆزییەک کەوتە نێوان ئیعتیماد و موعتەمید، ئیعتیماد تووڕە بوو بە موعتەمیدی وت: بە خوا لە ژیانمدا چاکەم لە تۆ نەدیوە.

موعتەمید وتی: ڕۆژی قوڕاو و چڵپاوەکەش؟

ئعتیماد شەرم دایگرت و داوای لێبووردنی لێ کردا!

ئێستا گەیشتینە ئەو خاڵەی کە مەبەستمە! لەبیرچوونەوە! ژنان شتیان لە بیر دەچێتەوە! بەڵام هەموو شتێک نا! بەڵکوو شتە باشەکان!

لەوانەیە ئەگەر ژنەکەت چاکەکانی تۆی لە بیر چوویەوە وابزانی کە ڕێزت ناگرێ، مافی خۆتە کە بەو جۆرە بیر بکەیتەوە، بەڵام ئەگەر بە سەرپێیی نا، بەڵکوو بە وردی بیر بکەینەوە بۆمان ڕوون ئەبێتەوە کە خراپەکان و ناخۆشییەکانیشی لە بیر کردووە، با بزانین چۆن؟

ژن هەرجارێک تووڕە دەبێ چاکەیەکی پیاو لە بیر دەکات، لە بەرامبەریشدا کاتێک پیاو خۆشەویستیی خۆی بۆ ژن دەردەبڕێ خراپەیەکی پیاوەکەی لە بیر دەکا! جا ئەگەر تۆش دادگەر بیت، ئەوا یەک بە یەک، کەسمان لە کەس.



## (هاوژینەکانتان کێڵگەن بۆ ئێوە!)

هۆکاری پشت ئەم بنەمایە ئەم ڕاستییەی لای خوارەوەیە:

زۆربەی کێشەکانی ناوماڵ لە ژووری نوستنەوە دەست پێ دەکات! ئەزانم قسەکردن دەربارەی پەیوەندییە سێکسییەکان بابەتێکی هەستیارە، بەڵام ناکرێت بە بیانووی هەستیاریبوونیەوە قسەی لێ نەکەین، بە پێچەوانەوە هەستیاری بابەتەکە پەلکێشمان ئەکات بۆ ئەوەی تیشک بخەینە سەری، ئەگەر باسکردنی کارێکی ناباش بووایە ئەوا خوای گەورە لە قورئاندا و پێغەمبەریش لە فەرموودەکانیدا باسیان نەدەکرد.

ئیسلام ئایینێکی ناوەنجی و نێوەندگیرە، لەپاڵ ڕۆحدا گرنگی بە جەستەش دەدات، بانگمان دەکات بۆ بەهەشت بەبێ ئەوەی ژیانی دنیاش فەرامۆش بکات، حەز و ئارەزووەکانی مرۆڤ خەفە ناکات و دژایەتییان بکات، ڕێگری لە ژیانی ڕەبەنی و دوورەپەرێزی لە ژنهێنان دەکات، لە بەرامبەردا ڕێگە بە زینا و داوێنپیسیش نادات، ئیسلام دەیەوێت مرۆڤەکان حەزە سێکسییەکانیان تێر بکەن، بەڵام لە ڕێگەی حەڵاڵەوە. بۆیە ئەگەر تۆزێک سەرنج بدەیت ئەبینیت ئیسلام لەگەڵ بابەتی سێکسدا لۆژیکانە مامەڵە دەکات، نە هێندە گەورەی دەکات کە هەموو ژیانی تێدا کۆ بکاتەوە وەک چۆن فرۆید وای کردووە، نە فەرامۆشیشی کردووە وەک ئەوەی هیچ

پەیوەندییەکی بە ژیانەوە نەبێت، وەک قەشە و کەشیشەکانی ناو کڵێساکانی ڕۆما.

لەبەر ئەوەی ئەم بابەتە هەستاریی تێدایە وەک وتمان، بابەتە هەستیارەکانیش یاسا و ڕێسای توندیان پێویستە، بۆیە بە ڕای من قسەکردن لەسەر ئەم بابەتە، سێ مەرجی زۆر گرنگی پێویستە:

١- نابێت زمانی هەڵماڵراوی دوور لە شەرم و شکۆی تێدا بەکار بێت و بەرامبەر بورووژێنێت، بەڵکوو دەبێت هاوشێوەی قورئان عەقڵ بدوێنێت نەک ئارەزوو، خوای گەورە کاتێک باسی چیرۆکی یوسف و زولەیخامان بۆ دەکات، دەفەرموێت (وراودته التي هو في بيتها عن نفسه) واتە: ئەو ئافرەتەی یوسف لەماڵەکەیدا بوو هەوڵی دا یوسف لە خشتە ببات و دڵی ڕابکێشێت بۆ لای خۆی!

ئەم زمانە زمانێکی پڕ لە شەرم و شکۆیە و هەموو کەسێک بە ئاسانی لێی تێدەگات، خۆ خوای گەورە دەیتوانی باسی ئەوە بکات زولەیخا چۆن خۆی بۆ تیفتیفە داوە و چ جۆرە جلوبەرگی جوانی لەبەر کردووە و چ بۆنێکی خۆشی لە خۆی داوە، بەڵام باسی ئەمانەی نەکرد بۆ ئەوەی پێمان بڵێت ئەو ڕووداوانەی کە ئارەزوو دەورووژێنن دەکرێت بە زمانێک بگێڕدرێنەوە کە مرۆڤ نەوروژێنن، بۆیە ئێمە کاتێک چیرۆکی یوسف دەخوێنینەوە تەنها بیر لە هەڵوێستەکان دەکەینەوە و خەیاڵمان بۆ شتی تر ناچێت.

٢- کێن ئەوانەی ئەو باسەیان بە گوێدا بدرێت، نابینیت ئێمە نایەین لە قوتابخانەکاندا منداڵانی پۆلی یەکی سەرەتایی فێری دابەشکردن بکەین، چونکە جارێ پێویستە فێری کەڕەت و لێدەرکردنیان بکەین، ئێمە کاتێک دەبێت قوتابییەکانمان فێری چەمک و بەها باڵاکان بکەین، کە بزانین لە ڕووی دەروونی و ئاوەزەوە

ئامادەگییان تێدایە، ئەگینا هەرچەند خۆمان ماندوو بکەین، بێهوودە دەبێت و وەک ئەوە وایە لەناو دەریادا گەنم بچێنین سەرەڕای ئەوەی بەرهەمەکەی نادرویتەوە دەریاکەش پیس دەکەیت، کەواتە ئەگەر قسەکردن دەربارەی سێکس و ڕۆشنبیریی سێکسی گرنگ بێت، ئەوا گرنگتر لەوە ئەو چین و توێژەیە کە ئەو پەیامە ئەدرێت بە گوێیدا.

٣. ئامانجی قسەکردن لەسەر بابەتەکە، گومان لەوەدا نییە هەموو قسەیەک ئامانج و مەبەستێک لە پشتێوەیەتی، بیرۆکەیەک هەیە ئەمانەوێت بیگەیەنین، ئەگەر بە زمانێکی پڕ لە شەرم و شکۆبێت و بۆ توێژێکی تێگەیشتوو و پێگەیشتوو بێت، ئامانجیش ڕێنمایی و ڕۆشبیرکردن بێت، نەک وروژاندنی حەز و ئارەزووەکان، ئەوا قسەکردنەکە پەسەند و بگرە پێویستیش دەبێ.

خۆ ئەگەر ئەم مەرجانە نەهاتنەجێ، ئەوا هەر قسە و باسێک لەو بارەوە زیانبەخش دەبێت و وەک ئەوە وایە کەسێک نەخۆشیی فشاری خوێنی هەبێت و تۆ چارەسەری شەکرەی پێ بدەیت.

بە زمانێکی پڕ لە شەرم و شکۆ، بۆ توێژێکی ڕۆشنبیر و وشیار، بۆ ئامانجێکی پیرۆز دەست بەم چیرۆکە دەکەین:

ئافرەتێک هات بۆ خزمەت ئیمامی عومەر و پێی وت: ئەی پێشەوای ئیمانداران مێردەکەم بە ڕۆژ بەڕۆژووە و بە شەویش خەریکی شەونوێژە، هەرچەند پێم خۆش نییە سکاڵای لە دژ بکەم، چونکە ئەو خواپەرستی دەکات.

ئیمامی عومەریش فەرمووی: دەک خوای گەورە پاداشتی خێرت بداتەوە لەسەر ستایشی مێردەکەت.

ئافرەتەکە قسەکەی دووبارە کردەوە و ئیمامی عومەریش وەڵامەکەی دووبارە دەکردەوە!

کەعبی کوڕی سووری ئەسەدی لەوێدا ئامادە بوو، وتی ئەی پێشەوای ئیمانداران داوەری بکە لەنێوان ئەم ژنە و مێردەکەیدا.

ئیمامی عومەریش فەرمووی: بۆ ئەمەی ئەم ئافرەتە دەیڵێ داوەری تێدا دەکرێت؟

وتی: قوربان ئەم ئافرەتە سکاڵا لە مێردەکەی دەکات، کە شەو جێگاکەی چۆڵ دەکات و داوای مافی خۆی دەکات.

ئیمامی عومەریش فەرمووی: مادام تۆ لە قسەکەی تێگەیشتی، دەی خۆت داوەری بکە لە نێوانیاندا.

کەعب وتی: مێردەکەیم بۆ بانگ بکەن، هێنایان و پێی‌وت ژنەکەت سکاڵای هەیە لە دژت.

وتی: بژێوی بۆ دابین ناکەم؟

وتی: نا.

ئافرەتەکە هاتە قسە و وتی شەوانە هەر خەریکی خواپەرستییە و نایەتە سەر جێگاکەم. پیاوەکە وتی: من کەسێکی لەخواترسم و حەز دەکەم کاتەکانم لە خوداپەرستیدا ببەمە سەر. پاشان کەعب رووی لە پیاوەکە کرد و وتی: ئەویش مافی هەیە لە سەرت، خوای گەورە هەتا چوار ژنی حەڵاڵ کردووە، سێ شەو و سێ رۆژ هەر خەریکی خواپەرستی بە و شەو و رۆژێکیش بۆ ژنەکەت!

ئیمامی عومەریش فەرمووی بە خوا نازانم بە کامیان زیاتر سەرسام بم، لە تێگەیشتن لە حاڵی ئەم ژن و پیاوە، یان لە داوەرییەکەت لە نێوانیاندا؟ بچۆ ئەی کەعب ئەوا تۆم کردە قازیی بەسرە!

ئەم چیرۆکە تەنها چیرۆکێکی کۆمەڵایەتی نییە کە لە کۆڕ و دانیشتنەکاندا بیگێڕینەوە، بەڵکوو چەندین مانای قووڵ لەخۆ دەگرێت، من دەتوانم لەم چیرۆکە دە وانەی گرنگ دەربهێنم.

وانەی یەکەم:

هەندێک جار ملنەدانی ژن، یان پیاو بۆ سێکسکردن پێویستی بە ئاوڕلێدانەوە هەیە. ڕاستە سێکس حەزێکی شاراوەیە لە هەمووماندا بەڵام ئاستی ئەم جەزە و هەوڵدان بۆ تێرکردنی لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت، مێردی ئەم ژنە وایدەزانی کارێکی باش دەکات خۆی بۆ خواپەرستی یەکلایی بکاتەوە، تا ئەو کاتەی کەعب وریای کردەوە و خاڵی لەسەر پیت دانا و پێی وت ئەو خوایەی تۆ پەرستشی بۆ دەکەیت، ڕازی نابێت بە بیانووی پەرستنیەوە مافی سەرجێییکردنی هاوژینەکەت فەرامۆش بکەیت، سێکس شتێکی لاوەکی نییە لە ژیاندا، بەڵکوو پێداویستییەکی بنەڕەتی و ڕۆحییە، ئەگەرچی لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت.

وانەی دووەم:

زمانی سکاڵا دەبێت شەرم و شکۆی تێدا بێت، تەماشای سکاڵای ئەم ئافرەتە بکەن چۆن شەرم و حەیای لێ دەباری، کینایەیەکی هێندە بەهێزی بەکار هێنا، تەنانەت ئیمامی عومەر بەو بلیمەتییەی خۆیەوە لێی تێنەگەیشت، هەتا کەعب پێی وت ئەمە سکاڵایە لە دژی مێردەکەی دەیکات!

ژنەکە نەهات بە ئیمامی عومەر بڵێت: پیاوەکەم مافی خۆمم لە سێکس پێ نادات، بەڵکوو وتی پیاوەکەم بە ڕۆژ بەڕۆژوو دەبێت

و بە شەویش شەونوێژ دەکات، تەنانەت ئیمامی عومەر وایزانی ستایشی دەکات، تا ئەو کاتەی کەعب پێیوت ئەمە سکاڵایە لە دژی مێردەکەی دەیکات.

وانەی سێیەم:

ڕۆچوون و سەرقاڵبوون بە هەر کارێکەوە هەرگیز ڕەوایەتی نادات بەوەی هاوژینەکەت فەرامۆش بکەیت، دەکرێت لەسەر حیسابی تەندروستیی خۆت، لەسەر حیسابی خۆشی و پشووەکانت ڕۆبچیتە ناو کارێکەوە و خۆتی پێوە سەرگەرم بکەیت، بەڵام نابێت ئەوە لەسەر حیسابی هاوژینەکەت بێت.

ئەم پیاوە ڕۆچووبووە ناو خواپەرستییەوە، ئەمە خۆی بۆ خۆی کارێکی پیرۆزە، بەڵام بەو ڕەهاییە کارێکی ناپەسەندە؛ چونکە دەبێتە هۆی پێشێلکردنی مافی هاوژینەکەی.

وانەی چوارەم:

سکاڵای خۆت بۆ لای کەسێک ببە کە متمانەت بە ژیری و وشیاریی هەبێت، کاتێک لە ماڵەوە دووچاری گرفتێک دەبیت و هیچ چارێکت نامێنێت و دەبێت پەنا بۆ سکاڵا ببەین، پێویستە بزانین ساڵا بۆ لای کێ ئەبەیت، ئەو کەسەی توانای چارەسەرکردنی کێشەکەی تۆی نییە لە باشترین حاڵەتدا ناتوانێت هیچ شتێک لە کێشەکەی تۆ بگۆڕێت، لە خراپترین حاڵەتیشدا نهێنییەکەت ئاشکرا دەکات و دەبێتە بابەتی سەرەکی ناو کۆڕ و دانیشتنەکانی خەڵک.

ئەم ئافرەتە بۆیە هات بۆ لای ئیمامی عومەر چونکە دڵنیا بوو لە ژیری و دانایییەکەی، دەشیزانی کێشەکەی بۆ چارەسەر دەکات، خۆ ئەگەر بۆشی چارەسەر نەکرا، ئەوا بڵاوی ناکاتەوە و ئابڕووی نابات.

ئەو کەسەی دەستنیشانی دەکەیت بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانت و نهێنییەکانی خۆتی دەخەیتە بەردەست گەورەترین ڕۆڵ دەگێڕێت بۆ چارسەرکرنی کێشەکانت، یان ئاڵۆزکردنیان، کاتێک هەر یەکێک لە ئێمە نەخۆش دەکەوین پرسیاری پزیشکێکی باش و بەناوبانگ لە هاوڕێ و دۆستەکانمان دەکەین، بە هەمان شێوە ماڵەکانیش وەک مرۆڤەکان نەخۆش دەکەون، بۆیە بە شوێن پزیشکێکی باشدا بگەڕێ.

وانەی پێنجەم:

پێویستە سەرنج و تێبینیی ئەوانی تر سەبارەت بە خۆمان بە هەند وەربگرین، ئیتر ئەم سەرنج و تێبینییە لە لایەن هاوژینەکەمانەوە بێت، یان هەر کەسێکی تر کە بیەوێت درز و کەلێنی نێوانمان پڕ بکاتەوە، ئەم بابەتی ڕەخنە و تێبینییە نابێت وەک سووکایەتییپێکردن و شکاندنی شکۆ لێک بدەینەوە، بە پێچەوانەوە دەبێت وای بخوێنینەوە کە ئەمە درێژکردنی دەستی هاوکاری و دۆستایەتییە.

وانەی شەشەم:

سەرنج بدە ئافرەت چ ئازارێک دەچێژێت کاتێک مێردەکەی لەسەر جێگای خەوتن فەرامۆشی دەکات، بابەتەکە لە بابەتی سێکس گەورەترە، لەم حاڵەتدا ئافرەتەکە وا هەست دەکات کە مێردەکەی نایەوێت و بێمننەتە لێی، ڕاستە سێکس لە ڕووکەشەدا پەیوەندییەکی جەستەیینە، بەڵام لە ناوەڕۆکدا مانایەکی قووڵتر و فراوانتری هەیە.

وانەی حەوتەم:

تەماشـای ژیـری و زانایـی عومـەر بکـەن، وتمـان لـە سـەرەتاوە نەیزانـی ئافرەتەکـە مەبەسـتی چییـە، چونکـە بـە کینایـە قسـەی کـرد، بـەڵام دوای ئـەوەی لـە مەبەسـتەکەی تێگەیشـت، نەهـات پیایـدا هەڵبشـاخێت و بڵێـت: چەنـد ئافرەتێکـی بێشـەرم و شـکۆیت، داوا لـە خەلیفـەی مسـوڵمانان دەکـەی فەرمـان بـە مێردەکـەت بـکات لەگەڵتـدا بخەوێـت؟

بە پێچەوانـەوە دوای ئـەوەی لـە سـکاڵاکەی تێگەیشـت فەرمانـی کرد کەعـب داوەری بـکات لـە نێوانیانـدا، کاتێـک بـە داوەرییەکـەی کەعبیش سەرسام دەبێت، دەیکات بە قازیی بەسـرە!

کەواتـە ئـەو ئافرەتـەی سکاڵا لـە دەسـت مێردەکەی دەکات، کـە لـە ڕووی سێکسـییەوە تێـری نـاکات، نابێـت وەک ئافرەتێکـی ئارەزووبـاز لێـی بڕوانیـن، بەڵکـوو ئـەوە مرۆڤێکـە داوای بەدەسـتهێنانی مافـی خـۆی و تێرکردنـی یەکێـک لـە حەزەکانـی خـۆی دەکات، کەسـێک کـە برسـی دەبێـت و داوای خـواردن دەکات، چڵێـس نییـە، بەڵکـوو مرۆڤێکـە برسـییەتی و پێویسـتی بـە خـواردن هەیـە، سێکسـیش وەک خـواردن وایـە، تـا بـە دەسـتی نەهێنێـت، برسـێتیت لێـی ناشـکێت.

وانەی هەشتەم:

کێشـە خێزانییـەکان نابێـت وەک شـتێکی سـادە لێیـان بڕوانیـن و پشتگوێیان بخەین، خێزان بڕبڕەی پشتی کۆمەڵگا و بەردی بناغەیەتی، کۆمەڵـگای مرۆڤایەتـی لـە خێزانـەکان پێکدێـت، پشتگوێخسـتنی خێـزان پشتگوێخسـتنی کۆمەڵگایـە بـە شـێوەیەکی گشـتی، ئەگـەر خێـزان خـراپ بـوو، ئـەوا کۆمەڵـگاش خـراپ دەبێت!

هەر بۆیە خوای گەورە پاداشتێکی زۆر گەورەی دیاری کردووە بۆ ئەو کەسانەی کە ئاشتەوایی لەنێوان خێزانەکاندا دەکەن، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا داوا دەکات ئەگەر ناکۆکی کەوتە نێوان ژنومێردێکەوە، ئەوا با خەڵکانی ژیر لە خانەوادەی ژن و پیاوەکە دەستێوەردان بکەن بۆ چارەسەرکردنی.

بۆیە نابێت ئێمە لە کێشە خێزانییەکاندا ڕۆڵی تەماشاکەر ببینین، بەڵکوو دەبێت هەوڵی چارەسەرکردنیان بدەین، خۆ ئەگەر کەسێک بۆی هەبوایە لە چارەسەرکردنی کێشە خێزانییەکاندا خۆی بە دوور بگرێت، دەبوو ئەو کەسە ئیمامی عومەر بێت، چونکە بەرپرسی سەدان هەزار کەس بوو، سوپاکەی بە هەموو لایەکی سەر زەویدا بڵاو بووبوویەوە، دوژمنەکانی لە هەموو لایەکەوە خۆیان بۆ مەڵاس دابوو، ئەو بەم هەمووە ئەرک و بەرپرسیارێتییەوە بە ئافرەتەکەی نەوت ئەگەر من بێم دانیشم ئەم کێشەیەی تۆ چارەسەر بکەم، کارەکانی ترم لە دەست دەچێت، بە پێچەوانەوە زۆر بە پەرۆشەوە مامەڵەی لەگەڵ کێشەکەدا کرد و داوەرێکیشی بۆ دیاری کرد، تەنانەت داشنیشت و بە وردی چاودێری کرد بۆ ئەوەی بزانێت ڕەوشی دادگاییەکە بە کوێ دەگات، دواجار چارەسەرێکی گونجاو بۆ کێشەکە بینرایەوە و ئافرەتەکەش مافی خۆی وەرگرت.

**وانەی نۆیەم:**

ئەو چیرۆکانەی دەیانخوێنینەوە و دەیانبیستین ئامانج لێی چێژوەرگرتن و بەسەربردنی کات نییە، ئەگەرچی چیرۆکەکان خەڵک چێژ و خۆشیان لێ دەبینن، بەڵام ئامانجەکە زۆر لەوە گەورەترە و بۆ وەرگرتنی وانە و پەند و ئامۆژگارییە.

سێیەکی قورئـان چیرۆکـە، بـەڵام قورئـان زۆر لـەوە گەورەتـرە کتێبێک بێت بۆ چێژوەرگرتن و کاتبەسەربردن، بەڵکوو دەستووری ژیانـە، ئـەو چیرۆکانەیشـی کـە تیایەتـی هەمـووی بـۆ پەنـد و ئامۆژگارییـە!

لە چیرۆکی ئیبراهیم پێغەمبەرەوە یەکتاپەرستی بێ خەوشوخاڵ فێر دەبین کە لەپێناویدا ئیبراهیم خرایە ناو ئاگرەوە.

لە چیرۆکی یوسفەوە فێری داوێنپاکی و قوربانیدان دەبین!

لـە چیرۆکـی ئەیووبـەوە فێـری ئـەوە دەبیـن کـە دنیـا هۆڵـی تاقیکردنەوەیـە و مرۆڤیش دەبێت خۆڕاگربێت لـە بەرامبـەر لەمپـەر و سـەختییەکانی ژیانـدا وەک چـۆن لـە ئاسـتی نـاز و نیعمەتەکانـدا سوپاسـگوزارە.

لە چیرۆکی عوزەیرەوە توانای خودامان لەسەر زیندووکردنەوە و ژیانەوە بۆ دەردەکەوێت.

لە چیرۆکی نوحەوە فێر دەبین بانگەوازکردن بۆ ڕێگەی خودا ئاسان نییە وەک هەندێک وادەزانن، بەڵکوو کارێکی یەکجار سەخت و پڕ لە کۆسپ و تەگەرەیە.

لە چیرۆکی موساوە فێر دەبین چۆن خودا لە کاتە هەستیار و چارەنووسسازەکاندا دۆستەکانی خۆی تەنها ناخات و دێت بە دەمیانەوە.

لە چیرۆکی مەریەمەوە توانای ڕەهای خودامان بۆ دەردەکەوێت کە بە هەر شتێکی وت ببە، دەبێت.

لە چیرۆکی یارانی ئەشکەوتەوە فێری ئەوە دەبین بیروباوەڕ لە کەسوکار و نیشتیمان بەنرخترە، هەر کەسێک لەپێناوی ئایینەکەیدا زێدی خۆی بەجێ بهێڵێ، شایەنی ئەوەیە ناوی بە زیندوویی لە قورئاندا بمێنێتەوە.

لە چیرۆکی دوو کچەکەی شوعەیب لەگەڵ موسادا جارێ لە موساوە فێری مەردایەتی و جوامێری دەبین، لە دوو کچەکەی شوعەیبیشەوە شەرم و شکۆ.

لە چیرۆکی کابرای خاوەن دوو باخ و بێستانەکەی سورەتی کەهفەوە فێر دەبین ناشوکری و بەدنمەکیکردن بەرامبەر نازونیعمەتەکانی خودا هۆکارە بۆ لێسەندنەوەی.

کەواتە چیرۆکەکانی قورئان تەنها بۆ چێژوەرگرتن و کاتبەسەربردن نین، بەڵکوو بۆ ئەوەیە پەند و وانەی بەپێزیان لێ وەربگرین.

نەنکم بەڕەحمەت بێت بۆی گێڕامەوە و وتی: کاتی خۆی ئافرەتێک هەبووە زۆر بێزار بوو لە دەست مێردەکەی، بۆیە چوو بۆ لای مەلای گوندەکەیان و وتی هاتووم بۆ ئەوەی لە مێردەکەم جیام بکەیتەوە.

وتی: بۆ؟

وتی: ناتوانم لەگەڵیدا بژیم.

- بۆ ناتوانیت؟

- ئاوا و ئاوا و ئاوایە.

- باشە لە یەکترتان جیا دەکەمەوە، بەڵام بە مەرجێک.

- مەرجەکەت چییە؟

- تاڵێک لە سمێڵی شێرم بۆ بێنیت.

- سمێڵی شێر؟ تۆ ئەتەوێت من بە کوشت بدەیت، یان لە مێردەکەمم جیا بکەیتەوە؟

- ئەوە تاکە مەرجی منە، ئیتر تۆش کەیفی خۆتە.

- باشە هەوڵ ئەدەم پەیدای بکەم.

چوو لە بازاڕ بەرخێکی کڕی و ملی نا بەرەو دارستان، لە دووری لانەی شێرەکەوە بەرخەکەی بەستەوە و لە پەنایەکدا خۆی حەشار دا، زۆری نەبرد شێرەکە هات و بەرخەکەی خوارد.

لە ڕۆژی دووەمدا چوو بۆ بازاڕ بەرخێکی تری کڕییەوە و ئەمجارە تۆزێک نزیکتر لە لانەی شێرەکە بەستیەوە و لە پەنایەکدا خۆی حەشار دایەوە، دیسانەوە شێرەکە هات و بەرخەکەی خواردەوە.

لە ڕۆژی سێیەمدا بڕیاری دا بەرخێکی تر بکڕێت، بەڵام ئەم جارە بە هەر نرخێک بووە دەبێت تاڵێک لە سمێڵی لێ بکاتەوە، بەرخەکەی برد و لە دووری تەنها مەترێک لە لانەی شێرەکەوە بەستیەوە، بە دیاریەوە وەستا هەتا شێرەکە هات و پەلاماری بەرخەکەی دا و وەک جارەکانی تر خواردی، کە چووەوە بۆ لانەکەی خۆی بۆ ئەوەی بخەوێت، ئەمیش چوو بۆ لای و بە نەرمی دەستی هێنا بە سەریدا هەتا خەوی لێ کەوت، تاڵێک لە سمێڵی کردەوە و هێنای بۆ مامۆستا، وتی: ئەمە ئەوەیە کە تۆ داوات دەکرد، ئادەی وەک بەڵێنت دابوو هەر ئێستا لە مێردەکەمم جیا بکەرەوە، مامۆستاش وتی: توخوا شەرم نییە بۆ تۆ بتوانیت شێرێک بەو دڕندەییە ڕابهێنیت و دەستەمۆی بکەیت، بەڵام نەتوانیت مێردەکەی خۆت کە مرۆڤە لەگەڵیدا بگونجێنیت!

وتی: ئاخر زۆر بە نەرمی و وریاییەوە مامەڵەم لەگەڵ شێرەکەدا کرد. وتی: دەی لەگەڵ مێردەکەشتدا هەر بەو شێوەیە نەرم بە!

وانەی دمیەم:

تێگەیشتنی دروست بۆ ئایین، ژیان دەکات بە بەهەشت، تێگەیشتنی هەڵەش بۆ ئایین، ژیان دەکات بە دۆزەخ، ئەم ئافرەتەی کە سکاڵای هێنا بۆ لای ئیمامی عومەر، سەرچاوەی گرفتەکەی لە بێدینیی مێردەکەیەوە نەبوو، بە پێچەوانەوە خۆی شایەتی ئەوەی بۆ دا ڕۆژانە بەڕۆژووە و شەوانەش خەریکی شەونوێژە، بەڵکوو

گرفتەکەی لە هەڵەتێگەیشتنی مێردەکەیدا بوو بۆ ئایین، تەنها گرنگی بە لایەنی ڕۆحی خۆی ئەدا و بیری چووبوویەوە کە جەستەی خۆی و هاوژینەکەشی مافیان هەیە لەسەری!

جاری وا هەیە تێگەیشتنی ئێمە بۆ ئایین تێگەیشتنێکی تەواو و گشتگیر نییە، ئەو گرنگییە زۆرەی ئایین بە مرۆڤ و بە مافەکانی مرۆڤی دەدات، ئێمە نایدەین. باشترین بەڵگەش بۆ دیاردەی هەڵە بەکارهێنانی ئایین و هەڵە تێگەیشتن لە ئایین بوونی ئەو گرفت و ناکۆکییە زۆرانەیە کە لەناو خێزانەکاندا بەدی دەکرێت، کە ئەگەر ئێمە بەپێی پەیامی ئیسلام مامەڵە بکەین، ئەوا ئاسوودەیی و بەختەوەری باڵدەکێشێت بەسەر ماڵەکانماندا.

دوای ئەوەی لەم چیرۆکە و وانەکانی بووینەوە، کەس وا تێنەگات من دەڵێم هەرچی کەموکورتی و کەمتەرخەمییەکان هەیە هەمووی لە لایەن پیاوانەوەیە و ژن هەمیشە ستەملێکراو و بەشخوراوە، من هەرگیز ئاوام نەوتووە، بەڵکوو پێشێلکردنی مافی سێکس هەم لە لایەن پیاوانەوە ڕوودەدات، هەمیش لە لایەن ئافرەتانەوە، بگرە ئەوەندەی پیاوان سکاڵا لە دژی ژنەکانیان دەکەن کە لە ڕووی سێکسییەوە مافەکانیان نادەن، هەرگیز ئافرەتان ئەوەندە سکاڵا ناکەن.

زۆرێک لە پیاوان ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەریان کردووە بە چەکی دەستیان کە دەفەرموێت: (إذا دعى الرجل امرأته إلى فراشه فأبت فبات عليها غضبانا لعنتها الملائكة حتى تصبح) واتە: هەر کاتێک پیاو ژنەکەی بانگ کرد بۆ سەر جێگای نوستنەکەی و ئەویش بە دەم داواکەیەوە نەچوو، ئەوا ئەو ژنە فریشتەی ئاسمان هەتا بەیانی نەفرەتی لێ دەکەن.

گومان لەوەدا نییە ئەمە فەرموودەی پێغەمبەرە و هیچ کەسێکیش ناتوانێت چەندوچوونی لەسەر بکات، بەڵام پێش ئەم فەرموودەیە ئایەتێک هەیە لە قورئانی پیرۆزدا کە دەفەرموێت: (وعاشروهن بالمعروف)، واتە: لەگەڵ هاوژینەکانتان بە باشی مامەڵە و هەڵسوکەوت بکەن، وشەی (معروف) وشەیەکی گشتگیرە و هەموو شتێکی باش لە ژێریدا جێگای دەبێتەوە، پێش ئەوەی پیاو مافی سێکسی بەسەر هاوژینەکەیەوە هەبێت، دەبێت تەماشای باری دەروونی و جەستەیی هاوژینەکەی بکات، بزانێت لەبارە بۆ ئەو کارە؟ جاری وا هەیە ئافرەت شەکەت و ماندووە و باری دەروونیی ئاسایی نییە. تۆش ناکرێت ئەو حاڵەتەی ئەو لەبەرچاو نەگریت و تەنها بیر لە تێرکردنی حەزەکانی خۆت بکەیتەوە، ڕاستە دەبێت ئافرەتیش هەندێک جار بەسەر خۆیدا زاڵ بێت و شەکەتی و هیلاکی خۆی بشارێتەوە و وەڵامدەرەوەی حەزەکانی پیاوەکەی بێت، بەڵام پێویستە ئێمە مرۆڤانە مامەڵە بکەین نەک تەنها بیر لە تێرکردنی حەزە سێکسێکانمان بکەینەوە، نەفرەتی فریشتەکان بەهۆی ئەوەوە نییە کە ژنە پەیوەندی سەرجێیی ڕەت کردووەتەوە، بەڵکوو لەبەر ئەوەیە مێردەکەی تووڕە کردووە، خۆ ئەگەر مێردەکەی داوای سەرجێیی کرد و ئەویش پۆزشی بۆ هێنایەوە و وتی: ئێستا هیلاک و ماندووم و ئامادەییم تێدا نییە بۆ کارە ئەو کاتە فریشتە نەفرەتی لێ ناکات و مێردەکەشی پاداشتی بۆ دەنووسرێت، چونکە ڕەچاوی بارودۆخی هاوژینەکەی کردووە و ئەم کارەی دەچێتە چوارچێوەی ئەو باش مامەڵەکردنەی کە خودا لە ئایەتە قورئانییەکەدا فەرمانی پێ کردووە.

ئەوەش بزانە فەرموودەکەی سەرەوە کوتەکێک نییە بە دەست پیاوانەوە هەر کاتێک ویستیان بیوەشێنن، بەڵکوو پەیامێکە و بە

ئافرەتان دەڵێت: ئەوە ئەرکی سەرشانی ئێوەیە و نابێت بەبێ بەهانە کەمتەرخەمیی تێدا بکەن.

تۆش ئەی پیاوی بەڕێز (وعشروهــن بالمعــروف)، پەیامێکە بۆ تۆ، گوێنەدانە باری دەروونـی و جەستەیی هاوژینەکەت، تۆ لە چوارچێوەی چاک مامەڵەکردن دەباتە دەرەوە.

ئەگەر سێکس خۆشییەکی ڕاستەقینە نەبوایە، ئەوا یەکێک نەدەبوو لە خۆشییەکانی بەهەشت، بەڵام بۆ ئەوەی بە خۆشییەکی ڕاستەقینە بمێنێتەوە، پێویستە ئێمە بە پیاوان و ئافرەتانەوە مرۆڤانە مامەڵە بکەین، ئێمەی پیاو لە سروشتی ئافرەتان تێبگەین، ئافرەتان لە سروشتی پیاوان تێبگەن و ڕەچاوی بارودۆخی یەکتری بکەین.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: (ومـن آياته أن خلق لكـم مـن أنفسـكم أزواجـا لتسـكنوا إليهـا وجعـل بينكـم مـودة ورحمـة) واتە: یەکێک لە بەڵگەکانی دەسەڵاتی خودا ئەوەیە کە لە ڕەگەزی خۆتان هاوسەری بۆ خولقاندون بۆ ئەوەی ئارام بگرن لە لایدا و لە نێوانتاندا خۆشەویستی و سۆز و میهرەبانی فەراهەم هێناوە.

هەر کاتێک سۆز و میهرەبانی باری کرد، ئیتر هەڵوەشاندنەوە بەشی ئەو هاوسەرگیرییە دەبێت.

با سۆز و میهرەبانیمان بەرامبەر بە یەکتری هەبێت، تێگەیشتن لەوەی کە ئێمە پێویستمان بە یەکتری هەیە، ئەمە خۆی بۆ خۆی سۆز و میهرەبانییە. با پۆزش بۆ یەکتری بهێنینەوە، لە یەکتری تێبگەین، چاوپۆشی لە یەکتری بکەین. ئەوەی دوێنێ تێکمان داوە، با ئەمڕۆ چاکی بکەینەوە.

دوو یاسای گرنگ:

- ئەوانەی خاوەن سۆز و بەزەیین، خوداش بە سۆز و بەزەییەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات

- نەرمونیانی لە هەر شتێکدا هەبێت، جوانی دەکات، لە هەر شتێکیش بکرێتەوە، ناشیرینی دەکات.

بەختەوەرانە بژین، پشکی خۆتان لە خۆشەویستی و سێکس ببەن. پێغەمبەری خودا فەرموویەتی: (الدنیا متاع وخیر متاعها المرأه الصالحه) واتە: دنیا خۆشییەکی کاتیە، باشترین خۆشییەکانیشی ژنێکی باشە. ئەوەشتان بیر نەچێت نزیکترین ڕێگەی بەهەشت ڕەوشتبەرزییە. ئێمە خەڵکی بەهەشتین؛ چونکە باوکمان ئادەم و دایکمان حەوا، یەکەمجار لەوێ ژیاون، چونکە ئەم کتێبە تایبەتە بە پیاوان، ئەم قسەیەی پێغەمبەر بە بیری خۆم و تۆی خوێنەریش دێنمەوە، (استوصوا بالنساء خیرا)، واتە: ئامۆژگاری بێت لێتان، زۆر باش بن بۆ ژنان.



## تەنها بۆ پیاوان!

خوای گەورە دەیتوانی وەک چۆن ئادەمی لە گڵ دروست کرد، حەواشی لە گڵێکی تر دروست بکردایە، بەڵام هات لە پەراسووی ئادەم دروستی کرد.

ئامانجی ئەوە بوو ئادەم هەست بکات کە حەوا پارچەیەکە لە خۆی و پارێزگاریی لێ بکات، حەواش هەست بکات بنەڕەتەکەی بۆ ئادەم دەگەڕێتەوە و هۆگر و خولیای بێت، وەک چۆن کەسی ڕێبوار و دوورە وڵات هۆگر و خولیای نشتیمانەکەیەتی!

خوای کاربەجێ دەیەوێت بەم ڕێگەیە و بۆ هەتاهەتایە دەستەبەری خۆشەویستیی نێوانیان بکات.

پێویستە پیاو بزانێت ئافرەت چۆن بیر دەکاتەوە؟ هەست و نەستی چۆنە؟ چۆن کارلێک دەکات...

لە بەرامبەریشدا پێویستە ئافرەت بزانێت پیاو چۆن بیر دەکاتەوە؟ هەست و نەستی چۆنە؟ چۆن کارلێک دەکات...

ڕاستە لە نێوانیاندا لەیەکچوون هەیە و هۆکارەکەشی بۆ بنەڕەتی دروستبوونیان دەگەڕێتەوە، کە هەردووکیان یەک ڕەگەزن، بەڵام جیاوازیی گەورەش لە نێوانیاندا هەیە و هۆکارەکەی دووبارە بۆ بنەڕەتی دروستبوونیان دەگەڕێتەوە. شێوازی دروستبوونی هەریەکەیان جیاوازە لەوی تر، تێگەیشتن لەم جیاوازییە و

ڕەچاوکردنی دەستەبەری ژیانێکی پڕخۆشی و کامەرانی لەنێوان ژن و پیاودا دەکات!

ئەم کتێبە ئەگەرچی بە پلەی یەکەم ئاراستەی پیاوان کراوە، بەڵام هەوڵێکیشە بۆ شەنوکەوکردنی ئەم جیاوازییە!

# تەنها بۆ پیاوان

خوای گەورە ژیانی دروست کردووە و لە ڕێگەی پیاو و ژنەوە درێژە بە ژیانی مرۆڤایەتی دەدا، پیاو و ژن هەریەکە جیهانێکی سەربەخۆن، هەریەکە تایبەتمەندییەکی هەیە، هەق وایە ژنان ئەو کتێبانە بخوێننەوە کە باسی تایبەتمەندییەکانی پیاوان ئەکەن، پیاوانیش ئەو کتێبانە بخوێننەوە کە باسی تایبەتمەندییەکانی ژنان ئەکەن، ئەم کتێبەی بەردەستت تایبەتە بە تۆ! (للرجال فقط) تەنیا بۆ پیاوانە، تۆش بیخوێنەوە! لێی ورد بەرەوە، بزانە پیاو دەبێ بە چ پێوەرێک مامەڵە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بکا؟ با ژیانەکەتان بە ڕێکوپێکی درێژە پێ بدەن و نەبێ بە ژان، با تا کۆتایی ژیان بە یەکەوە بە خۆشی بژین، با ببنە ئاوێنە و دڵی یەکتر بخوێننەوە! با لە هەوراز و نشێوەکانی ژیاندا بە یەکەوە سەرکەون، لە بەرامبەر سەختی ژیاندا چۆک دانەدەن!

بەڕێز ئەدهەم شەرقاوی زۆر زیرەکانە و بە جوانی تایبەتمەندییەکانی ئافرەتی لەم کتێبەدا باس کردووە، هیچێکی وای نەهێشتووەتەوە کە پیاو زۆر پێویستی بێ، بۆیە پێویستە پیاو شارەزای ئەم کتێبە بێ، هیچ نەبێ جارێک بە وردی بیخوێنێتەوە بۆ ئەوەی ئەو شتانەی بۆ دەرکەوێ کە دەبێ لەودا هەبێ و نییە و ناشزانێ کە نییە!



07501269689
07511408868


hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com


سلێمانی - بازاڕی ئاوبارێک- نهۆمی محکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)



٧٠٠٠ دینار


ISBN:978-9922-646-16-9